جهاد خاوەری

# ئاورێکی مێژوو

زانست و وەرگێڕان لەدەورانی مەنصور و ڕەشید و مەئموندا

لەگەڵ تیشکێك لەسەرکەسایەتی ڕەشید و سەردەمەکەی



# بسم الله

* ئاورنگی مێژوو
زانست و وەرگێڕان لەدەورانی مەنصور و ڕەشید و مەئموندا
لەگەڵ تیشکێك لەسەرکەسایەتی ڕەشید و سەردەمەکەی
* جهاد خاوەری
* چاپی یەکەم
* ٢٠١٠
* تایپێست و دیزایینی ناوەوە: نووسەر
* دیزایینی بەرگ: عادل شاسواری
* تیراژ: ١٠٠٠
* لەبڵاوکراوەکانی

* ژمارەی سپاردن: (   ) ی ساڵی ٢٠١٠ وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە

# پێڕست

# پێشکەشە

- بە ڕابەران و پێشڕەوانی مرۆڤایەتی کە خۆیان کردۆتە فیدا لە پێناو هۆشیاکرنەوەی خەڵکیدا .
- خێر و فەری ئەم نوسینەم بە دایك و باوکی شیرینم پێشکەشە ، کە هەمیشە هەوڵیان داوە کەشێکی هێمن و ئارام دابین کەن تاوەکو لە خوێندن دانەبڕێم .
- بەو مامۆستا دڵسۆزانەی کە تا ئێستاش ڕەوشت وئامۆژگاری و زانستەکەیان لە زهنمدا ماوەتەوە .
- بە هەمو ئەو نوسەرانەی کە سودم لە کتێبەکانیان وەرگرت بۆ ئامادەکردنی ئەم توێژینەوەیە ، ئەگەر نوسینەکانی ئەوان نەبوایە بێگومان بەرهەمەکەی منیش نەدەبوو.
- بە خاڵی خۆشەویستم عادل شاسواری .
- بە برای خەمخۆرم هاوسەر .
- بە خوشکانی ئەمەکدارم ، کە هەمیشە بە تەنگمەوە بون

# پێشەکی

قال التعالى : (( إن الله لايغير ما بقوم حتى يغير ما بأنفسهم )) .
الرعد : ١١

بە پێناسە جوانەکەی دکتۆر أرشید دەست پێدەکەم کە لە کتێبەکەی ( شارستانیەتی ئیسلامی ) دا نوسیویەتی : (شارستانیەتی ئیسلامی بریتیە لە پێشکەوتن لە تەواوی پێداویستیەکانی ژیان و گرتنەبەری ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی خۆشگوزەرانی ، ئەم پێشکەوتنەش دەبێت تەواوی لایەنە ( دینی و مەدەنی و سوپای )یەکان بگرێتەوە ) .

بنەمای شارستانی بونی هەر کۆمەڵگایەك بریتیە لە بنەماکانی ( ئاواکاری ، ئابوری ، ئاینی ، یاسایی ، زانستی و فەلسەفە ، دەسەڵات ، کلتوری ) ، ئەگەر ئەم بنەمایانە بەسەر کۆمەڵگای ئیسلامی سەردەمی ( مەنصور و ڕەشید و مەئموندا ) بکەین ، ئایا تا چەند ئەتوانین بە کۆمەڵگایەکی شارستانی دابنێین ؟

لەگەڵ ئەوەی نەمتوانیوە تەواوی لایەنەکانی شارستانیەت بە دەر بخەم لەماوەی فەرمانڕەوایەتی ئەمانەدا ، بەڵام بە خوێندنەوەی زانیاریەکت لەبارەی ئەو گەشەسەندنە گەورەیە لەلا دروست دەبێت کە جیهانی ئیسلامی لەو ماوە کەمەدا بەخۆیەوە بینی .

لە کاتێکدا ئەگەر بتەوێ لایەنە جیاوازەکانی ئەم شارستانیەتە لەگەڵ شارستانیەتەکانی پێش خۆی و دوای خۆی بخەیتە ڕوو ، ئەوا هەر لە بەراییەکانی خوێندنەوە لەسەر ئەم شارستانیەتە دەگەیت بەوەی کە شارستانیەتەکە لە هەردوو دیوی مادی و مەعنەوی پێکهاتووە . وەکو جوستاف لوبون دەڵێ : ( گرنگی بنچینەیی لە شارستانیەتی ئیسلامی لە دین و زمان و زانستەکاندایە ) . واتە کرانەوە بە ڕووی زمان و زانست و دینی تەواوی ناوچە جیاوازەکان ، ئاشنابون پێیان لێکدانەوەیان شیکار بۆکردنیان ....

پاشان دەڵێ : ( گومانی تێدا نیە کە موسڵمانەکان یەکەمینن کە توانیان ئازادی بە فیکر بدەن لەگەڵ بەردەوامی دیندا ) ( الحضارة و التمدن الاسلامي بأقلام فلاسفة النصارى : د. عبدالمتعال محمد الجبري ) .

ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەم شارستانیەتە ڕوی لە کەس نەناوە ، لە کاتێکدا بنەماڵەی بختیشوع کە مەسیحی بون و لە کۆشکی خەلیفەدا سەرگەرمی کاری پزیشکی بون ، جاحظ و کندی و خوارزمیمان هەیە کە هەر یەکەیان لە بواری جیای زانستی کاریان کردووە . فیکرەی جیاواز ، ئاینی جیاواز ، نەتەوەی جیاواز ، ڕێگەی پێدراوە بەبیری خۆی کار بکات ، بالەژێر بیروڕەوتێکی جیاواز لە دەسەڵاتیشدا بێت .

ئەم توێژینەوەیە ، لە پێشەکیەك و سێ بەش و ئەنجام و لیستی سەرچاوەکان پێك هاتووە . لە بەشی یەکەمدا باسمان لە دەورەی مەنصور کردووە ، لە باسی یەکەمدا گرنگیدان و پێشکەوتنەکانی زانست و لە باسی دووەمیشدا باسی وەرگێڕان کراوە لە سەردەمی مەنصوردا . لە بەشی دووەمیشدا لە سەردەمە زێڕینەکەی ڕەشید دواوین کە دەبێتە

بناغـەی ئـەو گەشەسـەندنە گەورەیـەی رۆژهـەڵات بەخۆیـەوە دیبینـیٚ لـە دەورەی مەئمونی کورِیدا و پاشانیش لادانی ئەو پەردە بـیس و خۆڵاویـەی دراوە بەسەر کەسایەتی ڕەشیددا . لە بەشی سێیەمیـشدا لـە ژێـر نـاوی ( زانست و وەرگێڕان لە دەورەی مەئموندا) ئەمیشیان لە دوو باسـدا پـۆلێنم کردووە ، ئـەویش زانـست لـە دەورەی مەئمونـدا و وەرگێـڕان لـە دەورەی مەئمونـدا . پاشـتریش هەریـەك لـە گروپـە فیکریـەکانی وەك ( شـیعە ، موعتەزیلـە ، سـۆفیگەری ) و دەوریـان چـی بـووە لـەم سـەردەمانەدا لـە ساحەی سیاسی و فیکریدا .

لـە کۆتایـدا هیـوام وایـە کـە تـوانیبێتم لـەم باسـە کـەم و ناتـەواو و کورتـــەدا ئاشـــناتان بکـــەم بـــە لایەنـــەکانی (زانـــست و وەرگێـــڕان ) لـــە شارستانیەتی ئیسلامی لەو سەردەمە دیاریکراوەدا .

جهاد خاوەری

٢٠٠٩/٦/١٥ سلێمانی

# باسی یەکەم

# زانست لەدەورەی مەنسوردا

زانــست ، دەرككردنـــی شــتێكە لـــەوەی هەیـــە، دانایـــانیش دەڵـــێن: بەدەست هێنانی وێنەی شتێكە لەعەقڵدا[١].

لەكاتێكدا دەمانەوێت باس لە كۆمەڵە زانستێك بكـەین، كـە چ عـەقڵی بن یان نەقڵی لە فەترەیەكی مێژویدا چ دەركەوتبێ یان گەشەی سـەندبێ، باسكردنی تاڕادەیـەك دژوارە( مەبەسـتم كۆكردنەوەیانـە)، چـونكە بـەپێی ئەوپۆلێنەی كەوا كـراوە بـۆ زانـست هەریـەك لـە سـۆفیزم و شـیعەگەری و موعتەزیلـە باسـیان لێـوە نـەكراوە بـەڵكو وەك فیكرەیـەكی جیـا باسـیان لێوەكراوەو نەخراونەتە ئەو پـۆلێن كاریـەوە، بۆیـە لێـرەدا ڕێـو شـوێنێكی ترم گرتە بەر ئەویش دانان و جیاكردنەوەی ئـەو گروپانـە و دانانیـان وەك بابەتێكی جیا لەوان.

بـەڵام بۆیـە باسـم لـەم بیروڕەوتـە جیاوازانـە كـرد لەسـەر سـاحەی سیاسی و كۆمەڵایەتی و فیكری وڵات ، چـونكە بـەڕای خـۆم ئـەم فیكرانـە لەگەڵ ئەوەی زەرەرمەندیان بـووە لـە بەرامبەریـشدا بـربتین لـە بـونی ڕاو بۆچونی جیاواز و جێگرتنیان لە جیهانی ئیسلامیدا.

---

[١] الجرجاني: التعريفات، ص٨٧

زانستە نەقڵیەکانیش ئەوانەن کەوا لە دینی ئیسلامەوە وەرگیراون، وەك(تەفسیر، فەرمودە، فیقە، .....). زانستە عەقڵیەکان ئەو زانستانەن کەوا سەرچاوەکەیان بریتیە لە زانستە عەجەمی و کۆنەکان، وەك(ئەندازیاری، فەلەك، پزیشك ، کیمیا، فیزیا، ....).

## أ. زانستە نەقڵیەکان:

مەنسور* لە ساڵی (١٤٣ك/٧٦٠م)، زانا موسڵمانەکانی دانا بۆ نوسینەوەی فەرمودە** و فیقە و

---

* ئەبو جەعفەر عەبدوڵلا کوڕی محمد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی عەباس، دایکی(سلامە بربری)یە. لە ساڵی (٩٥ك/٧١٤م)لە دایك بوە. ڕۆژی جومعە لە دوای مردنی براکەی چوە کوفەوە و نوێژی بۆ کردن و وتاری بۆ دان و دواتر ئەهلی عێراق و خوراسان و شام بەیعەتیان پێدا. بڕوانە: ابن كثير: البداية والنهاية، ج١٠، ص٦٠. لە مانگی ذي الحجة ی ساڵی ١٥٨ك وەفاتی کرد لە ڕێگای حەج لە نزیك مەککە .مەنسور کەسێکی بە جەرگ بوو ، لە ڕوی سیاسەتیشەوە کەسێکی بەتوانا بوو ، هەروەها فەرمانی کردووە بە چاکە و ڕێگری کردووە لە خراپە و پارێزگاری لەسەرسنورەکان کردووە و ڕێگاکانیشی پاراستووە ، لە بارەی خەراج و نەفەقاتیشەوە کەسێکی توند و تۆڵ بووە . بروانە : نبيله حسن : تأريخ الدوله العباسيبه ، ص١٣٦.

** نوسینی فەرمودە:

١.هاوەڵانی سەردەمی پێغەمبەر : سیستەم و کارێکی شاملیان نەبووە تەنها هەندێ کەس نەبێت کە چەند فەرمودەیەکی نوسیوەتەوە ، چونکە زۆرتر گرنگیان بە لەبەرکردن داوەو گرانیش بووە ۆیان هەر شتێ بڵێ بینوسن ، بۆیە لەبەریان کردووەو لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر لەناویاندا بووە و هەربۆیە هەرچیەکیان ویستبێت لە پێغەمبەر خۆی پرسیویانە .

٢.لەسەردەمی هاوەڵان و تێکەڵبونی تابعین: زیاتر دەستکرا بە نوسینەوەی فەرمودە ،چونکە خەریك بوو خیلاف دروست دەبوو ، بۆیە لەم دەورەیەدا دەبینین هەندێ لە نوسەرانی فەرمودە دەرکەوتن، لەوانە:

١.جابری کوڕی عەبدوڵلا: فەرمودەی مناسکی حەجی نوسیەوە و دایە حاجیان.

٢.أبوأيوب الانصاری (صحيفەيەکی ) هەبوو کە ١١٢ فەرمودەی تیابوو.

٣.عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص: (الصحيفه الصادقه)ی نوسی ، کە ١٠٠٠ فەرمودەی لە خۆ دەگرت.

تەفسیر، بەم پۆلێنکاریە: ئیبن جریجی دانا لە مەکە، مالك موطأ[**] لە مەدینە و ئەوزاعی[***] لە شام، ئیبن عروبە و حماد کوڕی سلمە لە بەسرە،

---

٤.همام کوڕی منبە( مردووە لە ١٣١ك) :(صحیفە)ی لە ئەبی هورەیرەوە وەرگرت کە ناودەبرێ بە (الصحیفە الصحیحە)،زۆربەی ئەم فەرمودانەش لە بوخاریدا هاتووە کە ژمارەیان (١٣٨) فەرمودە بون.

عومەری کوڕی عەبدولعەزیزیش ،فەرمانیدا بە نوسینەوەی فەرمودە ، یەکەم کەسیش کە هەستا بەم کارە (ئیبن شەهاب زوهری مەدەنی – زانای حیجاز و شام) وەك خۆی دەڵێ:( کەس ئەم زانستەی نەنوسیوە لە پێش منەوە وەك ئەمەی من) . هەروەها (ئەبوبەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی حەزم)کە قازی مەدینە بوو.

نوسینەوەی فەرمودە لە دوای عومەری کوڕی عەبدولعەزیزەوە وەستێنرا تاوەکو هاتنی مەنسور کە زاناکانی پۆلێن کرد. ئەوەیوو ئیمام مالك کتێبی (الموطأ)ی دانا و شعبە کوری حەججاج بەصری (مردووەلە ١٦٠ك /٧٧٦ز) ( المصنف)ی دانا و......... پاشان لەسەردەمی چەرخی ئاڵتونیدا (٣–٤ك) فەرمودە بە چەند جۆرێك نوسرایەوە :

أ. مسند: مسند امام أحمد(ت٢٤١ك/٨٥٥ ز) کە لەسەر وەرەقە نوسرا کە بەم شێوازە فەرمودەکانی پۆلێن کردبوو:( دە مژدە پێدراوانی بەهەشت – ئەبوهورەیرە – ئەبوسەعید خودری – جابری کوڕی عوبدوڵلآ – عەبدولآی کوڕی عومەر – عەبدوڵلآی کوڕی عەباس،....)نوسیوە .

ب. بەڵأم ئەوانەی وا فەرمودەکانیان بەپێی بابەتەکان پۆلێن کردبوو ، ئەمانەن :

١.جامع الصحیح البخاري (ت ٢٥٦/٨٦٩ز).
٢.الجامع الصحیح :مسلم (ت ٢٦١ك/٨٧٤ز).
٣.سنن أبوداود (ت ٢٧٥ك/٨٨٨ز).
٤.الترمزي (ت ٢٧٩ك/٨٩٢ز).
٥.النسائي (ت ٣٣٠ك/٩٤١ز).
٦.ابن ماجة (ت ٢٧٣ك/٨٨٦ز).

د.طه عبدالمقصود عبدالحمید: الحضارة الاسلامیة ، ج١،ص(٩١–٩٧).

[**] ناوی مالك کوڕی ئەنەس کوڕی مالکی کوڕی ئەبی عامری کوڕی عەمری کوڕی حاریسی کوڕی غەیمانی کوڕی جوسەیلی کوڕی عومەری کوڕی ئەصبەحی مەدەنیە. دایکیشی ناوی (ئەلغالیە)ی کچی شەریکی کوڕی عەبدولڕەحمانە . کونیەشی عەبدیللایە ، ئیمام لە ساڵی (٩٣ك / ٧١٢ز) لە مەدینە لەدایك بووە و ساڵی (١٧٩ك/٧٩٥م) وەفاتی کردووە. بڕوانە : الشیخ محمد الخضری بك: تأریخ التشریع الاسلامي، ص١٤٩–١٥١.

**موعەمەر لە یەمەن، سوفیانی ثە وری**[****] **لە کوفـە. پـۆلی ئـیبن ئیـسحاق مغازی و ئەبو حەنیفـە**[*****]**شـی دانـا بـۆ بـواری فیقـه و بیروبۆچـونەکان،**

---

[***] ناوی ئەبو عەمر عەبدولڕەحمان کوڕی عەمر کوڕی محمـدە، لـە سـەردەمی ئومەویەکانـەوە لـە ولاَتی شام فەقیە و ئیمام بوەلە شاری بەعلەبەکی نزیك دیمەشق لە سوریا لەدایك بـووە لـە (٨٨ك) ،لـە منداڵیـدا بـاوکی وەفـات دەکـات و دایکـی ئیمـام بـۆ پـەروەردەکردنی منداڵەکـەی دێ بـە دێ دەیگەڕێنیّ و دەینێرێتە لای باشترین زاناکـانی ئـەوێ تـاوەکو پاشـتر چـونە دیمەشـق کـە ئـەوکات پایتەختی دەوڵەتی ئومەوی و هەروەها مەڵبەندێکی ڕۆشنبیری بەهێز بـوو ، لـەوێ سـودێکی زۆری بینی لە خزمـەت قـازی دیمەشـق( نومـەیری کـوڕی ئەوسـی ئەشـعەری). پاشـان لـە شـامدا چـووە خزمەتی زانایەکی دی گەورەلە بواری فیقهدا (مـەکحولی دیمەشـقی) پاشـان لـە دیمەشـقەوە بـەرەو یەمامە کەوتە ڕێ و لـەوێ لـەلای مامـستایەکی زانـستی فـەرمودە (یـەحیای کـوڕی ئـەبی کەسـیر) ماوەیەك مایەوە.پاشان ناردی بەرەو بەصـرە بـۆ لای هـەردوو زانـای گـەورە(حەسـەنی بەصـری و محمد کوڕی سیرین)، بەلاَم تاوەکو گەیشتە ئـەوێ هـەردوکیان گیانیـان سـپارد. پاشـان لـە سـاڵی (١١٠ك) لە تەمەنی (٢٢)ساڵیدا لە بەصرەوە بەرەو دیمەشق گەڕایەوە لە گەڕەکی ئەوزاع نیشتەجێ بوو. لەوێ بووە زانایەکی بەتوانا بە تایبەتی لە بواری (فیقه و حەدیسدا). لە تەمەنی ٧٠ساڵیدا لـە ڕۆژی(٢٨ی صفری ساڵی (١٥٧ك/٧٧٤م)وەفاتی کردوە. دەوتـرێ کـە زانایـانی تـەواوی ئاینـەکانی دی (یەهودی و نەسرانی و قیبتی) بۆی دەگریان. بڕوانە: د. طه جابر العلـواني: ئـەدەبی ئیخـتلاف لە ئیسلامدا، و: د. سەلاح و ئەندازیار سەرکەوت ئیبراهیم، ل٨٩. ابن النديم:الفهرست،ص٣١٢.

[****] ناوی سوفیان کوڕی سەعید کوڕی مەسروقی ثە وریە، لـە سـاڵَی (٩٧ك/٧١٦م) لـەدایك بـوە، لە(١٦١ك/٧٧٨م)لە شاری بەسرە وەفاتی کردوە.بڕوانە: عەلی باپیر: زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن، ل١٥١، محمدی شڵماشی: مەجلیسی ئەولیا، ل٩٣–١٠١.

[*****] ناوی ئەبو حەنیفە نوعمانی کوڕی سابتی کوڕی زۆتای کوڕی ماهی تەیمی کوفیە. لـە شـاری کوفە لە دایك بووە ساڵی( ٨٠ك/٦٩٩م) ، لە (١٢ی ڕەجەبی ١٥٠ك/٧٦٧م)لە شاری بەغداد وەفاتی کرد لە تەمەنی ٧٠ساڵیدا، بەهۆی زۆری خەڵکیشەوە شەش جار نوێـژی لەسـەر کـرا ، کـە نزیکـەی ٥٠هەزارکـەس دەبـون ،لـە ڕۆژی دووەمـدا خەلیفـە ئەبوجەعفـەری مەنـسور نوێـژی لەسـەر کـرد.. قەبرەکەی لە ڕۆژهەلاَتی شاری بەغدایە لە گۆرستانی حەیزەران کە ئێستا پێی دەوتـرێ (الاعظميـة ) ڕەچەڵەکی بنەماڵەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ شاری (کابولی) پایتەختی ئەفغانستان . تـابعین و هەنـدێ لە هاوەلاَنی پێغەمبەری دیوە،وەك (ئەنەسی کوڕی مالیك ، عەبدوڵلاَی کوڕی عەوف ، عامری کوڕی وائیل ، سەهلی کوڕی سەعد ،.....). بڕوانە:الشيخ محمد الخضری بك: تـأريخ التـشريع الاسـلامي، ص١٤٣–١٤٤

پاش ئەوانیش پۆلی ( هیثم، لیث، ئیبن لهیعة، ئیبن مبارك، ئەبو یوسف، ئیبن وەهب)ی دانا بۆ پۆلێن کردنی زانستەکان[1].

## ئیمامی ئەبوحەنیفە

ئیمام بەهۆی دەرس وتنەوەی زۆری و هاتوچونی و سەرقاڵی نەیتوانیوە فیکرەکانی خۆی بەتەواوی لەسەر پەرە بنوسێتەوە .بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەند نامیلکەیەکی بەجێ هێشتووە:

١. لە بواری فەرمودەدا (المسند) ی نوسی.

٢. لە بواری بیروباوەڕی ئیسلامیشدا بۆ ڕونکردنەوەی خاڵەکانی باوەڕبون و عەقیدەی موسڵمانان (الفقه‌الاكبر)ی نوسی.

٣. بۆ وەڵامدانەوەی پێرەوانی (القدريه)ش (الرد على القدريه)ی نوسی.

٤.لە بارەی زانا و فێرکردنیشەوە (العالم والمتعلم)ی نوسی.

ئیمام زانیاری و زانستی لەلای کۆمەڵێك لە زانستخوازان وەرگرتووە ، بە هەمان شێوەش بۆتە فێرکەری چەندین قوتابی و کردونیەتیە کەسانی شارەزا لە زانستە ئیسلامیەکاندا ، تەنانەت بونەتە هۆی نوسینەوە و گەیاندن و بڵاوکردنەوەی مەزهەبەکەی .

لە گرنگترین مامۆستاکانی: (نافع: یەکێك بوو لە خزمەتکارەکانی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، ئیمامی شەعبی، ئیمامی موحەممەدی باقر: موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب،.....).

ئیمامی هەیتەمی دەفەرمێ:(قوتابیەکانی ئیمام زۆربون کە ژمارەیان نزیکەی ٨٠٠کەس دەبوو) لەوانە:

---

[1] سیوطي: تأريخ الخلفاء، ص١٩٤.

١.ئیمامی موحەممەدی کوڕی حەسەنی شەیبانی .

٢.ئیمامی ئەبویوسف.

مەزهەبەکەی ئیمام لەلایەن ئەم دوو ئیمامەوە پەرەی پێدراو ڕۆشنکرایەوە ، ئەبویوسف بەدرێژایی ٢٣ساڵ دوای ئیمام ئەبوحەنیفە درێژەیی بە بڵاوکردنەوە و ئاشناکردنی خەڵك بە مەزهەبەکەی ئیمام دەکرد،ئەمەش لە ڕێگای دانانی چەند کتێبێکەوە لەوانە:(الاثار ، الرد علی سیرالاوزاعی : کە بە هاوکاری لەگەڵ قازی ابن ابی لیلی نوسیان ،کە تیایدا باس لەو راوبۆچونە جیاوازانە دەکەن کە لەنێوان حەنیفە و ئەوزاعیدا هەیە ،وە راکانی حەنیفەش زاڵ دەکەن بەسەر راکانی ئیمامی ئەوزاعیدا.

موحەمەدی کوڕی حەسەنی شەیبانیش چەندین کتێبی داناوە لەم بارەوە ،لەوانە(الاصل)یان (المبسوط)،(الزیادات)،(الجامع الصغیر)،(الجامع الکبیر)،(الردعلی اهل المدینه)،(الاثار).

٣.ئیمامی ئیبن موبارەك.

٤.ئیمامی فوزەیلی کوڕی عیاز

٥.یەحیای کوڕی مەعینی فەرمودەناس.

٦.ئەبوعاصمی نەبیلی فەرمودەناس.

٧. عەبدولڕەزاقی فەرمودەناس.

٨.فەزڵی کوڕی دوکەین ،کە مامۆستای ئیمامی ئەحمەد و بوخاریە.

٩.ئیمامی حەمزەی کوڕی حەبیبی زەییات.

١٠.هوشەیمی کوڕی بەشیری فەرمودەناس.

ئیمامی ئەوزاعی

ئیسماعیلی کوڕی عەیاش دەڵێ :(لە ساڵی ١٤٠ك ئەوزاعی زانای ئوممەتی ئیسلامیان پێ دەوت). لەوێ بووە زانایەکی بە توانا بە تایبەتی لە (فیقە و حەدیسدا)[•] .

ئەوزاعی لە زانایی فیقهدا بوو بە خاوەن مەزهەبی سەربەخۆی خۆی و لە هەردوو سەرچاوەی قورئان و فەرمودەوە حوکمە شەرعیەکانی دەرئەهێنا . ئیمام مەزهەبەکەشی بۆ ماوەی (١٥٠) ساڵێك مەزهەبی هەموو شام بوو لەگەڵ مەغریبی عەرەبی و ئەندەلوس ، بەلأم پاشتر مەزهەبی شافیعی جێی گرتەوە و ئەمەش بەهۆی گرنگی نەدانی قوتابیەکانی بە نوسینەوە و بلأوکردنەوەی نوسراوەکانی و فیکرەکانی.

لە ماوەی ژیانیدا چەند بەرهەمێکی داناوە ،لەوانە:

١. مسند الاوزاعی (لەبواری فەرمودەدا).

٢. کتێبی السنن.

٣. کتێبی المسائل.

٤. کتێبی السیرە، کە باسی چەند مەسەلەیەکی فیقهیە لە شێوەی گفتوگۆیەکدا لەگەڵ ئەبوحەنیفە، کە دواتر ئەبویوسف وەلأمی داوەتەوەو قسەکانی ئەبوحەنیفەی پەسەند کرد، شافیعیش ئەم گفتوگۆیانەمان لە کتێبی (الام)دا بۆ ئەنوسێتەوە[1] .ئیمام لەگەڵ ئەوەی کە هیچ پۆستێکی وەرنەگرتووەلە (دادگەری و چاودێری بەیتولمال،....)بەلأم لە بەرامبەر

---

[•] رۆژێ یەکێ لە قوتابیەکانی دەڵێ :ئەی باوکی عەمر من چوار رۆژە لە خزمەت تۆدام ،کەچی سی فەرمودەت پێداوم . ئەوزاعیش دەڵێ: ( ئەی کوڕی ئەبی سەللامە سی فەرمودەت بە چوار رۆژ دەستکەوتووە ، عەبدوڵڵای کوڕی جابر لە مەدینەوە ولأخێکی کڕی و بەرەو میسر کەوتە رێ بۆ یەك فەرموودە.

[1] ابن الندیم : الفهرست ، ص٣١٢.

هێزه نـەیارەکانی دەسەڵاتیـشدا ڕوبەڕوبۆتـەوە و ماڵەکـەی خـۆی کردۆتـە بنکەی شەڕ.

ئیمام مالیك

ئیمام له ماوەی ژیانیدا چەند کتێبێکی نوسیوه ، لەوانه:

١. الموطأ : تایبەته به فەرمودەکانی پێغەمبەر.

٢. رسالة في الوعظ .

٣. تفسیر غریب القران[1].

چەند مامۆستایەکی هەبووه ، لەوانه :

١. ئیمامی جەعفەری صادق .

٢. ئیمامی زوهری .

زۆر قوتابی گەورەش لەسەر دەستی پەروەردەو فێربون، لەوانه:

١. ئیمامی شافیعی.

٢. ئیمام ئەبو موصعەبی زوهری .

٣. ئیسحاقی کوڕی یوسفی ئەزرەقی فەرمودەناس.

٤. ئەسەدی کوڕی موسای ئومەوی فەرمودەناس.

٥. سەعیدی کوڕی حەکەمی فەرمودەناس.

٦. شوعبەی کوڕی حەججاجی فەرمودەناس.

٧. ئیمامی ئەوزاعی.

٨. ئیمامی ئیبن جورەیج.

٩. ئیمامی سوفیانی سەوری.

---

[1] خیرالدین الزرکلي : الأعلام، ١٢٨/٦.

١٠. ئیمامی نافعی کوڕی نوعەیمی مەدەنی : کە یەکێکە لە قورئان خوێنە بەناوبانگەکانی (القراءة السبعة).

ئیمام لە دەرسوتنەوەی خۆی بە قوتابیەکانی نەوەستا ،،تاوەکو دڵی وەستا و چووە ئەو دنیا لە بەیانی رۆژی چواردەی مانگی رەبیعولئەوەلی ساڵی ١٧٩ك لە تەمەنی ٨٦ساڵیدا وەفاتی کرد و لە گۆرستانی (بەقیع ) لە شاری مەدینە نێژرا و والی شاری مەدینەش عەبدوڵلای کوڕی موحەممەد نوێژی لەسەر کرد.

لەبواری خوێندنەوەی قورئانیشدا* چەند زانایەکی گەورە دەرکەوتن، ئەوانیش :

١. ئەبو عەمر : لە ساڵی ٦٨ك یان ٧٠ك لەدایك بووە ، لەشاری بەصرە ژیاوە ولە ١٥٤ك وەفاتی کردووە. ڕا جیای لە ناوەکەیدا هەیە ، بەڵام ناودارترینیان ئەوەیە کە ( ڕەییانی کوڕی ئەلعەلای کوڕی عەمماری بەصرییە ) ، پێشەوایەکی دیاربووە لە زمانی عەرەبیدا و خاوەنی فەتوا

---

* ئەم زانستە لە کۆتاییەکانی دەوڵەتی ئومەوی و سەرەتاکانی عەباسیدا دەرکەوت ، ئەویش خوێندنەوەی قورئان بوو بە حەوت جۆری جیاواز ، هەرچەندە لە ئێستادا شێوازی خوێندنەوەکان گەیشتۆتە ١٦ جۆر ، بەڵام زیاتر هەر لەو حەوت جۆرەوە سەرچاوەی گرتووە و هیچ جۆرە تازەگەرییەکی وای تێدا بەدی ناکرێت ، لێرەدا ناوی ئەو کەسانە و ساڵی مردنیان دەنوسم کەوا لەپێش دەورەی مەنصور دەستیان پێکردووە ، تاوەکو بەرچاو ڕونیەکتان هەبێت لە زانستەکە:

١. ئیبن عامر ( لە ٢١ك لە شام لەدایك بووە و لە ١١٨ك لە دیمەشق وەفاتی کردووە ) و خوێندنەوەکەشی بە خوێندنەوەی (شامیە) ناسراوە .

٢. ئیبن کەسیر ( لە ٤٨ك لە مەککە لەدایك بووە و لە ١٢٠ك هەر لە مەککە وەفاتی کردووە ) و خوێندنەوەکەیشی بە خوێندنەوەی (مەککی) ناسراوە .

٣. عاصمی کوفی ( لە کوفە لەدایك بوەو لە کوفەش وەفاتی کردووە ساڵی ١٢٧ك ) و خوێندنەوەکەیشی بە خوێندنەوەی (کوفی ) ناسراوە . بڕوانە / محمد علي الصابوني : التبيان في علوم القران ، ٢٢٨– ٢٣١، الوجيز في علوم القران ، ص٣٩ .

بــووه ، بەڕاســتگۆیی و فراوانــی زانــست ناســراو بــووه ، بــەلای ئــەهلی سوننەتەوە بە کەسێکی متمانە پێکراو دانراوە، لە پێڕەوانی:

أ. ئەلدوری : ٢٤٦ک وەفاتی کردووە .

ب. ئەلسوسی : ٢٦١ک وەفاتی کردووە .

ئەلشاتبی لە بارەیەوە دەڵێ :

وأما الإمام المازني صريحهم

أبوعمرو البصري فوالده العلا

أفاض على يحيى اليزيدي سيبه

فأصبح بالعذب الفرات معللا

أبو عمرو الدوري صالحهم أبو

شعيب هو السوسي عنه تقبلا

٢. حەمزە ئەلکوفی : ناوی ( حەمزە کوڕی حەبیب کوڕی عەممارە ئەلزیات )ە کە بە أبو العمارة ناسراوە ، ساڵی ٨٠ک لەدایك بووە و لە حەلوان ساڵی ١٥٦ک وەفاتی کردووە ، پێشەوایەکی خوانـاس و پابەنـدبوو بـە قورئـان و شارەزا لە فەرمودە و زانستی میراتدا ، لە پێڕەوانی :

أ. خەلەف : ٢٢٩ک وەفاتی کردووە .

ب. خەللاد : ٢٢٠ک وەفاتی کردووە[١] .

ئەلشاتبی لە بارەیەوە دەڵێ :

وحمزة ماأزكاه من متورع

إماما صبورا للقران مرتلا

---

[١] د.حسن ابراهيم حسن: تأريخ الاسلام(السياسي، الديني، الثقافي، الاجتماعي)،ج٢،ص٢٦٦. محمد علي الصابوني : التبيان في علوم القران ، ص٢٣١.

روى خلق عنه وخلاد الذي

رواه سليم متقنا ومحصلا

له بواری تەفسیریشدا * چەند موفەسیرێکی گـەورە دەرکـەوتن ، لـە بەناوبانگترینیان (مقاتل کوڕی سـلێمانی ئـەزدی، مردووەلـە١٥٠ك/٧٦٧م)

---

* وەك ئاشکرایە قورئـان بـە زمـانی پێغەمبەرەکـەی دابـەزیوە ، وەك خـوای گـەورە دەفـەرمێ لـە سورەتی ( إبراهيم / اية : ٤) : (( ومـا أرسـلنا مـن رسـول إلا بلـسان قومـه ليـبين لهـم )) ، وە ئـەو زمانەش زمانی عەرەبیە کە قورئان دوبارە لە بارەیەوە دەڵـێ : (( إنـا أنزلنـاه قرانـا عربيـا لعلکم تعقلون )) ، سورەتی (يوسف / اية : ٢ ) ، هەروەها بە پێی ڕای زۆربەی زانایان قورئان لـە زمـانی عەرەبی تێپەڕ ناکات ، بەڵام ئەوەیە کەبە زمانە جیاوازەکانی عەرەبی نوسراوە :(قورەیشی ، هذیل ، ثقیف ، هوازن ، کنانة ، تمیم ، یمن ).

<u>تەفسیر لەسەردەمی پێغەمبەر و یارانیدا</u>

خوای گەورە کاتێ قورئانی بۆ پێغەمبەر دەنارد ، لەگەڵیشیدا مەبەسـتەکەی بـۆ بـەیان دەکـرد ، وەك دەفەرمێ : (( إنا علينـا جمعـه وقرانـه ، فـإذا قرأنـا÷ فـاتبع قرانـه ، ثـم إن علينـا بيانـه )) ، سورەتی ( القيامة/ اية: ١٧ — ١٩ ) ، هەروەها هاوەڵان ( ڕەزای خوایان لێبێت ) تێئەگەیشتن کاتێ قورئان بە زمـانی خۆیـان دابەزیایـە ، بـەڵام بەشـێوەیەکی تـەواوەتی نـا ، وەك ئـیبن خەلـدون لـە (مقدمـه ) دا دەڵـێ : ( قورئـان بـە زمـانی عـەرەبی دابـەزی و هـاوەڵانیش تێیدەگەیـشتن ، بـەڵام بەتەواوەتی دەرکی ماناکەیان نەدەکرد کە مەبەستی چیە ) ، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ وشـە هـەبون لە قورئاندا کە هاوەڵان لێیتێنەدەگەیشتن ، وەك دەوترێت ڕۆژێکیان عومەری کوڕی خەتتاب چووە سەر مینبەر و فەرموی : ( وفاكهه وأبا ) پاشان وتی : ( فاکهە ئەزانم ، بەڵام ئـەی الأب ) ، یـاخود ئیبن عەباس کە دەڵێ نەمئەزانی ( ما فاطر السموات والأرض ) بە واتـای چـی دێـت ، تـاوەکو دوو ئەعرابیم بینی کە بیریان هەڵدەکەند ، یەکێکیان دەیوت : أنا فطرتها ، ئەوی تریشیان دەیوت : أنا أبتدأتها . ئیبن قوتەیبەش دەڵێ : ( عەرەب لە توانای ئەوەدا نەبون کە لە تەواوی قورئان تێبگەن .(.....

<u>تەفسیر لە سەردەمی تابعیندا :</u>

تەفسیر لەسەردەمی تابعیندا شێوازێکی تری وەرگرت کە ئەویش ڕێگای ( ڕەئی و ئیجتهاد ) بـوو ، چونکە نەیانتوانی تەواوی تەفسیری هاوەڵان و ئەوانیش لە پێغەمبەرەوە وەریانگرتووە کۆبکەنەوە ، لەگـەڵ ئەوەشـدا نادیاریـەکی زۆر لەسـەر مانـای هەنـدێ ئایـات هـەبوو ، هـەروەها لـە ئـەنجامی فتوحـاتی ئیـسلامیەوە چـەندین قوتابخانـە لەلایـەن قوتابیـانی هاوەڵانـەوە لەناوچـە جیاجیاکـانی

که ئیمامی شافیعی لـه بارەیـەوەدەڵێت: ( خۆشەویـسترین تەفـسیر لـەلام ئەوەی مقاتل)ە [1] ، لەگەڵ ( شـەعبەی کـوڕی حـەجاج، مـردووە لـە ١٦٠ك ) [2].

---

وڵاتانی ئیسلامیدا دامـەزران ، وەك // لـە مەککـە : قوتابخانـەی ئـیبن عـەباس ، لـە بـەناوبانگترین قوتابیەکانی ( سعید کوڕی جبیر ، موجاهید و عەکرەمـەی خزمـەتکارانی ، تـاوس کـوڕی کیـسانی یـەمانی ، عـەتائی کـوڕی ئـەبی رەبـاح ). لـە مەدینـەش : قوتابخانـەی ئوبـەی کـوڕی کـەعب ، لەبەناوبانگترین قوتابیەکانی:( زەیدی کوڕی ئەسلەم ، ئەبو عالیە ، محمد کوڕی کەعب ئـەلقرزی ) . لە عێراقیش : قوتابخانەی ئیبن مەسعود هەبوو کە نـاودەبرا بـە قوتابخانـەی ئـەهلی ڕەئـی ، لـە بـەناوبانگترین قوتابیـەکانی ( عەلقەمـەی کـوڕی قـەیس ، مەسـروق و ئەسـوەدی کـوڕی یەزیـد ، هەمەزانی ، عامر ئەلشەعبی ، حەسەنی بەصری ، قەتادەی کوڕی دعامەی ئەلسدوسی ) .

تەفسیر لەسەردەمی تەدویندا :

تـەدوین دەسـت پێـدەکات لـە کۆتاییـەکانی دەوڵـەتی ئومـەوی و سـەرەتای عەباسـیدا . ئـەم دەورەیە شێوازێکی تری وەرگرت ، ئەویش تەفسیرکردنی قورئان بوو سورەت بە سورەت و ئایـەت بە ئایەت لە سەرەتاوە بۆ کۆتایی ، ئەمەش لە پێغەمبەرەوە دەگێڕایەوە یان هاوەڵان یان تابعین .

بڕوانە // د. عبدالمجید محمود مطلوب : مباحث في علوم القران ، ص ١٨٦ – ١٩٢.

محمد علي الصابونی : التبیان في علوم القران ، ٦٣ – ٨٥

[1] هـ.س، ص٢٦٧.

[2] د. عبدالمجید محمود مطلوب : مباحث في علوم القران ، ص ١٩٣.

## ب. گروپە فیکریەکان:

### ١. شیعە [*] :

ئەوەی لێرەدا ئاماژەی پێدەدرێت لایەنە فیکری و زانستیەکەی ئەم گروپەیە لەم سەردەمەدا،چونکە وەك ئاشکرایە لە بەرامبەریشدا لایەنی سیاسیشی بووە [**] .

زیرەکی و لێهاتوی ئیمام جەعفەر سادق [***] لە بوارەکانی (قورئان، فەرمودە، فیقھ، تەفسیر)[١] دایە.

ئەمە جگە لەو دژ وەستانەوەی لەبەرامبەر بەرپەرچدانەوەی ئەو کۆمەڵانەی کەوا لەو سەردەمەدا پەیدابون وخۆیان بە ئالی بەیتەوە

---

[*] شیعە لەڕوی زمانەوانیەوە بە واتای (شوێنکەوتەی کەسێك ، یان چون بە دەم هاوکاریکردنی کەسێکەوە) وەك خوا دەفەرمێ:(( فاستغاثه الذي من شيعته))، لە ڕوی مێژویشەوە ڕاکان جیاوازن ، بەڵام خۆیان و هەندێ لە مێژوونوسان پێیان وایە هەر لەسەردەمی پێغەمبەرەوە بون و کۆمەڵێ بون هەمیشە لەگەڵ ئیمامی عەلیدا وەك(ئەبی زەر، سەلمانی فارسی، عەمماری کوڕی یاسر،...). بڕوانە: صديق عبدالله اغجلري: دراسات في المذاهب والفروق الاسلاميه، ص٣. مؤسسه البلاغ: نفحات من السيرة، ص٥١–٥٧. سيد صدرالدين: تأريخ التشيع الفكري والسياسي،ص٢٠–٢٣.

[**] ساڵی (١٤٥ك/٧٦٢م) دوو براکە دەرچون(محمد نفس زكيه و ئیبراهیم کوڕی عەبدوڵڵا) محمد لە مەدینە و ئیبراهیمیش لە بەسرە، مەنصوریش خۆیان و زۆرێك لە هۆزەکەیانی کوشت. سیوطی دەڵێ: (مەنسور یەکەم کەس بو ئاشوب و جیاوازی خستە نێوان عەباسیەکان و عەلەویەکانەوە). بڕوانە: الشيخ محمحد الخضري بك: الدولة العباسية،ص٧٩–٨٠. سيوطي:تأريخ الخلفاء، ص١٩٤.

[***] ناوی جەعفەر کوڕی محمد کوڕی عەلی کوڕی حوسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب. دایکی ئوم فروە کچی قاسم کوڕی محمد کوڕی ئەبی بکر صدیق. کونیەی (ئەبو عەبدوڵڵایە). لە(٨٣ك/٧٠٢م) لە دایك بوە، لە (١٤٨ك/٧٦٥م) مردووە و لە گۆرستانی بەقیع نێژراوە. بڕوانە: مؤسسة المعارف الاسلامية الثقافية: المعارف الاسلامية، ص٣١٣. مؤسسة المعارف الاسلامية الثقافية: الحياة السياسية لائمة اهل البيت، ص١٧٦–١٧٩.

[١] مؤسسة البلاغ: نفحات من السيرة، ص١٧١–١٧٢.

هەڵواسیبو کە پاشتر لە مێژوی ئیسلامیدا بـە (غلـو****)(ڕۆچـو) لـە بـەرز ڕاگرتنی ئیمام عەلیدا ناسران کـە ئـیبن خەلـدون لـە بارەیانـەوە دەڵـێ : ( .... غولاتەکان ئەوانەن ، سنوری ژیری و بڕواداریان تێپەڕاندوە کـاتێ کـە خوایــەتی ئیمامــەکان ڕادەگەیــەنن ، گوایــە ئەمانــە مــرۆڤن و ســیفەتی خوایەتیان هەیە یان خوا چۆتە ناو خۆی مرۆڤانەیانەوە ) .

هــەروەها یەکـەم کەسـە لـە دەوڵـەتی عەباسـیدا لـە بـواری زانـستی کیمیادا کاری کردبێت و کتێبێکـی هـەزار لاپــەڕەی لـەو بارەیـەوە نوسـی، هەروەها یەکێ بوە لە مامۆستایانی (جابری کوڕی حـەیان) کـە بـە بـاوکی کیمیا دەناسرێ[1].

لە بارەی زیرەکی ئەم ئیمامەوە ئیبن ئەبی لەیلا دەڵـێ: یەکـەم جـار کە ئیمامی حەنەفی چوو بۆ حزمەت ئیمام جەعفـەری صـادق منـی لەگـەڵ بووم ، دوای سەلام ڕوی لە من کـردوو فـەرموی: ئـەم زاتـە کێیـە؟ عـەرزم کرد قوربان ئەو زاتە پیاوێکی زۆر دانا و زانایە لە عێـراق ،فـەرموی :ئـەوە نەبێ کە عەمەل بـە قیـاس دەکـات ؟ئنجـا ڕوی کـردە ئیمـامی حەنـەفی و فەرموی: ناوت چیە؟ عەرزی کرد ناوم نعمانە، فـەرموی : یـا نوعمـان خـوا لەبەر چی ئاوی چاوانی سوێر و ئـاوی گوێیـانی تـاڵ و ئـاوی کونـە لوتـانی گەرم و ئاوی ناو دەمی شیرین کردووە؟ عەرزی کرد: نازانم.

فەرموی: خوای گەورە بە کەرەمی خۆی ئاوی ناو چـاوی ئـادەمیزادی سوێرکردووە چونکە چاوی لە بەزوو پیو دروسـتکردووەئەگەر بـەهۆی ئـەو ئاوە سوێرەوە نەبوایـە زوو دەتوایـەوە ،ئـاوی گوێـشی تـاڵ کـردووە ، تـا

---

**** دەگوترێ: غلا في الدين والامر يغلو، واتە: لە سنور دەرچوەو زیادەڕۆی تێداکردووە. بروانـە/ د. عرفان عبدالحميد : دراسات في الفرق والعقائد ، ص٤٩ .

[1] رشدي راشد: الموسوعة التاريخ العلوم العربية، ج٣، ص١١٠٤.

گیانەوەران نەتوانن لە گوێوە بچنە دەماغی سەری مرۆڤەوە ، ئـاوی کونـە لوتیشی گەرم کردووە ، تا کونە لوت هـەوا وەرگـرێ ، ئەگـەر ئـاوی کونـە لوت گەرم نەبوایە دەماغی مرۆڤ بۆگەنی دەکرد[1] .

[1] مەلا موحەممەدی شلماشی: مەجلیسی ئەولیا(١–٢) ،ل ٢٣–٢٤.

## ٢. موعتەزیلە*:

* اعتزل : واتە ( جیابونەوەی شتێك لە شتە سەرەكیەكە ، بەڵگەش ئەم ئایەتەیە لە سورەتی ( الدخان ) ، كە خوای گەورە دەفەرمێ : (( وان لم تؤمنوا لي فأعتزلون )) . ابراهيم مصطفى و اخرون : المعجم الوسيط ، جزء الاول والثاني / ص ٥٩٩ .

چەند ڕای جیاواز هەیە لەسەر دروستبونی ئەم گروپە :

١. لە ئەنجامی دروستبونی موناقەشە لەسەر ئەوەی ئایا مرۆڤ توانای هەیە بەسەر كردەوەكانی خۆیدا یاخود نا ؟ ئەمەش لەسەر بناغەی یەكێ لە بنچینە سەرەكیەكانی ئەم گروپەیە كە بریتیە لە (المنزلة بين المنزلتين– شوێنێ لەنێوان دوو شوێندا) هەربۆیە دەوترێ كاتێ حەسەنی بەصری ئەمەی بیست ، فەرموی: ( اعتزلنا واصل).

٢. لایەنی دووەم بۆ هۆكاری سیاسی دەیگەڕێننەوە : ئەو كاتەی كە ئیمامی عەلی و موعاویە چارەسەری ناكۆكیەكانیان كرد ، كۆمەڵێ لە هەردوو گروپەكە ( عەلی و موعاویە ) جیابونەوە (فاعتزلوا الفريقين).

٣.بەلأم قازی عبدالجبار الهمذاني ( مێژونوسی موعتەزیلە)دەڵێ: جیابونەوە مەبەست لە دانانی مەزهەبێكی نوێ و گروپێی هەڵگەراوە و جیانیە ، بەڵكو تەنها گروپەكەیان لەسەر ئەم فەرمودەی خواو پێغەمبەرە داناوە .

ا. خوای گەورە دەفەرمێ : (( وأعتزلكم وما تدعون )).(مريم :٤٨).

ب. پێغەمبەر دەفەرمێ:( من أعتزل الشر سقط في الخير ).

٤. لە ئەنجامی بەیەكگەیشتنی فیكرە جیاواز و فەلسەفیەكانی ناوچەكانی دی لەگەڵ دینی ئیسلامدا ، كۆمەڵێك موتەئەسیر بون بە فەلسەفەی ( یونانی ، هندی، بیروباوەری یەهودی و نەسرانیەكان ) دامەزرێنەری ئەم فیكرەش ( واصلی كوڕی عەتائە) ( ٨٠–١٣١ك) كە یەكێك بوو لە قوتابیەكانی حەسەنی بەصری ، بەلأم كاتێ بۆچونی (شوێنێ لەنێوان دوو شوێنیدا) دانا یان( نە كافرە و نە موسڵمان ) بە یەكێ لە جیابوان دانرا لە حەلەقەكەی حەسەنی بەصری. بڕوانە / هناء احمد النحاس : المختصر المفيد في الفرق الاسلامية ، ص٧٦–٧٨ .

موعتەزیلە كۆمەڵێكن كە ئەهلی سوننەت ئەوانیان ناو ناون موعتەزیلە ، بەلأم ئەوان خۆیان ناویان لە خۆیان ناوە ئەهلی عەدل و تەوحید ، ڕایان وایە هیچ شتێك كۆن نیە جگە لە خوای گەورە . پێنج بنەمایان هەیە كە قوتابخانەكەیان لەسەری دامەزراوە ، ئەوانیش : ( دادپەروەری ، یەكتاپەرستی ، هەڕەشە و ترساندن ، شوێنێ لە نێوان دو شوێندا ، ئەمر بە چاكە و ڕێگری كردن لە خراپە ) . بڕوانە / محمد عمارة : المعتزلة ومشكلة الحرية الانسانية ، ص٩ . موعتەزیلەكان زیاتر لە بیست گروپن ، بە گشتی پێیان وایە كە خوا ناتوانێ ڕێگر بێت لە چاكەكان یان هێنانی

لەگـەڵ دەسـتپێکردنی دەسـەڵاتی عەباسـیەکاندا موعتەزیلـەکان دەسەڵاتیان پەیدا کرد . لەکاتی حـوکمڕانی مەنـصوردا ( ١٣٦_ ١٥٨ ك / ٧٥٣_٧٧٤ م ) عـەمر کـوڕی عبیـد کـە یـەکێ بـو لـە دامەزرێنــەرانی موعتەزیله ، هاوڕێیەکی خۆشەویستی مەنصور بو ڕێزێکی زۆری لێدەنا [١] و گەورەتر لە گشت زاناکانی ئەو کـاتی دادەنـا و فـەزڵی دابـو بەسـەریاندا و دەیگوت :

کلکم یمشي روید کلکم طالب صید
غیر عمرو بن عبید[٢]

مەنصور زۆر کات بانگی دەکرد تاوەکو ئامۆژگاری بکات ، ئـەوەبو ڕۆژێکیان باسی لە هاوەڵە یەکەمینەکان دەکرد مەنصور دەسـتی کـرد بـە گریان ، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بونی کاریگەری ئەم کەسـایەتیە لەسـەری ، لەگەڵ ئەوەی مەنـصور ڕێزێکـی زۆری لـە موعتەزیلـەکان دەگـرت بـەڵام هیچ پۆستێکی حکومیانی پێنەئـەدا . لـە دوای مردنـی عـەمر کـوڕی عبیـد خەڵکی لە دەوری ئیبراهیم کوڕی عەبدوڵڵا کۆبونەوە کە فیکرەی شـیعەیی هەڵگرتبو ، بۆیە بەتونـدی لێیـان درا لـە لایـەن دەسـەڵاتەوە . بـە هـەمان شـێوەش لـە دەورەی مەهدیـدا ( ١٥٨_ ١٦٩: / ٧٧٤_ ٧٨٥م ) ، کـپ

---

خراپەکان . بڕوانە / الاشعری : مقالات الاسلامیین ، ج١/ ص ٢١٦ . البغدادی : الفرق بـین الفرق ، ص٩٣_ ٩٧ . بە کورتی ئەتوانین بڵێین یەکەم قوتابخانەی کەلامیە کە بیروبـاوەڕی ئیسلامیان بـە عەقڵ لێك ئەدایـەوە . لـە بەصـرەدا تەشـەنەیان سـەند لـە سـاڵی ١٠٠کۆچـیەوە . بڕوانـە / صـدیق عبداللة ا غجلر : دراسات في المذاهب و الفروق الاسلامیة ، ص ٥٣ .

[1] زهدي حسن جار الله : المعتزلة ، ص ١٢٥ .

[2] خضري بك : الدولة العباسیة ، ص٢٤٤ .

کرانـەوە و بەتونـدی لێیانیـدا و ژمارەیـەکی لێیـان کوشـت وەك : ( صـالح کوڕی عبد القدوس ، بـشار کـوڕی بـرد )[1] . بـەڵام لـە دەورەی ڕەشـیددا ( ١٧٠ك / ٧٦٨م) دوبارە هەستانەوەی بە خـۆوە بینـی ، کـە پاشـتر باسـی لێوە دەکەین .

[1] زهدي حسن جار الله: المعتزلة ، ص ١٢٥ .

## ج. زانستە عەقڵیەکان:

### ١. ئەندازیاری :

دروستکردنی شاری بەغداد[*] و دەرکەوتنی وەك مەرکەزێکی بەهێز لە ڕۆشنبیری و ماریفەت لە جیهانی ئیسلامیدا [1] دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی مەنصور . ئەوەی لێرەدا جێگای ئاماژە بۆ کردنە شێوازی دروستکردنی شارەکە و دەست نیشانکردنی بازاڕی کۆنی بەغداد بۆ بنیاتنانی پایتەختێکی نوێ کە ناونرا بە شاری ئاشتی . بنیاتنانی ئەم شارە لە ساڵی (١٤٥ك / ٧٦٦م ) دەستی پێکرد کە ڕوبەرەکەی (٧,٥کم٢) و لەسەر شێوەی بازنەیی بوو ، بە دەوریشیدا خەندەقێکی فراوانی دروستکرد و چوار دەرگاشی بۆ دروست کرد، کە ناوینان :

یەکەم : باشوری رۆژهەلأت ( دەرگای بەصرە ) بوو .

دوەم : باشوری خۆرئاوا( دەرگای کوفە ) بوو .

سێیەم : باکوری ڕۆژهەلأت ( دەرگای خوراسان ) بوو.

چوارەم : باکوری خۆرئاوا ( دەرگای شام ) بوو .

لەسەر هەر یەك لەم دەرگایانەش گومەزێکی گەورەی لە ئاڵتون گیراو هەبوو ، لە ناوەڕاستی شارەکەشدا مزگەوتێکی دروستکرد بەناوی خۆیەوەو کۆشکێکیشی دروستکرد کە پێیان دەوت دەرگای ئاڵتونی ، بە

---

[*] مێژونوسان ڕای جیاوازیان هەیە سەبارەت بە وشەکە ، هەندێك پێیان وایە وشەکە فارسیەو هەندێکی دی دەڵێن ئارامیە ، وە مەنصور بۆ خۆیشی ناوینا ( دار السلام ) ، سەبارەت بەکاتی تەواوبونیشی ڕای جیاواز هەیە هەندێك پێیان وایە لە ساڵی ١٤٩ك / ٧٦٦م ، وە هەندێکی تر پێیان وایە ساڵی ١٥٠ك / ٧٦٧م ، تەواوبوە . بڕوانە / د. شوقی ضیف : العصر العباسي الاول ، ص١٦ .

[1] د. جابر عزيز الشكري و د. محمود العياض : تأريخ العلم الكيمياء ، ص ٧٧.

دەوریـشیدا فەرمانگـە حکومیـەکانی دروسـتکرد لەگـەڵ شـوێنی مـاڵ و خێزانی و بەیتولماڵی موسڵمانان ، کـە فراوانـی ئـەم کۆشـکە دەگەیـشتە ( ٤٠٠ م٢) ، هەروەها لە ناوەڕاستی ئەم کۆشکەشـدا حەوشـەیەکی گـەورەی تێدا بوو کە ٢٠ مەتر بـوو ، لـە ناوەڕاسـتی حەوشەکەشـدا چـەند پایەیـەك بەرز کرابویەوە بەبەرزی سـی مـەتر کـە لـە سـەرەوەی شـێوەی کەوانـەی پێـدرابوو کـە پێـی دەوتـرا ( قبـة الخـضراء ) . لەسـەروی ئـەم گومەزەیەشەوە پەیکەری سوارچاکێك کرابو کە ڕمێکی بە دەستەوە بوو ، ئەم گومەزەیە لە هەمو لایەکی شاری بەغدادەوە دەبینرا .

لەنێوان زەویە فراوانەکە و شورەکاندا چەند شەقامێکی ڕاست هەبون کە تاقەکان و دوکانەکانی لەسەر دروستکرابون . پاشتریش دو جۆگەی بـۆ ڕاکێشا ، یەکێکیان لە ڕوباری دوجەیلەوە ئاوەکەی وەردەگرت و کـەوتبوە سـەروی شـارەکەوە ، ئـەوی تریـشیان لـە ڕوبـاری کـەرخایاوە ئاوەکـەی وەردەگرت کە کەوتبوە خواروی شـارەکەوە، هـەردو جۆگاکـەش دەهاتنـە ناو شارەکەوە و دەچونە ناو شەقام و کۆڵانەکانەوە ، بـە زسـتان و هـاوین ئاویان لێنەدەبڕا، لە نێوان هەریـەك لـەو چـوار دەرگایـەش کۆمـەڵێ بـورج هەبو ، بۆ نمونـە لـەنێوان دەرگـای کوفـە و بەصـرەدا (٢٩) بـورج هـەبو ، بـەڵام لـەنێوان دەرگاکـانی تـردا ( ٢٨ )بـورج هـەبوو . یـەکێکی تـر لـە گرنگیەکانی ئەم شارە ئەوەبو کە دابـەش کرابـو بەسـەر سـێ شـورەدا وە هەر یەکەیان شێوە بازنەی خۆی هەبوو[١] .

---

[1] بڕوانە / شیخ محمد خضری بك : الدولة العباسیة ، ص٩٩–١٠٠ . بلقـیس محـسن هـادی : تـأریخ الفن العربي الاسلامي ، ص٩٣ .

بۆ زانیاری زیاتر و بەرچاوڕونیتان ، نەخشەی شـارەکەم کێـشا و شـێوازی دابەشبونی ، بەم شێوازە :



١. جامع مەنسور .

٢. کۆشکی دەرگای ئاڵتونی کە بەرامبەر دەرگای شام بوو .

٣. دیوانە جیاوازەکانی دەوڵەت: بەیتولمال ، خانـەی چـەك (دارالـسلاح) ، خانەی داد (دارالقضاء) ، دیوانی خەراج ، نانەواخانە گشتیەکان ، دیـوانی ڕێکخستن ، دیوانی پەردەداری ، کۆشکی کورە بچوکەکانی خەلیفە .

٤. سجن ، کە پێیان دەوت ( المطبق).

٥. دەرگای بەصرە .

٦. دەرگای خوراسان.

٧. دەرگای شام.

٨. دەرگای کوفە .

٩. مزگەوتی (المسیب).

١٠. خانەی پاسەوانی و دیوانی یارمەتی و شوێنی حەوانەوەی موسافران.

١١. پردی کۆن .

١٢. پردی تازە .

١٣. کۆشك و مزگەوتی (الوضاح).

١٤. ڕێگایەك کە تێئەپەرێت بۆ ( قوس الحرانی ).

١٥. جامع (ضاحیة) بەغدادی ڕۆژهەلاّت.

١٦. گۆڕی مەعروفی کەرخی.

١٧. مەشهەد عەلی ناسراو بە مەشهەدی ناوچەکە.

١٨. خانەی وشکەساڵی .

١٩. کۆشکی حەمید کوڕی عەبدولحەمید و دەرگای (الشعیر).

٢٠. کۆشکی (عزدالدین) ی وەزیر.

٢١. دیری كۆن نزیك بە ڕوباری دیجلە و دەرگای بەصرە.
٢٢. دارالقرار : كۆشكی زوبێدە خاتون.
٢٣. كۆشكی نەمری.
٢٤. تەویلەی حەیوانەكانی خەلیفە.
٢٥. دیوانی ئاوەدانكردنەوە و خانەی پۆلیس .
٢٦. كۆشكی ئەمیر كوڕی سلیمان و صاڵح.
٢٧. سجنی دەرگای شام.
٢٨.كۆشكی سەعیدی نوسەر و پەیمانگای هەتیوان.
٢٩. دوكانەكانی ئەسپفرۆشی.
٣٠. گۆڕەپانی ئەسپ.
٣١. گۆڕەپانی (شعیب).[١]

[1] الدكتور ابراهيم أيوب: التأريخ العباسي السياسي والحضاري ، ص ٤٨-٤٩.

### ٢. پزیشکی:

سەرەتای زانستی پزیشکی بۆ بە غداد لەسەردەمی مەنصوردا لەلایەن بنەماڵەی بختیشیوعەکانەوە بوو کە یەکەم کۆمەڵ بون هاتنە بەغداد کە لە پزیشکانی جندیسابور بون وممارەسەی ئەم زانستەیان دەکرد بە ڕێگایەکی زانستیانە ، لەوانەش :

یەکەم کەس کە مەشخەڵی زانستی پزیشکی یۆنانی وەرگرت لە بەغداد ( جورجیس کوڕی جبرائیل [*] ) بوو ، ئەم پزیشکە لە بیمارستانی جندیسابور کاری دەکرد و کۆمەڵێ لە یارمەتی دەرو قوتابی هەبوو ، لەوانە : ( عیسا کوڕی شەهلا ، ئیبراهیم ، کوڕەکەی بختیشوع ) بەهۆی شارەزایی و لێهاتویەوە مەنصور داوای لێکرد کە چیدی لەوێ کار نە کات و بێتە شاری بەغداد ، جورجیسیش لە ساڵی (١٤٨ك / ٧٦٥م )، هاتە شاری بەغداد[١] و لەوێ دەستی کرد بەکاری چارەسەرکردن . بەهۆی زیرەکی و لێوەشاوەییەوە خەلیفە کردیە پزیشکی تایبەتی خۆی ، لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا داوای لە خەلیفە کرد کە مۆڵەتی بدات بگەڕێتەوە ناوچەکەی خۆی ، ئەویش مۆڵەتیدا و لەوێ مرد لە ( ١٥٢ك / ٧٦٩م ) . لە دانراوەکانی لە بواری پزیشکیدا کتێبی ( کناش )ە ، کە دواتر لەلایەن حنین کوڕی ئیسحاقەوە وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی، لەم کتێبەدا

---

[*] بنەماڵەی بختیشیوعیەکان ، بنەماڵەیەکی نەصرانی بون و هیچکات کەسێکی نێو بنەماڵەکەیان موسڵمان نەبوە بەڵکو لەسەردینی خۆیان بەردەوام بون و لە خزمەتی کڵێسەدا بون . دەڵێن خەلیفە مەنصور ویستویەتی ئیقناعی بکات بە ئیسلام ، ئەویش وتویەتی : ( حەزدەکەم باووباپیرانم لە کوێ بن منیش لەوێ چ لە بەهەشت بن یا دۆزەخ )، جارێکی دیش خەلیفە سێ کەنیزەکی بۆ دەنێرێ کە دەزانێ ژنەکەی پیرە ، ئەویش ڕەدیان دەکاتەوە و دەڵێ : ( دین ڕێگەم پێنادات تا ژنەکەم لە ژیاندا بێت ژنی ترم هەبێت ) . بڕوانە / www. Islamset . com .

[1] د. اوارد جی . براون : الطب العربي ، ص٢٧ .

چارەسەری بۆ چەند نەخۆشیەك دۆزیبۆوە ، لەوانە : ( نەخۆشی گەدە ، قورحەی گەدە ، دومەڵ ، تا ، بڕاوی ، میز بەخۆداکردن ، نەخۆشی منالآنە ، ئێش و ئازاری سك و سكپڕی ، باکردن ، سورێژە ، ئێش و ئازاری جومگە ، دەمارتوند بون ، .... ) . سەبارەت بە كتێبی دوەمیشی كتێبی ( اخلاط ) بوو ، لەوێشدا چارەسەری بۆ چەند نەخۆشیەك دۆزیبۆوە لەوانە : ( ڕەوانی ، سارێژكردنی برین ...[1] ) .

لە دوای مردنی جورجیس ، كوڕەكەی بختیشوع جێگەی گرتەوە و بووە پزیشكی تایبەتی مەنصور . لە ئەنجامی بەردەوامی كاری پزیشكی چارەسەری چەند نەخۆشیەكی دۆزیەوە ، لەوانە : ( چارەسەری سكچون و ڕشانەوە ، دیاریكردنی ترپەی لێدانی دڵ ، دابەزینی خوێنی مانگانەی ئافرەت لە كاتی سكپڕیدا ، فرێدانی بەردی میزڵدان ، ئازار لەناوچەی حەوز ، دۆزینەوەی هەستەكان ) ، ئەمەشی لە كتێبێكدا بڵاو كردەوە بەناوی ( التذكرة في الطب )[2] .

---

[1] ابن ابي اصيبعة : عيون الانباء ، ج٢/ ١٨٣-١٨٦ .

[2] ه . س. ص ١٨٧. ابن النديم : الفهرست ، ةص٤٠١ .

**٣. فەلەك:**

مەسعودی دەڵێ : ( یەکەم خەلیفەیە کە گرنگی داوە بە ئەستێرەناسی و کاری بە یاسا گەردونیەکان کردووە)[١]. کاتێ بڕیاری دروستکردنی شاری بەغدادیدا ، ئەستێرەناسانی کۆکردەوە و بەردی بناغەی دانەنا تاوەکو ئیشارەتی کرد بۆ ( ئەبو سەهل فەزڵ کوڕی نوبخت[*] ) کە یەکێ بو لە ئەستێرەناسەکانی ئەو سەردەمە ، ئەویش هەواڵی پێدا بەوەی کە لە ڕوی ئەستێرەناسیەوە شارەکەی مانەوەی درێژە دەکێشێت و بیناکانی گەورە و فراوان و زۆردەبن [٢].

دەڵێن کاتێ مەنصور خوی دایە ئەم زانستە ( محمد نفس زکیە ) وازی لێهێنا کە زۆر دڵسۆز بو بۆی ، ئەمەش مەنصوری بێتاقەت کرد ، حارثی ئەستێرەناسیش پێی وت : ئەی ئەمیری موسڵمانان چی غەمبارو بێتاقەتت دەکات ؟ وەڵلاّی ئەگەر مەلیکی هەمو زەوی بێت نامێنێتەوە ئیللا نەوەد ڕۆژی تر نەبێت[٣] ، بەلاّم سەلماندنی ئەمە دژواریەکی زۆری هەیە کە مەنصور بەو ڕادەیە پشتی بە ئەستێرەناسی بەستبێت ، منیش جگە لەم سەرچاوەیە هیچی ترم بەرچاو نەکەوتووە لەوبارەیەوە .

لەو ناودارانەش کە کاریان کردوە لەم بوارەدا : ( نوبخت مەجوسی )، ( ئیبراهیم فزاری منجم ) و ( عەلی کوڕی عیسا ) ، ئەم کەسایەتیە

---

1 مسعودي : مروج الذهب ، ج٣ / ص٢٤١ .

* ئەصڵی فارسیە ، ڕەچەڵەکی لە بنەماڵەی نوبخت ، ئەم پیاوە وەرگێڕانیشی کردووە لە فارسیەوە بۆ عەرەبی و کاری کردوە لەسەر زانستی کتێبە فارسیەکان ، لەو کتێبانەش : النهمطان في المواليد ، الفأل النجومي ، المواليد الفرد ، تحويل سني المواليد ) . ابن النديم : الفهرست ، ص٣٧٥ .

2 د.حسن ابراهيم حسن ، ج٢ / ص ٢٨٧.

3 هـ. س .

رسالەیەکی دەربارەی ئسطرلابي[**] خستە ڕوو ، بۆ ئەم بوارەش سـودێکی زۆری لە کتێبی (سـند هنـدی)ی هینـدی و مجـسطی یۆنـانی و ئرثمـاطیقی بینیـوە کـە توانیویـەتی گرێیـان بداتـەوە بـە زانـستی ئەسـتێرەگەری و جوڵانەوە گەردونی و هەسارەییەکانەوە [١] .

زانـستی هێڵکـاریش ، یـەکێ بـو لـەو دۆزینەوانـەی کـە لـە ئـەنجامی گەڕانیان لەو بـوارەدا پێـی گەیـشتن ، ئـەویش لـە ئـەنجامی دروسـتکردنی دروستکراوێکی ژمێریاریەوە بوو کە لەسەر یاسا کانی ژمارەی بەنـد بـوو ، لەو ڕێگەیەوە جوڵانی هەسارەکان و دیاریکردنی جۆری جوڵەکەیان دەکـرا و ڕۆژ و مانگ و ساڵیان پێدۆزیوەتەوە ، ئەم کارانەشی لـەناو خـشتەیەکدا ڕێکدەخـست کـە پێـی دەوتـرا ( الـزیج ) پێـشیان دەوت ( دەرهێنـانی شـوێنگەی هەسـارەکان )[٢]، یەکـەم کەسـێکیش هەسـتابێت بـە دانـانی کتێبێك لەو بوارەدا حارث منجم بوو کە کتێبەکەی ناو نا ( الزیج )[٣] .

یـەکێکی دی لـەو پێـشکەوتنانەی کـە زانایـان پێیگەیـشتن ئـەوەبوو کەلەسـەرەتادا پێیـان وابـو زەوی چـەقی گەردونـە ، بـەڵام ئـەم بیرۆکەیـە هەرەسی هێنا و بۆیان دەرکەوت کە خۆر چەقی گەردونە و زەوی لـە یـەك کاتدا بە دەوری خۆی و خۆریشدا دەسورێتەوە .

---

[**] ئامێرێکی فەلەکیـە بـۆ چـاودێری کردنـی ئەسـتێرە و هەسـارەکان . بڕوانـە / زیغریـد هونکـە : شمس العرب تسطع على الغرب ، ت: فاروق بیضون ، کمال دسوقی ، ص١٩٥

[1] د. رشید الجمیلی : الترجمة في المشرق الاسلامي في القرنین الثالث والرابع الهجری ، ص٤٠٢.

[2] ابن خلدون : مقدمة ، ص٤٨٨-٤٨٩ .

[3] ابن الندیم : الفهرست ، ص٣٨٠ .

لەگــەڵ ئەمانەشــدا بۆیــان دەرکــەوت مــانگ ڕونــاکی لــە خــۆرەوە وەردەگرێت و توانیان بۆ یەکەم جار قیبلە دیاری بکەن بۆ هەموو جیهـانی ئیسلامی لە ڕێگای قیبلە نماوە [١] .

**٤. بیرکاری:**

خەلیفە فەرمانیدا بە وەرگێڕانـی کتێبـی ( SIDDHANTA ) ، کـاتێ وەرگێــڕڕا نـاوی کتێبەکـە کـرا بــە ( سـند هنـد ) ، کـە بەرهــەمی فەلەکناس و بیرکاری ناسی هندی ( براهما جوبتا بوو ، ژیاوە لـە مـاوەی ســالانی ٥٨٨ك / ٦٦٠م ) ، لەلایــەن فەلەکناســی هنــدی ( کنکــاە )وە پێـشکەشی خەلیفـە مەنـصور کـرا و خەلیفـەش فەرمانیـدا بـە وەرگێڕانـی کتێبەکە بـۆ سـەر زمـانی عـەرەبی، ئـەم کتێبـە دو بەشـی پەیوەسـتە بـە زانستی بیرکایەوە [٢] ، وەك ئولیری دەڵێ : ( رسالەی هندی بـۆ مەسـەلەی ژمێریـاری گرنگیــەکی گــەورەی هــەبو ، بــەهۆی ئەمــەوە ژمــارەی هنــدی گوێزرایــەوە بــۆ موسـڵمانان* و بەمــەش بــە درێـژای کـات بونـە ژمـارەی

---

[1] د. رشید الجمیلی : الترجمة في المشرق الاسلامي في القرنین الثالث والرابع الهجری ، ص٤٠٢-٤٠٣

[2] جلال شوقي و علي الدفاع : العلوم الریاضیة في الحضارة الاسلامیة ، ج١ / ص٣٧ و ٣٨ .

* موسڵمانەکان لە ژمارەکاندا دوو گۆڕانیان کرد ، ئەوانیش بونی بەکارهێنانی ژمارە (سفر) لەگـەڵ (فاریزە )بوو. ژمارەکانیش بۆ دوو جۆر دابەشیان دەکەین :

١. ڕێگای ڕۆژهەلاتی :

لە ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی ئیسلامیدا (مەبەستمان لە هیندستانەوە تاوەکو میسر )ە لە هندیەکانەوە وەریانگرت و تەنها سفر و فاریزەیان تێدا زیادکرد، ژمارەکانیش بەم جۆرە دەنوسران :

( ١ ، ٢، ٣، ....٨ ، ٩ ، ٠ ) .

٢. ڕێگای مەغریبی :

ئەمەش بەکاردەهێنرا لە ناوچەکانی مەغریبی نزیك و ناوەڕاست و دوور ( جەزائیر و لیبیا و تونس و مەغریبی ئێستا ) کـە پاشـتریش ئـەم نوسـینە گوازرایـەوە بـۆ ئـەوروپا کـە لەلایـەن موسـڵمانەکان خۆیانەوە دانرابوو. ژمارەکانیش بەم جۆرە دەنوسران : 0 ,9 ,8.... ,3 ,2 ,1

عەرەبی )[1]. ئەوانەی لەم دەورەیەدا کاریان دەکرد لەم زانستەدا کەسانی وەك : ( عمران کوڕی وضاح ) و ( شهاب کوڕی کثیر)بون [2].

**٥. دەرمانسازی:**

مەنصور لە ساڵی (١٤٨ك / ٧٦٥م ) هەستا بەناردنی پەیامێك بۆ پزیشکە گەورەکانی بیمارستانی جندیسابور و بەڕێوەبەری بیمارستانەکە جورجیس کوڕی جبرائیل و خەلیفە داوای لێکردن کە لە بواری دەرمانسازیدا کاربکەن ، ئەوەبو ئەوانیش کتێبی ( دیسقوریدس ) و (جالینوس)یان وەرگێرا لە زمانی سریانیەوە ، لە ئەنجامی ئەم وەرگێڕانەشەوە چەند دەرمانێکیان دۆزیەوە ، لەوانە : ( ترشی نتریك ) کە پێیان دەوت ئاوی ( زیو ) ، ترشی کبریتك ( زەیتی زاخ ) ، نیتراتی زیو ( بەردی دۆزەخ ) ، کحول ( بە دلۆپاندن لە مادەی شەکرو نیشاستەمەنی )[3].

پزیشکەکان بۆ یەکەمین جار ( قاوە )یان دانا وەك چارەسەرێ بۆ نەخۆشی دڵ و بە هاڕاوەی بۆ چارەسەری هەوکردنی لەوزەتێن و سك و هەوکرنی برین . کافوریش بەکاردەهێنرا بۆ بوژانەوەی دڵ و مادە کیمیاویەکانیش ئامادە دەکران لە ڕێگای ( کوتان ، لێدان ، بێژانەوە ،

---

هەروەها موسڵمانەکان جۆرەکانی نوسینی ژمارەیان دابەشکردبوو بۆ سێ جۆر :

أ. ژمارەیی ( ژمێریاری ).

ب. هەندەسی ( ئەندازەیی ).

ج. دانانی ( مۆسیقی ). بڕوانە / الدکتور محمد جواد سعدالدین و نافع یحیی الدراجي : الریاضیات في التراث العربي الاسلامي ،ص ٥-٦.

[1] د. ابراهیم سلمان و د. عبد الله التواب : المرجع فی الحضارة العربیة الاسلامیة ، ص٢٢٦-٢٢٧

[2] د.حسن ابراهیم حسن ، ج٢ / ص٢٨٧.

[3] د. رشید الجمیلی : الترجمة في المشرق الاسلامي في القرنین الثالث والرابع الهجری ، ص٤٢٢ .

لێنان ، تـەڕكردن ) ، لەگـەڵ ئەمانەشـدا نـاوى دەرمانـەكانیان دەنوسـى و بەشێوازى پۆلێنكارى و ناویاننابو ( ئقرابازینات [*] ) بەم شێوازە : ( بەشـى لوتگیران ، هەرسكردن ، قەبزى ، ... )[١] .

ناوچەكانى كوفە و بەصـرە بـەناوبانگ بـون لـە دروسـتكردنى ڕۆنـى بۆنــداردا و ئەمــەش لەلایــەن پزیــشكەكانەوە بــەكاردەهێنرا لــە دەرمانخانەكاندا وەك چارەسەرێ بۆ چەندین نەخۆشـى ، ئـەم ڕۆنـەش لـە چـەندین جـۆر پێـك دەهـات : ( وەنـەوش ، نیلـوفر ، نێرگـز ، سوسـن ، مێلاخە ، نارنج ، گوڵەباخ ، زەعفەران ، هەلاڵە ، ....)[٢] .

---

[*] ئـەم وشـەیە لـە وشـەى سـریانى ( كرافـاذین ) ەوە وەرگـیراوە و ئـەمیش لـە وشـەى یۆنـانى ( كرافیدون ) ەوە وەرگێراوە كە بە ماناى رسالەى بچوك دێت . بڕوانە / د. رشید الجمیلى : الترجمة في المشرق الاسلامي في القرنین الثالث والرابع الهجرى ، ص٤٢٣.

[1] د. رشید الجمیلى : هـ .س .

[2] میخائیل عواد : صور مشرقة من حضارة بغداد في العصر العباسي ، ص٣٢.

# باسی دووەم
# وەرگێڕان[1] لەدەورەی مەنسوردا

وەرگێڕان واتای ( گواستنەوەی زانیاریـە لـە زمانێکـەوە بـۆ زمـانێکی تر)[2] .

یەکـەم دەرکـەوتنی وەرگێـرانیش بریتـی بـو لـە وەرگێرانـی کتێبـە پزیشکیەکان بۆ سەر زمانی سریانی ، بەهۆی شارەزاییان لە زمانی یۆنانی ئەمـەش سـەرەتا لـە سـوریا و پاشـتریش لـە ئەسـکەندەریە وەکـو کتێـب دەخوێندرا ، لە ناوچەی جندیسابوریش لە لایەن پزیـشکە بـە تواناکانـەوە دەسـت کـرا بـەوەرگێڕانی هەنـدێ لـە کتێبـە پزیـشکیەکان ، بـە تایبـەتی بەرهەمــە نوژداریــەکانی ئبقــراط بۆســەر زمــانی ســریانی ، کــە پاشــتر وەرگێڕرانـە سـەر زمـانی عـەرەبی . لـە پێـشەنگانی ئەمانـەش جـورجیس کوڕی بختیشوعە ، کە ئەو کاتە بەڕێوەبەری بیمارستانی جندیسابور بـوو[3] .

---

[1] کرداری وەرگێران لـە دەوڵـەتی ئومەویـدا نـەبووە دیاردەیـەکی ئاشـکراو دیـار ، بـە تایبـەتی لـە وەرگێرانی کتێبە فەلسەفیەکاندا ، جگە لە دەورەی خالیدی کوڕی یەزیدی کوڕی معاویـە کـە ئـیبن نەدیم لە بارەیەوە دەڵـێ : ( خالیـدی کـوڕی یەزیـدی کـوڕی معاویـە نـاودەبرێ بـە حـەکیمی ئـالی مەڕوان) کەفەرمانی داوە بە کۆکردنەوەی کتێبە فەلسەفیەکان لە میسر و وەرگێرانیان بۆ عـەرەبی لە زمانەکانی یۆنانی و قیبتیەوە ، ئەمەش بە یەکەم وەرگێران دادەنرێت لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر لە مێژوی ئیسلامیدا ، پاشانیش ئەوەبو دەستکرا بە وەرگێڕانی دیوانەکان لە زمـانی فارسـیەوە بـۆ زمـانی عـەرەبی. بڕوانـە : ابـن النـديم :الفهرسـت ، ص٣٣٨. حـاجی خليفـە: كـشف الظنـون ، ٦٨١/١.

[2] ابراهيم مصطفى واخرون : المعجم الوسيط ، ج١ / ص ٨٣ .

[3] د. كمال السامرائي : مختصر تأريخ الطب العربي ج١ / ص٣٣٩ .

خاوەنی کتێبی ( مێژوی فەلسەفەی ئیسلام لە نێوان ڕۆژهەلأت و ڕۆژئاوادا ) دەڵێ : ( دەورەی ئاڵتونی کە ماوەی سەدەیەك بو ١٣٢ك_ ٢٣٢ك / ٧٥٠ك_ ٨٤٧ گەشەسەندنێکی گەورەی بەخۆوە بینی لە وەرگێڕانی زانستە بیانیەکان بۆ زمانی عەرەبی )[1] .

دکتۆر ڕەشید جەمیلیش دەڵێ : ( لە دەورەی یەکەمی عەباسیدا ، وەرگێڕەکان کاریان لەسەر ئەوە دەکرد پارێزگاری بکەن لە گەیاندنی وشە بیانیەکان وەکو خۆیان بەلأم بە دەربڕینی زمانی عەرەبی ، ئەمەش بەهۆی نەبونی فەرهەنگێکی یۆنانی _ عەرەبی یا فارسی _ عەرەبی یا هندی _ عەرەبی )[2] .

( ت. ج . دی بور ) مامۆستا لە زانکۆی ئەمستردامیش دەڵێ : ( گرنگی دان بە هیند بە درێژایی خیلافەتی عەباسی بووە ، چ لە ڕوی بازرگانیەوە یاخود وەرگرتنی دانابییەوە ، ئەمەش لە دەورەی مەنصوردا دیارە کە کتێبە هیندیەکان چۆن لە زمانی فارسی و سنسکریتیەوە وەرگێرراونەتە سەر زمانی عەرەبی )[3] .

وەرگێڕەکانی ئەم سەردەمەش ئەمانە بون :

جورجیس ، کاری وەرگێڕانی لە زمانی یۆنانیەوە بۆ زمانی سریانی دەکرد ، بەلأم پاشتر کتێبەکانی وەردەگێڕایە سەر زمانی عەرەبی هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوە بوو ، سەرەتا لەناوچەی جندیسابور بوو ، بەلأم دواتر لەلایەن مەنصورەوە داوا کراو چوە بەغداد[4] ، لەگەڵ ئەمەشدا ئەو

---

[1] محمد لطفی جمعة : تأريخ فلاسفة الاسلام في المشرق والمغرب ، ص ل و ن .

[2] الترجمة في المشرق الاسلامي ، ص٣٧ .

[3] ت. ج. دی بور : تأريخ الفلسفة الاسلام ، ت : محمد عبالهادي ابو ريدة ، ص ١٢.

[4] د. ادوارد جی براون : الطب العربي ، ت : داود سليمان ، ص٢٧ .

سەرچـاوانەی باسـیان لـەم کەسـایەتیە کـردووە تـەنها وتویانـە کـاری وەرگێڕانی کردووە بەلاّم بەرهەمەکانیان دیاری نەکردووە .

محمـد کـوڕی ئیـبراهیم فـزاری ( یەکـەم زانـای فەلـەکی موسـڵمان ، مردوە لە ٧٩٦ یا ٨٠٦م ) وەرگێڕانـی لـە زمـانی پەهلەویـەوە کـردووە بـۆ زمـــانی عـــەرەبی ، لـــە گـــرنگترین وەرگێرانەکانیـــشی کتێبـــی (SIDDHANTA سند هند [1])ە .

[1] جلال شوقي و على الدفاع : العلوم الرياضية في الحضارة الاسلامية ، ج١ / ص٣٧ و ٣٨ .

## ئیبن موقەفەع [*] ، بە یەکێ لە وەرگێرە کارامەکان دەناسرێ لە

[*] ئیبن موقەفەع (١٠٦– ١٤٢ك/ ٧٢٤–٧٥٩ز)

١. مێژوەکەی : ناوی فارسی روزبە کوڕی دازویە ، لەسەر دینی مەجوسی مانەوی بوە ، لە پاش موسڵمان بونی ناوی خۆی گۆری بۆ ( محمد عەبدوڵلاَ ) ناسراوە بە ( ئیبن موقەفەع ) . سەبارەت بەناوی ( روزبە: پیرۆز ) دێت . لە گوندی (جور) لەوڵاتی فارس لەدایك بووە لە ساڵی ( ١٠٦ك/٧٢٤ز) گەورە بووە لە نێو کلتور و رۆشنبیری فارسی و لەگەڵ پتەو بونی دین و ئیمانەکەی لەسەر ئاینی زەردەشتی . لە تەمەنی لاویدا بەرەو بەصرە هاتووە لەوێ رووبەرووی کلتور و رۆشنبیری موسڵمانەکان بۆتەوە و توانیویەتی هاوسەنگی و مومارەسەیەکی جوان بکات لەگەڵ ئەو دوو کلتورە جیاوازانەدا . پەیوەندی کردووە بە ( عومەری کوڕی هبیرە)ەوە و پاشانیش کورەکەی ( یەزیدی کوری عومەری هبیرە) والی عێراق لە پێش مەروانی ئومەوی وەکو نوسەر کاری بۆ کردون. لە دەورانی عەباسیشدا پەیوەندی کرد بە ( عیسای کوڕی عەلی ) مامی سەفاح و مەنصور کە والی ئەهواز بوو ، لە رێورەسمێکی جواندا موسڵمانبونی خۆی ڕاگەیاند لەسەر دەستی ئەوان و پاشانیش بووە نوسەریان . ئەوەبوو لە دەورانی مەنصوردا کوژرا لە ساڵی (٧٥٩ز) لە تەمەنی (٣٥) ساڵیدا . سەبارەت بە ساڵی کوشتنەکەشی ڕای جیاواز هەیە ، بەم شێوازە : ( ١٤٢ : ، ١٤٣ك ، ١٤٥ك ) . بڕوانە / د. شوقی ضیف : عصر العباسی الاول ، ص٥٠٨ _ ٥٠٩ .

٢. ئەدەبەکەی:

أ. کلیلە و دمنە : ئەم بەرهەمە چەندین چاپی جیاوازی هەیە ، لەوانە ( چاپخانەی الأب شیخو ، خلیل الیازجی ، دارالمعارف لە میسر ، دارالاندلس لە بەیروت ، ....) بەڵام ئەوەی بەشێوەیەکی جوان و زانستی چاپی کردبێت ( دارالمعارف و دارالاندلس )ەکەیە .

ب. الادب الصغیر : لەم کتێبەدا وتەیەکی دارێژراوی تێدایە کە بناغەیە بۆ تەواوی کتێبەکانی ، ئەویش دەڵێ : ( کەسی عاقڵ نابێت لەم چوار حاڵەتە زیاتر خۆی سەرقاڵ بکات . کاتێك بۆ بەرزکردنەوەی پلەی لایخوا ، کاتێك بۆ موحاسەبەکردنی نەفسی ، کاتێك بۆ دانیشتن لەگەڵ دۆست و برادەرانیدا بەمەبەستی بەهێزکردنی لایەنی رۆشنبیری ، کاتێکیش بۆ تێرکردنی چێژوخۆشیەکان و چارەسەرکردنی کێشەو ململانێکان . بەراگرتنی ئەم تەرازوی نەفس و جەستە بناغەیەکە بۆ ئەوەی مرۆڤ بەرەو کەماڵ و کاملێتی بچێت ).

ج. الادب الکبیر .

د. کتاب التاج .

ز. رسائل ابن المقفع ، کە بەناوبانگە بە (رسالە الصحابە) : لەم پەیامەیدا رەخنە دەگرێ لە خەلیفە و دەسەلاَت و یاسا و قانونی وڵات لەدانانی باج و خەراج ، دەیەوێ بەشێوەیەکی زانستیانە

وەرگێڕانى كتێبە هندیەكان لە زمانى پەهلەویەوە بۆ سەر زمانى عەرەبى ، لــە ناســراوترین بەرهەمیــشى ( كلیلــە و دمنــەى )فەیلەســوفى هینــدى بەیدەبایە كە بۆ پاشاى هیند دەبشەلیمى نوسیوە ، سەبارەت بەوەى كـە چۆن وەرگێرراوەتە سەر زمانى پەهلەویش ، كیسرا ئەنوشـیروان بـۆ خـۆى داواى لـە (بـرزەوى) پزیـشكى خـۆى كـردووە تـاوەكو وەریبگێرێتـە سـەر زمانى پەهلەوى پاشتریش ئیبن موقەفەع وەریگێڕایە سەر زمانى عـەرەبى بۆ خەلیفە مەنصورى عەباسـى[١] . لـە مـاوەى ژیانیـدا چـەندین كـارى تـرى وەرگێڕانى كردوە ، لەوانە :

( خداینامة في السیر ، مزدك ، ایین نامة ، التاج في السیرة أنوشـیروان ، الادب الكبیر ، الادب الصغیر ، التیمیة )[٢]، هەرچەندە ئیبن نەدیم پێى وایە كتێبەكانى ( الادب الصغیر ، الیتیمیة في الرسائل ) بەرهەمى خۆى بن[٣] .

---

تەواوى كەموكوڕیـەكانى ولآت بخاتـە ڕوو ، وە بـارودۆخى ولآت وا پیـشان بـدات كـە پێویـستى بـە جەنتڵمانێكە تاوەكو بارودۆخەكە هێمن بكاتەوە .

٣. شۆرشى عەقلآنى :

ئیبن موقەفەع لە نێو دوو دەوڵەتى جیاوازدا ژیاوە ئەویش ( ئومـەوى و عەباسـیە ) . هـەروەها بـە دوو كلتور و شارستانیەتى زۆر جیاواز لە یەكتریش گەورە بووە ئەوانیش ( شارستانیەت و كلتـورى فارسى كـۆن ، كلتـور و شارسـتانیەتى ئیـسلامى ) یـە ، بۆیـە نـەیتوانیوە خـۆى لـەم دوو كلتـورە جیاوازە رزگار بكات و بە دوو ڕوى ماوەتـەوە ، واتـە لـە ناخـدا كلتـور و ئـاینى زەردەشـتى كـۆنى هەڵگرتووە و لە رواڵەتیشدا ئیدیعاى بیرێكى ترى وەكو كلتور و شارسـتانیەتى ئیـسلامى كـردووە . بۆیە ئەتوانم بڵێم ئیبن موقەفەع یەكێك بووە لەو كەسانەى لە ناخەوە باوەڕى بە ئیسلام نـەهێناوە ، چونكە بە بناغە دانەرى فیكرەى ( تەقیە ) دادەنرێت كە پاشتر لە مێژوودا چەندین جـۆرى لـەوە دەركەوتن لە نمونەى ( ئیسماعیلیەكان و بەكتاشى و مەولەوییەكان و نەصیریەكان ، ئیخوان صـفا ،.....). بروانە / حنا الفاخوری: الجامع تأریخ الادب العربی(الادب القدیم ) ، ج١، ص٥٣٤–٥٣٥.

[1] كلیله و دمنه : ابن المقفع ، و: عومەر تۆفیق ، ل ٣ .

[2] د. احمد فرید رفاعي : عصر المأمون ، المجلد الاول / ص٣٨٧ .

[3] فهرست ، ص ١٦٦_ ١٦٧ .

ئەبو يوحنا بەطريق (مردوە لە ١٨٤ك / ٨٠٠م )[1] ئەویش ژمارەیەك لە کتێبەکانی ( ئبقراط و ئەرستۆ )ی وەرگێرایە سەر زمانی عەرەبی بەلاّم باس لە کتێبەکانی نەکراوە ..

سهل ربن طبري ، لە طبرستان لە دایك بوە و لە سالأنی ( ١٥٤ك یا ١٦٤ك / ٧٧٠م یا ٧٨٠م ) مردوە ، باپیرەی نەصرانی بووە بۆیە نازناوی ( ڕەبەنی تەبەری ) لێنراوە . ئیبن ئەبی ئەصیبعە لە بارەی وەرگێڕانەکانیەوە دەڵێ : ( سهل کاری وەرگێرانی کردوە ، تەنانەت بۆ یەکەم جار کتێبی مجسطی[**] بەطلیموسی وەرگێرراوە )[2] .

محمد السید نعیم[3] هۆکارەکانی وەرگێران لە دەورەی مەنسوردا بۆ ئەم چەند خاڵە دەگەڕێنێتەوە :

١. بونی ئەو موناقەشە و جیدالانەی لە نێوان هەندێ لە موسڵمانەکاندا ڕوی ئەدا و زۆرجاریش لەگەڵ هاوەلأنی دینەکانی تردا ، لەم نێوانەشدا موسڵمانەکان مەنتیقی ئەرستۆیان وەکو چەکێك بەکاردەهێنا لە دراسەکردنی دیانەتەکاندا .

٢. هاتنە ناوەوەی بیروباوەری فارسی بۆ نێو کۆمەڵی ئیسلامیان و تەئکیدکردنەوەی ئەوانیش لەسەر مەنتیقی یۆنانی .

---

[1] د. کمال السامرائي : مختصر تأریخ الطب العربي ج١ / ص٢٤٤ . .

[**] وشەیەکی یۆنانیە بەواتای ڕێکخەر ، ئەصڵەکەی لە وشەی ماجستۆسەوە هاتوە ، دانەرەکەی لە ١٣ مەقالەدا نوسیویەتی و لە ئەصڵدا بەرهەمی بەطلیموسە . بڕوانە / عبدالله سندە : ال شاکر ، ص١١ .

[2] ابن ابي اصيبعة : عيون الانباء ، ج٢ / ص ٤١٤ .

[3] في الفلسفة الاسلامية ،ص١٢٩.

٣. لاوازی ئیمان و کەمکردنەوە و دابەزینی پلەی کتێبی خوا و سوننەتی پێغەمبەر .

٤. حەزکردنی هەندێ لە زانایان و وەزیرەکان لە زانستە فەلسەفی و مەنتیقیەکان .

بەلاَم ئەمە لە راستیدا هەڵەیەکی گەورەیە کە وەرگێرانی کتێبە بیانیەکان بکەینە هۆکاری کەمبونەوەی ئیمان و دابەزینی پلەی کتێبی خوا و سوننەتی پێغەمبەر ، چونکە لە بەرامبەر وەرگێران و وەرگێرەکاندا چەندین فەقیە و ئیمام دروستبون کە وێنەیان نەبۆتەوە بەڵکو دەبێت بوترێت ئەم دەورەیە دەورەی ناسین و شارەزابونی موسڵمانەکانە بە فەلسەفە و دین و ئایدۆلۆژیا جیاوازەکانی ئەو ناوچانەی وا لە سایەیدا بون ، بەگشتی بیرکردنەوەی لە بارودۆخی وەرگێران بیرکردنەوەیەکی تەسکبینانەیە بۆ شارستانیەتی ئیسلامی ، چونکە هیچ کات تێگەیشتن لە دەوروبەر و ئاشنابون بە بیرو بۆچون و شێوازی بیرکردنەوەی نابێتە هۆی دواکەوتویی و کەوتنی دەوڵەت ، بەڵکو بە پێچەوانەوە... .

# باسی یەکەم

# زانست لەدەورەی ڕەشیددا

## جاحظ دەڵێ: ( ڕەشید* ) کۆمەڵێ شتی بۆ کۆبوو کە بۆ هیچ

---

* نـاوی هـارون کـوڕی محمـد مەهـدی کوڕیمەنـصور ، ڕای جیاهەیـە لەسـەر لـەدایك بونەکـەی (١٤٨ك/٧٦٥م یا ١٤٦ك/٧٦٣م یا ١٥٠ك/٧٦٧م)، پێنجەم خەلیفەی دەوڵەتی عەباسیە، لەدایك بوە لە( ڕەی) ، بەیعەتی خیلافەتی پێدرا لـە دوای براکـەی هـادی لـە سـاڵی (١٧٠ك/٧٨٦م). بـەهێز و بەتوانا بوو نازناوی (جبار بەنی عباس)یان لێناوە. کەسایەتی هارون لەمەدا بەدەر دەکەوێت: ئەبو یوسف قازی بوە، محمدی کوڕی حەسەنی شیبانی قـازی قـضاة بـوە، عەبـدوڵلای کـوڕی موبـارەك (زانای ڕۆژهەلأت و ڕۆژئاوا)، فضیل کـوری عیـاض(زاهیـدی ئامۆژگاریکـەر)، ئیمـام مالـك (ئیمـامی دارالهجرە) ئامۆژگاریکەری بون.... . بڕوانە/ ابن کثیر: البدایة والنهایة، ج١٠، ص١٠٩–١١٠. أحمـد فرید: عصرالمأمون، ج٢، ص١٨٨. فخري الزبیدي: هارون الرشید، ص٥٥،٥٤. د. شوقي ابو خلیل: اطلس التأریخ العربي الاسلامي، ص٤٨. www.yabeyrouth.com

جمیـل نخلـە بـەراوردێك دەکـات لـەنێوان ( ڕەشـید و مەنـصور) دا و دەڵـێ : ( ڕەشـید کەسـێکی ڕوخۆش و بەخشندە بوو ، بەلأم مەنصور کەسێکی توند و تـورە و وشـك بـوو . ڕەشـید کەسـێکی گەنج بوو کە وەفاتی کرد تەمەنی ٤٥ ساڵ بـوو ، بـەلأم مەنـصور کـاتێ بـووە خەلیفـە لـە سـەروو ٤٠ساڵەوە بووە. ڕەشید دەیویست لە کارەکاندا خۆشەویستی ئیسلامی ببەخشێ ، بـەلأم جەعفـەر لەسەر گومـانبردنی خراپـی لەسـەر کـارکردن خـەڵکی سـزا دەدا . ڕەشـید هەمیـشە لەنێوخەڵکیـدا سەرگەرمی ئیحسان و چاکە بوو وە فەرمانی بە عەدل و دادپـەروەری دەکـرد ، بـەلأم مەنـصور لـە نێوان زوڵم و بەخشندەیدا بوو . ڕەشید هەمیشە پرس و ڕاوێژی بـە ئیمـام و وەزیرەکـانی دەکـرد، بەلأم مەنصور زوو گومانی لە قسەکان دەکرد و قسەی خـۆی لەسـەروی هـەموو شـتێکەوە بـوو ). بڕوانە / جمیل نخلة المدور : تأریخ العراق في عصر العباسیین المسمی حضارة الاسلام في دارالسلام، ص ١٠٤–١٠٥.

خەلیفەیەك نەبوو، وەزیرەکانی (برامکە) بون لەوانە( یـەحیا کـوڕی خالـد بەرمـەکی[**] ) و کوڕەکـانی (فـەضـل) و (جەعفـەر[***] )کـە وێنـەیان نەبولـە بەخشندەی و باشیدا، حاکمی (ئەبو یوسـف[****] ) بـوو، خـاوەنی فـەتوا و فەقیهی سەردەمەکەی خۆی بوو، خاوەنی کتێبی خەراجیش بوو، هـاورێی دانیشتنەکانیشی (ئەصمەعی و کەسائی) بون کە کەسانی بەتوانا بـون لـە زمانەوانیدا، پـەردەداریشی(فەضلَی کوڕی ڕەبیع[***] ) بوو ، کـە چـاکەکار و بەخشندە بوو لەگەڵ خەڵکیدا، پزیشکیشی (جبریل کوڕی بختیشوع) بوو، ژنیشی ( زوبێدە[******] ) بوو[٤٠].

---

[**] یەحیا کوڕی خالد بەرمەك، لە ساڵی(١٢٠ك/٧٨٩م)لە دایك بوە، ئەصڵی فارسیە، کەسێکی باش بووە لە وتە و نوسین و پاراستنیدا. المسعودی: مروج الذهب ،ج٢ ، ص٢٨٨.

[***] ابو الفضل جەعفەر کوڕی یەحیا کوڕی خالد بەرمەك کوڕی جاماس کوڕی یشتاسف بەرمەکی ، (١٥٠–١٨٧ك/ ٧٦٧–٨٠٣م)، ئەبو فەضل: وەزیری هارون ڕەشید بوە، لە دایك بون و گەورەبونی لە بەغداد بووە و ڕەچەڵەکیان دەگەڕێتەوە سەر فارس. الزرکلی: الاعلام، المجلد الثـاني ، ص١٣٠. کەسێکی زۆر بەرێز و خۆشەویستبووە ، هـەروەها بـۆ هـیچ شـوێنێك دەنەچـوو کـە لەگـەڵ فیقهـدا نەگونجێ ، قازی ئەبو یوسف لە بارەیەوە دەڵێ : ( زانستی زۆری لە بارەی فیقهـەوە بـوو ) . ابـن القادسی لە کتێبی (أخبار الوزراء) دا نوسیویەتی : ( هیچ کـات خـەڵکی لەسـەر گومـان نـەداوە بـە گرت و هەمیشە ئیعتزاری لەسەر کردارەکانی ئەهێنایەوە و داوای لێبوردنی لەبەرامبەرەکەی دەکرد . بروانە / وفیات الاعیان ،٣٢٩/١.

[****] نـاوی یـەعقوب کـوڕی ئیـبراهیم کـوڕی حـەبیب کـوڕی سـەعدە . قوتـابی ئەبوحەنیفەیـە و فەرمودەی زۆری لەبەربووە، بۆتە قازی لەبەغداد، لە ساڵی ١٨٢ك/٧٧٦م، وەفاتی کردوە لە ساڵی ١٩٢ك/٨٠٨م. ابن الندیم: الفهرست، ٢٨٣.

[***] فضل کوڕی ڕەبیع کوڕی یونس، ناسراوەبەئەبو عەباس، لەدوای ڕەشید بووە وەزیری ئەمین و پشتگیری لێکرد، پاشان کە مەئمون بووە خەلیفە لێی خۆشبوو، مرد لە طوس. بڕوانە/ ابن خلکان: وفیات الاعیان، ج١/ص٤١٢، ابن کثیر: البدایة والنهایة، ج١٠/ص٢٦٣.

[******] زبیدە کچی جەعفەری کوڕی مەنصور، مردوە لە (٢١٦ك/٨٣٠م)، لە ساڵی(١٦٥ك/٧٨٢م)، شـوی کـرد بـە ڕەشـید، منداڵێکیـان بـو بـە نـاوی (محمـد ئـەمین). ابـن کـثیر: البدایـة والنهایـة، ج١٠/ص٢١٩. زوبیدە هەوڵێکی زۆری داوە بۆ کۆبونەوەی زانا و ئەدیب و شاعیرانی ئـەو سـەردەمە

## أ. زانستە نەقڵیەکان :

### ١. خوێندنەوە:

ئەوانەی لەسەر ئەم زانستە کاریان کردووە لەم سەردەمەدا زیاتر کەسانی پەیرەو کەر بون نەك دارێژەر ، لەوانە[1] : ( شعبە مردوە لە ١٩٣ك / ٨١٣م ) ، کە پێرەوی عاصمی کوفی بوو . لەگەڵ وورش ( مردووە لە ١٩٧ك / ٨١٣ )کە پێرەوی نافع کوڕی نەعیم بوو ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ( کەسائی[*] )مان هەیە کە بە کەسێکی بەتوانا دادەنرێت لە بواری زمانەوانیدا و بە یەکێ لە ( قراءات السبعة ) دادەنرێت، لە گرنگترین دانراوەکانیشی لەم بوارەدا : ( معانی القران ، القراءات ، النوادر الكبير ، النوادر الاوسط ، النوادر الاصغر ، .....). لە پەیڕەوەکانی :

١. ئەبو ئەلحارث: ٢٤٢ك وەفاتی کردووە .

٢. ئەلدوری: ٢٤٦ك وەفاتی کردووە .

لەبواری تەفسیر کردنی قورئانیشدا چەن کەسایەتیەك دەرکەوتن، لەوانە:

---

لە بەغداد، سامانێکی زۆری خەرجکردوە بۆ ئامادەکردنی کەرەستە بۆ بەرهەم و لێکۆڵینەوەکانیان و.هەروها کۆکردنەوەی ئەندازیاران بۆ چاکردنی ڕێگەی نێوان بەغداد و کوفە، کوفە و مەکە، کە تاوەکوئێستاش ناسراوە بە ڕێگای زوبێدە. بڕوانە/ www.shindagah.com . [٤٠] جاحظ : البيان والتبين ، ج١ / ص٩٥ .

[1] محمد علي الصابوني : التبيـان في علـوم القـران ، ض٢٣٠-٢٣١ . خـضری بـك : تـأريخ التـشريع الاسلامی ، ص١١٤-١١٥ .

[*] ناوی عەلی کوڕی حەمزەە کوڕی عەبدوڵڵای ئەسەدییە. ئیمامی کوفە بووە ، کونیەی ابا الحسن ، ساڵی (١١٩ك)لەدایك بووە و لە ساڵی (١٨٩ك / ٨٠٥م ) مردوە لە برنبویە گوندێکە نزیکی رەی. ڕەشید بانگی کرد بۆ بەغداد تاوەکو ببێتە پەروەدەکەری مناڵەکانی ( ئەمین و مەئمون ). بڕوانە/ ابن النديم : الفهرست ، ص٩٩.

أ. وكيع كوڕی جەراح (مردووە لە ١٩٧ك).

ب. سوفيان كوڕی عينيه (مردووە لە ١٩٨ك)[1].

٢. **فيقه:**

كۆمـەڵێكی بـەتوانا لـە زانايـان دەركـەوتن كـە دەور و كاريگەريـەكی گەورەيان بو لەسەر دانيشتوان لەوانەش :

عەبدوڵلای كوڕی موبارەك

لە شاری مەروە لە دايك بووە و پاشـان چـۆتە بەغـداد و لـەوێ بۆتـە قوتابی و شاگردی ئيمام ئەبوحەنيفـە ، زانايـان ناويـان نـابوو شاهەنـشای زانايان و هەريەكە لە سوفيانی سەوری و شێخ فوزەيلی كوڕی عياز ناويان دەبرد بە (پياوی يەكەمی رۆژهەلات).

عەبدوڵلای كوڕی موبارەك** لەگەڵ ئـەوەی كـە بـە كەسـێكی زاهيـد و لـە خـواترس دەناسـرێت ، بـەلام لـە بـواری زانـستە شەريعيەكانيـشدا جـێ دەستی ديارە، لە بەرهەمە ناوازەكانيشی لەم بوارەدا بريتيـە لـە ( الـسنن فی الفقه[2]، التفسير ، التأريخ ، الزهد، البر والصله،...) .

ئەبی يوسف

---

[1] د. عبدالمجيد محمود مطلوب : مباحث في علوم القران والحديث ، ص١٨٧

** لەدايك بوە لە (١١٨ك / ٧٣٦م )، لـە شـاری مـروە لـەدايك بـوە و چـۆتە بەغـداد و لـەوێ بۆتـە قوتابی ئەبو حەنيفە ، لـە مـانگی ڕەمـەزانی سـاڵی ( ١٨١ك / ٧٩٧م ) لـە تەمـەنی ٨١ سـاڵيدا لـە شاری هيتی عێراق وەفاتی كردوە . بڕوانە/ ابن الجوزی : صفه الصفوه، ص٨٥–٩٢.

[2] ابن النديم : الفهرست ،ص٣١٣ .

بەهەمان شێوە کەسێکی بە توانا و شارەزا بووە لەم زانستەدا و چەندین دانراوی هەیە : ( الزكاة ، الصيام ، الفرائض ، البيع ، الوكالة ،....) . ئەمە جگە لەوەی رسالەیەکی نوسیوە بەناوی ( الخراج ) کە بە یەکێ لە بەرهەمە ناودارەکانی دادەنرێت و پێشکەشی ڕەشیدی کردووە[1] .

## ئیمامی شافیعی***

ئیمام کاتێ منداڵ بوو باوکی وەفاتی کرد ، بۆیە دایکی ئیمامی هەڵگرتوو بەرەو مەککە شوێنگەی باووباپیرانی بۆ ناو هۆزی (هوزەیل) بەرێ کەوت ، لەوێ بۆ ماوەی ١٧ساڵ مانەوە. لەو ماوەیەدا خرایە بەر خوێندن لەلای موفتی شەریفی مەککە ( موسلیمی کوڕی خالیدی زەنجی) تاوەکو شارەزا ببێت لە زانستە شەرعیەکاندا ، ئەوەبوو لە تەمەنی (٧)ساڵیدا هەموو قورئانی لەبەر کردو پاشانیش لە تەمەنی (١٠یا ١٣) ساڵیدا (الموطأ)ی ئیمام مالیکی لەبەرکرد، پاشانیش مامۆستاکەی ناردی بۆ مەدینە تاوەکو بچێتە خزمەتی ئیمام مالیك ، لەوێش بۆ ماوەی (٩) ساڵ مایەوە تاکو ئەو کاتەی ئیمام مالیك وەفاتی کرد(١٧٩ك)،کە ئەو

---

[1] هـ . س ، ص ٢٨٣ .

*** ناوی موحەممەدی کوڕی ئیدریسی کوڕی عەبباسی کوڕی عوسمانی کوڕی شافیع کوڕی سائبی کوڕی عوبەیدەی کوڕی عەبدیەزیدی کوڕی هاشمی کوڕی عەبدولموتەلیبی کوڕی عەبدولمەنافی کوڕی قوصەی قورەیشی مەککیە . دایکیشی ناوی فاتیمەی کچی عەبدوڵلای کوڕی حەسەنی کوڕی حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیبە . کونیەشی (أم هبیه الازدیه).

ئیمام لە ڕەجەبی ساڵی (١٥٠ك/٧٦٧ز) لە شاری غەززەی فەلەستین لە دایك بووە، لە جومعەی ٢٩ی ڕەجەبی ٢٠٤ك/٨٢٠ز لە دوای نوێژی عیشا لە فستاتی میسر وەفاتی کرد. لە قەرافە ناشتیان لە دوای نوێژی عەسری ڕۆژی هەینی لە تەمەنی (٥٤)ساڵیدا. الذهبي :سيرأعلام النبلاء،ج١٠/ص٢٩. ابن الجوزي: مختصرالصفة الصفوة ، ص٢٥٤-٢٥٥. حاجي خليفة : كشف الظنون،ج١/ص١.

کاتە ئیمام تەمەنی (٢٩) ساڵ بوو. ئیمام لە ماوەی ژیانیدا زیاتر لە فەرمودەدا سودی لە دوو کەس بینیوە ، ئەوانیش:

١. سوفیانی کوڕی عیینیە، لە مەککە.

٢. مالیکی کوڕی ئەنەس ، لە مەدینە.

لە پاش ئەوە ئیمام ڕوی کردە یەمەن و لەوێش لەلای دوو کەسی شەرعزان مایەوە :

١. لیسی کوڕی سەعد ، شەرعزانی میسر.

٢. ئیمامی ئەوزاعی ، شەرعزانی شام.

پاشان ئیمام چووە بەغداد لەسەر بانگێشتی خەلیفەی موسڵمانان (هارون ڕەشید) ، ئەمەش دەروازەیەکی دی گەورە بوو بۆ ئەوەی شارەزایی زانستی ئیمامەکەی عێراق (ئەبوحەنیفە نوعمان) بێت کە ئەو کاتە وەفاتی کردبوو ، بەڵام قوتابیەکانی :

١. موحەممەدی کوڕی حەسەنی شەیبانی.

٢. ئەبو یوسف.

( کە بەدارێژەرانی مەزهەبەکەی بۆ سەر لاپەرە دادەنرێن)تا ئەوکاتەش درێژەیان بە مەزهەبەکەی ئیمام دەدا، بۆیە ئیمام بۆ ماوەی ٢ساڵ لە خزمەتیان مایەوە تاوەکو شارەزایی تەواوی مەزهەبەکە بوو، دەگوترێ لەو ماوەیەشدا سەردانی ناوچە کوردییەکانی کردووە و ئاشنابووە بە چەند مامۆستایەکی ناوداری ئەو کاتی کوردەواری ، بۆیە تاوەکو ئێستاش زۆرێك لە خەڵکی کورد لەسەر مەزهەبی شافعین.[1]

---

[1] الذهبي: سيرأعلام النبلاء، ج١٠/ ص٥. الخضري بك: تأريخ التشريع الاسلامي، ص١٨٤. ابن الكثير :البداية والنهاية، ج٥/ ص٦٩١.

پاشان ئیتر ئیمام دەستی کرد بە دەرس وتنەوە لە مەککە و مەدینە و عێراق،...... لە گرنگترین قوتابیەکانیشی:

١. ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل.

٢. ئەبو عوبەید : زانایەکی گەورەی زمانی عەرەبیە.

٣. ئیمامی ئەصمەعی: زانایەکی گەورەیی زمانی عەرەبیە.

٤. ئیمامی ئەبوحاتەمی سیجەستانی : فەرمودەناس.

٥. ئیبن هیشام : خاوەنی السیره النبویه.

٦. عەبدولرەحمانی کوڕی مەهدی: فەرمودەناس.

عەبدولرەحمانی دوجەیلی دەڵێ: ( ئیمامی شافیعی زیاتر لە ١٥٠ کتێبی نوسیوە ). لەوانە:

( الأم ، الرسالة ، اختلاف الحديث ، كتاب الجزية ، عيون المسائل ، الجامع الكبير ، المسند، السنن ، الفقه الأكبر ، أحكام القران ، اختلاف العراقيين ، التمهيد في اصول التوحيد ، تعظيم قدر الصلاة ، منافع القران )[1].

مەنهەجی ئیمامی شافیعی لە مەزهەبەکەیدا

ڕێساو بنەماکانی مەزهەبەکەی ئەوەیە کە لە نامە ئوصوڵیەکەی ( الرساله) دا کۆی کردۆتەوە و فەرمویەتی : ( قورئان و سوننەت ئەسڵن ، ئەگەر تێیاندا نەبوو قیاسیان لەسەر دەکرێ ، ئەگەر فەرمودە گەیشتەوە پێغەمبەر سەنەدەکەیشی تەواو بوو ئەوا کۆتای پێدێت . ئیجماعیش لە پێشترە لە هەواڵی تاك ، فەرمودەش بە ڕواڵەتەکەیەتی ، ئەگەر چەند مانایەکی هەڵگرت ئەوەی لە ڕواڵەتەکەی نزیکتر بێت ئەو لە پێشترە،

[1] الذهبي : سيرأعلام النبلاء ، ١٠/٥. حسام كوزم : الاما الشافعي ، مجلة الرعد .

ئەگەر سەنەد پـچرانی تێـدا بـوو وەرنـاگیرێ بێجگـە لـە سـەنەدی ( کـوڕی موسەیب).

ئەسڵ لەسەر ئەسڵ قیاس نـاکرێ ، بـۆ ئەسـڵ نـاگوترێ بۆچـی و چـۆن ؟ بەلأم بۆ فەرع دەگوترێ بۆچی؟ئەگەر قیاسی فـەرع لەسـەر ئەسـڵ راسـت بوو ، راستە و دەبێتە بەڵگە .

کەواتــە ، ئیمــام شــافیعی رای وایــە قورئــان و ســوننەت لــە شــەریعەتدا یەکسانن ، هیچ مەرجێك بۆ فەرمودە دانانێ تەنیا ڕاسـتی و گەیـشتنەوەی بە پێغەمبەر نەبێ ، چـونکە ئەسـڵە ، ئەسـڵیش پێـی نـاگوترێ : بۆچـی و چۆن؟ مەشهوربونی فـەرمودە [*1] بەمـەرج دانـانێ ئەگـەر بـۆ شـتێ هـاتبێ سەخڵەتی گشتی بێ ، وەك ئیمام ئەبوحەنیفە بە مەرجی داناوە ، مـەرجی موخالەفەنەکردنی فـەرمودەی بـۆ کـردەوەی خـەڵکی مەدینـە دانـەناوە – وەك ئیمام مالیك دایناوە – بـەلأم فـەرمودە مورسـلەکانی وەرنـەگرتووە . تەنیا ( مراسـیل) [**] ی سـەعیدی کـوڕی موسـەیب نـەبێ .چـونکە لای ئـەو ڕێگـەی گەشـتنەوەی بـە پێغەمبـەر هـەبووە ، لەمەشـدا خیلافـی مالیـك و سەوری و هاودەمی خۆی بووە لە فەرمودەناسان چونکە ئـەوان ( مراسـیل

---

[*1] الحدیث المشهور: بە ڕێگەی زیاتر لە دوو کەسەوە هاتووە یان لـە هـەر چینێك سـێ کـەس یـان زیاتر ڕیوایـەتیان کـردووە و نەگەیـشتۆتە ئاسـتی تـەواتور ، لەبـەر مەشـهوری و ئاشـکراو ڕونـی وا ناونراوە . د. طه جابر العلوانی : ئەدەبی ئیختلاف لە ئیسلامدا ،و: د. سـەلاح عـەزیز ، ئەنـدازیار : سەرکەوت ئیبراهیم ، ل٩٦.

[**] الحدیث المرسل : ئەو فەمودەیە دوایین سەنەدی لە پاش تابعی نامێنێ ، وەك ئەوەی تابعی بڵێ ، پێغەمبەر فەرمویە :.... بێ ئەوەی ناوی ئەو کەسە بهێنێ کە لە پێغەمبەر ریوایەتی کردووە .

) یـان بەبەڵگـە دادەنـا .نكـوڵی بەڵگەسـازی بـە (الاستحـسان ) دەكـا ، لەوەشدا موخـالیفی حەنـەفی و مالیكیـە . لـە رەدی (استحـسان ) كتێبـی (ابطال الاستحسان) نوسیوە، لە گوتە بەناوبانگەكەیدا دەڵێ :( ئەوەی بـە استحـسان بكـا ئـەوە شـەرعی داهێنـاوە ). هـەروەها رەددی (المـصالح المرسـلە)ی داوەتـەوە و نكـوڵی بەبەڵگـە دانرانـی كـردەوەی خـەڵكی مەدینەشـی كـردوە ، هـەروەك نكـوڵی حەنەفیەتیـشی كـردووە لەسـەر وازهێنان لەكاركردن بۆ سوننەت، هەروەها وەك (مالیكیەكان)یش نـەبووە هەرتەنیا فەرمودەی حیجازیەكان وەربگرێت [1].

## ب. گروپە فیكریەكان:

### ١. شیعە:

لـە دەورەی ڕەشـیدا بـە هـەمان شـێوەی سـەردەمی مەنـصور ، شیعەكان هەوڵی بلاْوكردنەوەی فیكرەی خۆیان داوەلەنێو خەڵكیدا. ئیمـام موسـای [*] جەعفـەر صـادق دەورێكـی باشـی گێـڕا لـە بـواری زانـستە شـەرعیەكاندا و بـووە جێگـرەوەی بـاوكی لـە فـەتوا و دەرس وتنـەوە و تێگەیاندن و پێگەیاندنی خەڵكیدا، لە بەرامبەر ئەمەشدا بەشداری كرد لـە شەری (فخ) كە شۆرشێكی عەلەویەكان بـوو لـە سـاڵی (١٦٩ك / ٧٨٥م )،

---

[1] د. طه جابر العلوانی : ئەدەبی ئیختلاف لە ئیسلامدا ،و: د. سەلاح عەزیز ، ئەندازیار : سەركەوت ئیبراهیم ، ل٩٦–٩٧.

[*] ئیمام موسا ، دایكی جاریە بوە بـەناوی (حمدیـە )، لـە ٧ی صـەفەری ١٢٧ك / ٧٤٥م، لـە دایك بوە، نازناوی (كازم)ە كونیەی (ابا الحسن )ە ، پاش زیدانی ژەهرخواردو دەكرێت لە ساڵی ١٨٣ك / ٧٩٩م. بڕوانە/ مؤسسة معارف الاسلامیة: معارف الاسلامیة ، ص٣٢٠. مؤسسة البلاغ : نفحات من السیره ص١٨٧.

پاشتر و لەسەردەمی ڕشید بەرامکەکان هانی ڕەشیدیان دەدا کە ئیمام بۆتە سەرۆکی شۆرشێکی نویێ لە دژت ، بۆیە ڕەشیدیش فەرمانی گرتنی دا و پاشان ئازادی کرد [٤٥]* ، بەلاَم لە ڕاستیدا ئەمە لە قسەیەکی دروستکراو دەچێت ، چونکە بەپێی زۆربەی سەرچاوەکان (بەرامکەکان) شیعە و لایەنگری ئیمام بون.

٢. سۆفیگەری:

ئیبن خەلدون دەڵێ : ( تەصەوف بەندایەتیکردن و پەیوەست بونە بە خواوە و پشت کردنە لە جوانیەکانی دنیا ، ئەمەش بەگشتی لەنێو هاوەڵاندا هەبوە ، بەلاَم کاتێ لە سەدەی دووەمی کۆچی خەڵکی بەرەو دنیاگەری ڕۆیشتن ، کۆمەڵێ پەیوەست بون بە خواپەرستیەوە و ناویان لێنان صۆفی[٤٦]). هەرچەندە هۆکاری سەرەکی زۆرێك لە مێژونوسان بۆ کاریگەری بزوتنەوەی زانستی بە تایبەتی زانستی کیمیا ، کە مەڵبەندی سەرەکیان شارەکانی کوفە و بەصرە بوو دەگێڕنەوە .

یەکێ لەوانەش (شێخ مەعروفی کەرخی )بوو، کە دەیگوت : ( مرۆڤ نابێ بە وەلی دۆستی خودا تا بە ئەرکی سەرشانی هەڵنەستێ و ئەرکەکانی جێبەجێ نەکات بەرامبەر ئوممەتی ئیسلامی ، دەبێ موصلێح و چاکساز بێت و لابەری غەم و پەژارەبێت ، دڵسۆز و بە سۆزی تاك تاکی

---

[٤٥] الذهبي : سير أعلام النبلاء ، ج٦ / ص ٢٣٠ .

* لەڕاستیدا ماوەی زیندانیکردنەکەی نەزانراوە ، بەلاَم دەوترێت لە پاش گیرانی بە تۆمەتی ( پیلانگێری دژی دەوڵەتی عەباسی ) خەلیفە لە خەوندا پێغەمبەر دەبینێ و پێی دەڵێت ئیمامتان بە هەڵەگرتووە و زوڵمتان لێکردووە ، بۆیە کاتێ بە خەبەردێت داوای لێبوردن لە ئیمام دەکات و بەرێزەوە بەرێی دەکات.

[٤٦] ابن خلدون : المقدمة ، ص١٦٠ .

خەڵکی بێت). (خوا ئەگەر بیەوێ بەندەیەکی توشی خەیر بکات ئەوا دەرگای کرداری لەسەر ئەکاتەوە و دەرگای موناقەشەی لێدائەخات ، خۆ ئەگەر ویستی توشی شەری بکات ئەوا دەرگای کرداری لەسەر دائەخا و دەرگای موناقەشەی لێدەکاتەوە)[٤٧] .

شەقیقی بەڵخیش[**] کە زانا و زاهیدێکی گەورە و گران بوە لە هۆشیارکرنەوەی خەڵکی و جگە لەوەش ڕیوایەتی فەرمودەشی کردووە[٤٨] .

### ٣. موعتەزیلە:

لە سەرەتای دەورەی ڕەشیدەوە ( ١٧٠ ـ ١٩٣ك/ ٧٨٦ ـ ٨٠٨م ) دوبارە دەسەلأتیان بەرز بۆوە ، لەوانە ( یەحیا کوڕی حەمزە حەزرەمی ) لە ساڵی ( ١٨٣ك / ٧٧٩م) ، کە یەکێ بوولە قەدەریەکان و بووە قازی لە دیمەشق . ڕەشید بۆ خۆیشی هەندێ لە موعتەزیلەکانی لە خۆی نزیک کردەوە ، لەوانە ( ثمامەی کوڕی ئەشرس ) لە بەغداد و یەحیا کوڕی ئیبن موبارەکیش لەڕێگای پەروەردەکردنی مناڵەکانی یەزید کوڕی مەنصورەوە پەیوەندی بە خولەفاکانی بەنی عەباسەوە کرد بەتایبەتی ڕەشید و دەستی کرد بە پەروەردەکردنی مناڵەکانی ( ئەمین و مەئمون ) . لە یاقوتەوە دەگێڕێتەوە : ( محمد کوڕی مناذر ١٩٨ك / ٨١٤م ) ، جنێوی بە موعتەزیلە داوە ، لەسەر ئەمە نەفیان کردووە لە بەصرەوە بۆ حیجاز و

---

[٤٧] جميل ابراهيم حبيب : تأريخ متصوفة بغداد ، ص ٥-٦ .

[**] شەقیقی بەڵخی کوڕی ئیبراهیم کوڕی عەلی ئەلئەزدی بەڵخیە ، لە لای عەبدولعەزیزی رواد فێری زانستە شەرعیەکان بووە ، لە ساڵی ١٩٤ك / ٧٩٩م ، لە غەزای کولان شەهید بووە . بڕوانە / الذهبي : سير أعلام النبلاء ، ص ٢٠٠- ٢٠٢ .

[٤٨] الذهبي : هـ . س ، ج٨ / ص٢٠٠ .

لەویٚ هیٚشتیانەوە تاوەکو وەفاتی کرد . ) ، ئەمەش بەلگەیە لەسەر بونی دەسەلأتی موعتەزیلە لەناو خیلافەتدا بەر لە هاتنە سەر کاری مەئمون[٤٩] .

## ج. زانستە عەقلّیەکان:

### ١. پزیشکی:

دەورەی ڕەشــید بەیەکــەم هــەنگاوی بەرەوپێشــچونی زانــستی پزیشکی دادەنرێت لە دەورەی عەباسیدا، فلیب حتـی لـەم بـارەوە دەلـیٚ: (یەکەم نەخۆشخانە لە ئیـسلامدا دروسـت کرابێـت لـە سـەردەمی ڕەشـیدا بـوو)[٥٠] ، لەگـەلٚ ئەمەشـدا لـە بیمارسـتانەکاندا قوتابخانــەی فێرکـردن و دەرچـون هـەبو، ئەمـەش سـەرجەم گەشـت کـەران سەرسـام کردبـوو لـەو گەشەســەندنەی لــە بــواری پزیــشکیدا هــەبوو، بــەهۆی گــەورەیی بیمارسـتانەکان و پـاك و خاوێنیـان، ئەمـە جگـە لـەوەش جێگـای هـەموو چینەکانی کۆمەلٚ بو لە دەولّەمەند و هەژار،... لە گـشت بیمارسـتانەکاندا پزیـشك هـەبوو ، دەبـوو ڕۆژانـە سـەردانی نەخۆشـەکان بکـات، بەهـەمان شێوە پەرستارەکانیش[٥١] .

یەکەم بیمارستان بۆ نەخۆشیە عەقلّیەکان لە دەورەی ڕشـیدا بـوو ( کە پاش ٧٠٠ سالٚ دواتر لە ڕۆژئاوادا دانرا ) ، پاشتر لـە گـشت شـارەکاندا نەخۆشخانەی تایبـەتی کرایـەوە بـۆ نەخۆشـیە عەقلّیـەکان و نەخۆشـخانە گەورەکان قوتابخانەی گەورەی پزیشکی تێدا دانرا کە تیایدا قوتابی فێری

---

[٤٩] زهدی حسن جار الله : المعتزلة ، ص ٦١ ـ ٦٢ .

[٥٠] د. رشید الجمیلی: الترجمة في المشرق الاسلامي ، ص٣٥١.

[٥١] هـ . س ، ص٣٥١–٣٥٢.

ئـەو زانـستە دەكـرا و بەرهەمـەكانی ( بقـراط [*] ) و (جـالینوس [**] )ی تێـدا دەوترانەوە ، پاشتریش چەند دانە قوتـابی لەگـەڵ پزیـشكەكەدا دەچـونە شـوێنی چارەسـەركردنی نـەخۆش، تـاوەكو قوتـابی ئـەو شـتانەی وا بـە خوێندنــەوە فێریــان بــووە بــە كــرداریش بتــوانیٚ زاڵ بێــت بەســەریاندا. پزیشكەكان لەكاتی چارەسەركردنی ئەو نەخۆشانەی كە كێشەی عـەقڵیان هــەبوو ڕەچــاوی لایــەنی نەفــسی نەخۆشــەكەیان دەكــرد، بــۆ ئەمــەش پەرستاری ئافرەتیان دانابو تاوەكو لە ڕوی نەفسیەوە ئـارامی بكاتـەوە ، ئەمەش بۆ خۆی دەركەوتنی سەرەتای زانستی سایكۆلۆژیایە [٥٢] .

وەك مێژونوســان باســی لێــوە دەكــەن ، هــارون ڕەشــید یەكــەم نەخۆشخانەی كە دروستكرد لە شاری بەغداد بوو، بەناوی خۆشیەوە ناوی نا ، دواتـر فـەرمانی كـرد بـە (ماسـویە) كـە لـە پزیـشكانی نەخۆشـخانەی جندیــسابور بــوو لێپرســراوێتی بگرێتــە ئەســتۆ. پاشــتر بەرمەكیــەكان نەخۆشـخانەیەكی تریـان دروسـتكرد كـە ( ئـیبن دهـنی)یـان تێـدا كـردە لێپرسراو. نەخۆشخانە سەرجەم ناوچەكانی گرتەوە ، تەنانـەت دەڵـێن كـە هــیچ شــارێك بــەبیٚ خەســتەخانە نەماوەتــەوە [٥٣] . لــە ئــەنجامی ئــەم پەرەسـەندنەوە ژمارەیـەك لـە پزیـشكی هنـدی هاوپـشت لەگـەڵ پزیـشكە نەسـتوریەكان دەسـت بـەكاربون ، واتــە پزیـشكەكان زیـاتر پزیـشكی

[*] ناوی بقراط كوڕی ئیراقلیس، قوتابی ئسقلیوسی دوەمە ، پزیشك و فەیلەسوفی سەردەمی خـۆی بوە، لە دەوروبەری ساڵانی ( ٤٦٠– ٣٧٠) پ.ز ، ژیاوە. بڕوانە/ ابن الندیم: الفهرست، ص٣٨٩.

[**] جالینوس دەركەوت بـە چـەندین سـاڵ دوای بقـراط ، قوتـابی ئەرمنـسی ڕۆمـی بـو ، جـالینۆس دەستی كرد بە شیكردنەوەی زۆربەی بەرهەمەكانی بقراط . هـ . س ، ص ٣٩١.

[٥٢] د. رشید الجمیلی: الترجمه في المشرق الاسلامي ، ص ٣٥٣– ٣٥٤.

[٥٣] د. كاوە فەرەج سەعدون: ڕۆڵی پڕشنگداری زانـا موسـڵمانەكان لـە پێـشكەوتنە زانـستیەكاندا ، ص ٢٥٤.

عەجـەمی بـون تـا عـەرەبی[٥٤]. لـەو چارەسـەرانەی پزیـشکانی ناوچـەی جندیسابور بویان چەندمومارەسەیەکی پزیشکی بوو لەبوارەکانی ( خـوێن دەرهێنـــان، ڕشـــانەوە، هۆکـــار و چارەســـەری عارەقکردنـــەوە)، چارەسـەرەکانیش زیـاتر بەرهـەمی ( ڕوەکـی ، سەرچـاوە ئاژەڵیـەکان، کانزاکان )بون، لە بـواری نەشتەرکاریـشدا (دەرهێنـانی بـەردی میزڵـدان ، ئاوێنـەی چـاو، مامـانی، خەتەنـەکردن، سـوتاوی)بـوو[٥٥]. لـە پزیـشکە بەناوبانگەکانی ئەو سەردەمەش:

جبرائیلی کوڕی بختیـشوع کـە لـە بنەماڵـەی بختیـشوعیەکانە و بـە پزیـشکی هـارون بـە ناوبانگـە ، بـەهۆی ئـەو زیرەکـی و لێوەشـاویەی لـە کارەکەیدا هەیبوو ڕەشید پلەی (سەرۆکی پزیشکانی) پێدا.

هەروەها (ماسویە خوزی[*]) کە لە پزیشکانی ناوچەی جندیسابور بوو ، لەلایـەن جبرائیـل کـوڕی بختیـشوعەوە نەخۆشـیەکانی چـاو فێـر بـوو. جبرائیـل ئـەوەبوو چـووە بەغـداد بـۆ خزمـەتی (جەعفـەر بەرمـەکی[**] و ڕەشید) ، بەڵام ماسویە بۆ مـاوەی سـی سـاڵ لـەو بیمارسـتانەدا مایـەوەو پاشتر لەتەمەنی پەنجا ساڵیدا هاتە بەغداد و لەوێ وەفاتی کرد[٥٦] .

پزیـشکە هندیـەکانیش کـە ئـەوکات تاڕادەیـەك بڵاوبـون لـە شـاری بەغـداد، جـاحظ لەبارەیانـەوە دەڵـێ: (ژمارەیـەك لـە پزیـشکە هندیـەکان

---

[٥٤] د. كمال السامرائي : مختصر تأريخ الطب العربي ، ج١/ ٣٧١.

[٥٥] ابن ابي اصيبعة: عيون الانباء ، ج١٨٥/٢ و ١٩٤.

[*] ناوی جورجیسە، کونیەی ئەبو یوحنایە، لە خوزستان بوە، هەربۆیە نـاوی (خـوزی) لێنـراوە. د. كمال السامرائي : مختصر تأريخ الطب العربي ، ج٤٠٧/١ .

[**] نازناوی ئەبو فەضلە ، ژیاوە لـەنێوان سـاڵانی ( ١٥٠-١٨٧ك/٧٦٧-٨٠٣م). بڕوانـە/ خيرالـدين الزركلي: الاعلام ، ج١٣٠/٢.

[٥٦] د. كمال السامرائي : مختصر تأريخ الطب العربي ، ج٤٠٧/١.

هاتنە بەغداد، لەوانە بازیکر ، سندباز، قلبرقل ، بەلاّم باشترینیان صنجهل باری ، دهشنك، صالح کوڕی بهلە ، کنکە ، منکە بوون)[57] . منکەی هندی بە داوای بەرامکەکان هاتە بەغداد ، کە لەناوچەی فارسدا فێری فارسی بووە و کتێبی (سموم لشاناق) ی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی و پاشتریش بۆ عەرەبی ، لەگەڵ ئەمەشدا کاری ئەستێرەناسی لەگەڵ پزیشکیدا تێکەڵ کردبوو، بۆ نمونە شوێن و کاتی ئەستێرەکانی وەك چارەسەر دائەنا بۆ نەخۆشەکانی[58] .

صالّحی کوڕی بهلەش سەرکەوتنی بەدەست هێنا بەهۆی چارەسەرکردنی ئەمیر(ئیبراهیم کوڕی صالّح)ەوە بەمەش لەلایەن خەلیفەوە دەست خۆشی لێکرا، سەبارەت بەم کەسایەتیەش ڕای جیا هەیە ، هەندێك پێیان وایە لە جندیسابوری ئیسلامی لە دایك بوە و هەندێکی کە پێیان وایە لە بەغداد موسڵمان بوە[59] .

---

[57] جاحظ: البيان والتبين ، ج٩٣/١ .

[58] د. كمال السامرائي : مختصر تأريخ الطب ، ج٤٠٨/١.

[59] هـ.س .

**٢. کیمیا:**

گرنگــی دانێکــی پێویــست لــەم بــوارەدا و گەشەســەندنی لەســەر دەستی موسڵمانەکان ، بۆ سەرەتاکانی دەورەی ڕەشید دەگەڕێتـەوە، لـە بەناوبانگەکانی ئەم بوارەش جابری کوڕی حیانە[*] ، بەهۆی گرنگی دانیەوە بەم زانستە ناویاننابو ( باوکی کیمیا) . ئیبن خەلدون دەڵێـت: ( بـەردەوام خەڵك نوسیویانە لەسەر کیمیا بەڵام پێشەوای ئەمانە جابری کوڕی حەیانە [٦٠]) تەنانەت زانستەکەشیان پەیوەست کـردووە بـە ئـەوەوە، پێیـان وتـوە زانــستی ( جــابر) . دکتــور فلیــب حتــی دەڵــێ: (جــابری کــوڕی حــەیان بــەردەوام بــو لەســەر گرنگــی دان بــەم زانــستە وەك پێــشتر میــصری و یۆنانیــەکان پێــی هەســتابون )[٦١] لــە زانــستی کیمیــادا گەیــشتنە چــەند دۆزینەوەیەك : ( کەشفی فیلزەکانی کرد و خوێکان و ئاوێتە کیمیاویەکانی دۆزیـەوە، دەربـارەی هەنـدێ لـە ترشـەکان زانیـاری پەیـدا کـرد و هەنـدێ لەترشــەکانی بــەکارهێنا بــۆ ســپی کردنــەوەی فیلزەکــان ). لــەبواری تاقیکردنەوەشــدا ( شــیکردنەوە و تواندنــەوە و گــەرمکردن و بەســتن و

---

[*] مێژونوسان ڕای جیاوازیان لەسەر رەچەڵەکی هەیە ، هەنـدێك دەڵـێن کـە کوفیـە و هەنـدێکی دی پێیان وایە (حرانیە) لە وڵاتی دوڕوبار. سەبارەت بە ساڵی لەدایك بونیشی بە هەمان شێوە ڕای جیا هەیە ، هەندێك پێیان وایە لە (٧٧٦م) ژیابێت ، هەندێکی کـە پێیـان وایـە کـە پێشتر یـان پاشـتر ژیابێت. بەڵام جێگیرە لـەوەدا کەلـە سـەدەی هەشـتەمی زاینـدا ژیابێـت ، لـە سـەردەمی ڕەشـیدا. بڕوانە / د. احمد محمد عوف : صناع الحضارة العلمية فى الاسـلام، ج١/ ٢٩. هەنـدێك پێیـان وایـە زیاتر لە هەشت دانراوی هەیە ، لەوانە : ( المئة والاثنا عـشر ، الـسبعون ، المـصححات، المـوازين ، القمر الأكبر ، الشمس الأكبر، الشمس الاصغر ، المريخ ، الزهرة ، عطارد ). بڕوانە / د.کاوە فـەرەج سەعدون: ڕۆڵی پرشنگداری زانا موسڵمانەکان لە پێشکەوتنە زانستیەکاندا ، ل ١٨٣.

[٦٠] ابن خلدون : المقدمة ، ص ٥٠٤ .

[٦١] د. رشيد الجميلي: الترجمه في المشرق الاسلامي ، ص٤٠٩–٤١١.

دڵۆپاندن و به هەڵم بونی مادە کیمیاویەکانیان کرد [٦٢]). جابر له ئـەنجامی تاقیکردنەوە و وردبونەوەکانیدا ، دوو کتێبـی بـه نرخـی دانـا ، یەکـەمیان کتێبـی (الحـدود ) کـه کـۆکراوەی زاراوە زانـستیەکانە و لـه زمانـەکانی ( ڕومـی ، فارسـی ، ئەسـکەندەرانی )یـەوە وەری گرتـون و هەسـتاوە بـه وەرگێڕانیـان بـۆ سـەر زمـانی عـەرەبی و هـەوڵی داوە بـۆ ئاسـانکردنی زاراوەکان بیانگونجێنێت و پێناسەیان بۆ بدۆزێتەوە. کتێبێکی تریشی دانا بەناوی (الخواص الكبير ) که ئاماژە ئەدات وەك لێکۆڵـەرێك بـەو تەجروبـه زانستیانەی له بواری کیمیادا کردونی ، لەم کتێبەدا ئەمانەی دیاری کـرد : ( پێوانه ، کێشانه ، گەرد ، دەنکۆڵـه ، ...) ئـەم کتێبـەی لـه سـەردەمی ڕێنسانسدا وەرگێڕرا بۆ سەر زمانی ( لاتینی و ئینگلیزی ) [٦٣].

٣. میکانیك:

زانا موسڵمانەکان له بواری میکانیکدا چەند ئـەنجامێکیان بـه دەسـت هێنا ، لەوانەش:

دروستکردنی کاغەز [*]

---

[٦٢] ه . س ، ص ٤١١–٤١٣.

[٦٣] د. احمد محمد عوف : صناع الحضارة العلمية فى الاسلام، ج١/ ٣٠–٣٢ .

[*] مرۆڤ پێش کاغەز مادەیەکی دروستکردووە بۆ ئەوەی لەسەری بنوسێت ، میسریە کۆنەکان پێش چوار هەزارساڵ لقی داریان توێکڵ گرتۆتەوە و ڕێکیان خستووە و بە پێچەوانەوە لەسـەر یـەکیان داناوە و شتێکی قورسیان خستۆتە سەری بۆ ئەوەی یەك بگرێت و پاش ئەوەی وشك بۆتەوە بووە بە پارچە کاغەزێك و لەسەریان نوسیوە بەڵام کاغەز نـەبووە . کاغـەزی ڕاسـتەقینە پـێش نزیکـەی (١٠٥)ز لەسەر دەستی پیاوێکی چینی بەناوی (سای لۆن) دروستکرا کە توانی له توێکڵی ناوەوە و لفەکەی داری توو بدۆزێتەوە ، چینیەکان توێکڵی داریان لـە ئـاو دەنـا بـۆ ئـەوەی ڕیـشاڵەکانی لـە لیفکەی جیا بکەنەوە ، دوای ئەوە تێکەڵـە سـابونیەکەیان دەڕژانـدە سـینیەکەوە کـە بنەکـەی بـە

لـەڕێی ڕۆژهەلاَتـەوە دوای فـەتحی شـاری سـەمەرقەند لـە سـەدەی یەکەمی کۆچیدا ، فێـری دروسـتکردنی جـۆرە هـەویرێك بـون لـە کـەتان و ڕوەکـی ڕیـشالَدار ، کـە پاشـان وشـکیان دەکـردەوە و پارچـەی تـەنك و باریکیان لێدروست دەکرد . ئیتر لێرەوە پیشەسازی دروسـتکردنی کاغـەز لــە بـری پێـستەی ئـاژەلَ بـۆ نوسـین بـەکاردەهات و یەکـەم کارگـەی دروستکردنی کاغەزیش لە ولاَتـی ئیسلامیدا لـە سـالَی (٧٩٤م) لـە شـاری بەغداد لە سەردەستی ( فەضل کوڕی یەحیا) وەزیری ڕەشید دروسـتکرا و پاشتر گوازرایەوە بۆ ئیسپانیا و دورگەی صـقلیە و لەوێـشەوە گوازرایـەوە بۆ ناوچەکانی ئەوروپا[٦٤] .

## دروستکردنی ئامێری فێنککەرەوە

دەلێن لە یەکێ لە ڕۆژە گەرمەکانی هاوین ، ڕەشید چووە سەردانی خوشکەکەی ( علیەی کچی مەهدی) کە هەستابوو بە سەرداداني کەتان بـە پەنجەرەکەدا و لە هەر چوارلاوە بەستبویەوە و کەتانەکەشی تەڕ کردبـوو، هەوایـەکی فێنکـی دەهێنـا . لـە دوای ئـەم ڕوداوەوە ڕەشـیدفەرمانی بـە دروستکردنی ئامێری فێنککەرەوەدا و ئەوەبو توانیـان ( پانکـە ) دروسـت بکــەن تــاوەکو هــەوا دروســت ببێــت، ئەمــەش لــە ڕێگــای ئــاوەوە دەخولێنرایــەوە، پاشــتر ئــەم هەوایەشــی لــە ڕێگــای قەصــەب ( لولەکێـشێك)ەوە بـە بـەینی دو سـەقفی خانوەکـەدا دەبـرد بـۆ هــەمو

---

توێکلَی حەیزەرانی ناسك داپۆشراوە. دوای ئەوە ئاوەکەیان لێدەبڕی و ئینجا پارچـە قوماشـێکیان دەخستە سەر ڕووە نەرمەکەی بۆ ئەوەی ئاوەکەی بمژێت و وشك ببێتەوە .

[٦٤] ول دیورانت : قصة الحضارة ، ج٢ من االمجلد الرابع ، عصر الایمان ١٣ ، ت: محمـد بـدران ، ص ١٦٩-١٧٠.

ژورەکان، کۆتای هەر لولەکێشێکیش بە کەتانێکی بۆنخۆش بە ( گولاو و زەعفەران ) تەڕدەکرا کە هەوایەکی سازگاری هەبوو[٦٥] .

دروستکردنی سەعات

ئەمەش لە ڕێگای ئەو ڕوداوە مێژووییەوە پشت ڕاست دەکرێتەوە ، ئیسحاق لەگەڵ سێ لەپیاوانی ڕەشید بە وەفدێك چونە لای شارلمان کە پاشای فەرەنسا و لمباردیا و سکسون و ئەڵمان و ئیتاڵیا بوو بە کۆمەڵێ دیاریەوە کە لەلایەن ڕەشیدەوە پێشکەشی کرابون، ئەوانیش (سەعات — فیل — قوماشی بەنرخ بون)، کاتژمێرەکە ، کاتژمێرێکی ئاوی بوو بە ئاو ئیشی دەکرد، شارلمان کاتێ ئەمەی بینی وا گومانی برد ئەمە کارێکی سیحری بێت[٦٦] .

جابری کوڕی حەیانیش چەند ئامێرێکی دروستکردبووو کە دەیتوانی مرۆڤ بەرزبکاتەوە و بشی سوڕێنێتەوە ، وەك ئەوەی بە چەند پەتێکی نادیار هەڵواسرابێت. کارێکی دیکەشی بریتی بو لە پۆلیسێکی ئۆتۆماتیکی کە لەبەردەرگای یەکێ لە وەزیرەکان داینا بوو بۆ کاری پاسەوانی، کە ئەگەر یەکێ ڕەچاوی هەندێ یاسای نەکردایە کە جابر دایناو ئەوا سەلامەت دەرنەدەچو، وەك ئەوەی ڕویدا بەسەر یەکێك لە کەنیزەکەکانی یەحیای بەرمەکی کە ئەم شمشێرە ئۆتۆماتیکیەی بەرکەوت . شتێکی تریشی دروستکردبو هاوشێوەی تەلەفۆن بو ، زانایان دەڵێن دووسندوقی دروستکرد کە بەهۆی چەند تەلێکەوە پێکەوە گرێ درابون ، کاتێ یەکێك

---

[٦٥] میخائیل عواد : صور مشرقة من حضارة بغداد في عصر العباسي ، ص١٧ .

[٦٦] خضری بك : الدولة العباسي ، ص١٦٣ .

لـه سـندوقێکیانەوە قـسەی دەکـرد لـه سـندوقەکەی تـرەوە گوێیـان لێـی دەبوو[٦٧].

---

[٦٧] د.کاوە فەرەج سەعدون: ڕۆڵی پرشنگداری زانا موسڵمانەکان لە پێشکەوتنە زانستیەکاندا ، ل ١٨٤.

# باسی دووەم

# وەرگێڕان لەدەورەی ڕەشیددا

زیـاتر پەیوەسـت بـون و هۆگربـون بـە زانـست و وەرگێڕانـەوە لەسەردەمی عەباسیدا ، دەگەڕێتەوە بۆ خانەی حیکمەت (بيت الحكمة)لـە بەغداد، ئەم دامەزراوەیە لە لایـەن ڕەشـیدەوە بنیـاتنرا لـە نزیـك كۆشـكی خەلیفە ، بەلاّم ئەمە ڕاست نیە ، چونكە خەڵكێكی زۆر سـەردانیان دەكـرد ، بۆیـە زۆرێـك پێیـان وایـە لـە شـوێنێكی دوور لـە كۆشـكی خەلیفـەوە بنیاتنراوە تـاوەكو خـەڵكی بـە ئاسـانی بتـوانن سـەردانی بكـەن ، خانـەی حیكمەت دامەزراوەیەكی بەرفراوان بوو كەلە چەندین هـۆڵ پێـك دەهـات : هۆڵێك بۆ كۆبونەوە زانستیەكان و ڕێكخستنی ئیداری ، شوێنێ بـۆ دانـانی كتێبـەكان و پارێزگـاری لێكردنیـان، لەگـەڵ دەزگایـەك بـۆ وەرگێڕەكـان. ئـەوەی لەسـەر خەلیفـەش بـوو ، بریتـی بـو لـە ئیـدارەكردن و پارێزگـاری كردنی ئەو كتێبانەی وا لە كتێبخانەكـەدا بـوون و ڕێكخـستنی ژمارەیـەكی زۆر لـە وەرگێـر و یارمـەتی دانیـان لـە بەرامبـەر كارەكەیانـدا ، هـەروەها ئەوانـەی كتێبیـان لەبـەر دەگرتـەوە ، لەگـەڵ بـەرگتێگرتنی كتێبـەكان و ئەوانەشـی كاغـەزیان دروسـت دەكـرد[68] . سـەرۆكایەتی ئـەم دەزگایـەش لەلایەن یوحنا كوڕی ماسویە وە بوو[69] بۆ ماوەی نیو سەدە. لێرەدا هـەوڵ

---

[68] د. كمال السامرائي : مختصر تأريخ الطب العربي ، ج١/ ٣٦٣ و ٢٤٠ و ٢٤٥ .

[69] ابن النديم : الفهرست ، ص ٤٠١ .

ئـەدەم ئاماژەیـەکی کـورت بکـەم لەسـەر هەنـدێ لـەوەرگێڕەکانی ئـەم دەورەیە، ئەوانیش [70]:

ئـسطاث ، لـە ڕێگـای ئەسـکەندەریەوە بەشـداری کـرد لـە سـاڵی ( ١٧٩ك/٧٩٥) لـە هـەمان پلـەدا بـو لەگـەڵ پێـشینەکانیدا لـە وەرگێڕانـی کتێبەکان بۆ ( یەحیا بەرمەکی ) .

منکەی هندیش، دەستی کرد بە کاری وەرگێڕان لە هندیەوە بۆ فارسـی و پاش ئەوەی فێری زمانی فارسی بوو، یەکێ لە بەرهەمەکانیشی ( سموم لشاناق )بوو کە هەندێ دەڵێن وەریشی گێڕاوە بۆ فارسی .

هەروەها ( عبدیشوع کوڕی هرمز ) هاورێی جبرائیـل کـوڕی بختیـشوع ، کاری وەرگێڕانی کرد لە زمانی یۆنانیەوە بۆ زمانی سریانی.

جبرائیلی کوڕی بختیشوعیش دەورێکـی سـەرەکی هـەبو لـە وەرگێڕانـی کتێبـە پزیـشکیە یۆنانیـەکان بـۆ سـەر زمـانی عـەرەبی .[71] ماسـرجویە ( پزیـشکی سـریانی بـەناوبانگ )، هەسـتاوە بـەکاری وەرگێـڕان لـەزمانی سریانیەوە بۆ عەرەبی ، لە بەرهەمـە وەرگێڕاوەکانیـشی : ( قـوی الاطعمـة ومنافعها ومضارتها ) ، ( قوی العقاقیر ومنافعها ومضارها ). ڕەشید داوای لە ( یوحنا کوڕی ماسویە ) کرد کە کتێبە کۆنەکانی ناوچـەی ( ئەنقـەرە و عموریە ) کۆبکاتەوە کە تایبـەتن بـە پزیـشکیەوە ، پاشـان وەریانگێڕێتـە سەر زمانی عەرەبی لە بەغداد. لە لایەن بەرامکەکانیشەوە ( یـەحیا کـوڕی خالد بەرمەکی ) ، گرنگی داوە بە کاری وەرگێـران ، ئـەوەبو یـەحیا داوای

---

[70] د. جابر عزیز الشکری : تأریخ العلم الکیمیاء ، ص٧٩ .

[71] د. شوقي الضیف : العصر العباسي الاول ، ص٣٢٧ .

لــە ( بطریکــی ) کــرد ، کــە کتێبێــك لــە بــارەی کــشتوکاڵی ڕۆمیــەوە وەرگێڕێتەسەر زمانی عەرەبی، ئەویش بەم کارە هەستا[٧٢] .

[٧٢] هـ . س .

# باسی سێهەم
# تیشکێك لەسەر کەسایەتی ڕەشید و سەردەمەکەی

**أعوذبالله من الشيطان الرجيم**

**(( من يستمعون القول فيتبعون أحسنة ، أولئك الذين هواهم الله ، وأولئك هم أولو الألباب ))**

## هارونامە

هارون ڕەشید یەکێکە لە کەسە غەریبەکانی ناو مێژوو، دەورانی حوکمی یەکێکە لەسەردەمە جیاوازەکان و شێوازی حوکمداری و دەسەلأت بەرێوەبردنی ولأتی یەکێکە لە سیستمە جیاوازەکانی ناو مێژوو. کەسێکی غەریبە ! لەبەر ئەوەی ڕاو بۆچونی جیاواز هەیە لەسەر کەسایەتی ، لەلایەکەوە کەسێکی عارەق خۆرە و خوی گرتووە بە سەمای ئافرەتان و گۆرانی و مۆسیقاوە، لەلایەکی دیکەوە کەسێکی لە خواترس و ئیماندارە و بەیانیان لە سەفی یەکەمی مزگەوتدا ڕادەوەستێ. دەورانە جیاوازەکەشی بریتیە لەو گەشەسەندنەی لە بواری سوپادا بەدەستیان هێنابوو کە ببونە مەترسی بۆ سەر رۆژئاوا و تەنانەت ناچار بە پێدانی سەرانەشیان کردبوون، لە بواری زانستیشەوە بەرەو پێشچونێکی گەورە هاتە گۆرێ ، بەتایبەتی لە بواری پزیشکیدا ئەوەبوو بۆ یەکەم جار

نەخۆشخانەی دەرونی کرایەوە بۆ ئەوانەی کە توشی نەخۆشیە دەرونیەکان ببون. ئەمە سەرەرای ئەوەی کە لە بواری ئاینیشدا گەشانەوەیەکی گەورە بەدیار دەکەوێ بەهۆی بونی سێ لە ئیمامانی ئەهلی سوننە و جەماعەت (مالیك و شافیعی و ئەحمەد) سەرەرای چەندین ئیمام و زانای گەورە کەوەك یەکێ لە نوسەرەکان دەڵێ کۆڵانێ نەبوو لە شاری بەغداد موجتەهیدێکی تێدا نەبێت. لە بواری ئەدەبیشدا هەڵچونێکی گەورە بەرچاو دەکەوێ لەسەر دەستی کەسانی وەکو (ئەصمەعی و کەسائی و...). جیاوازی سەردەمەکەشی بریتیە لە دەور و کاریگەری هەریەك لە بەرامکەکان لەلایەك و رۆڵی ئافرەتان لەلایەکی دیکەوە لە بوارەکانی ئەدەب و دەسەلآت و کاری پزیشکی و مامۆستایی و .....

من لەم بابەتە بچوکەدا ویستومە ئەوەت پێ بگەیەنم ، کە ڕاکان جیاوازن لەسەر ئەم کەسایەتیە، لێکدانەوەی ڕوداوەکان و ئەنجام دەرهێنانیان جیاوازی هەیە لە نێو نوسەر و مێژونوسەکان لە کۆن و لە نوێ. لە نێو مێژونوس و رۆژنامەنوس و وتارنوس لێکۆڵەر و شاعیر و ئەدەب نوس، پاشتریش هەریەکە لەوانەش لەنێو خۆیانیاندا جیاوازیان هەیە. کەسی دیکەش هەیە لە ئەنجامی خوێندنەوەی هەندێ شیعری لابەلاوە کە مێژوەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمە دائەنیشێت و دەست دەداتە فەلسەفە لێدان ، بە حوکمی ئەوەی شیعر بەسەر ژندا وتراوە ، باس لە هەندێ شت کراوە کە ڕێگە پێنەدراون لە دیندا ، کەواتە کۆمەڵگا لە ئەزمەی ئەخلاقیدا ژیاوە، بازارێك بووە پڕبووە لە ژنی ڕوت ، پڕبووە لە ژنی عەرەبی ، تورکی ، فارسی، پاکستانی ، بیانی،.... ئەی چۆن ئەو هەموو ژنەش هەبووە کەچی خەڵکی بە داخ و ئاخی ژنێکەوە

بووه؟! پاشتر بیری ئەچێت بۆ قسەیەکی دیکە ، کەواتە لەگەڵ هەموو ئەم ژنانەشدا خەڵکی لەبەر بێ پوڵی و ئەزمەی ئابوری نەیتوانیوە ژن بکرێت ، بەڵکو تەنها بۆ چەند دەسەڵاتدارێك قۆرخ کراوە ، کەواتە ئەزمەیەکی دیکە سەر هەڵدەدات ئەویش عەدالەتی کۆمەڵایەتیە . ئەمەش لە ئەنجامی ستەمکاری دەسەڵاتدارەوە کە پشتیوانی لە دەوڵەمەند دەکات و پشتی هەژار بەرئەدات ، کەواتە بۆ خۆشی دەوڵەمەندە ، هەربۆیەخۆشی ژنی زۆری هەیە و پارە و سامانی زۆری هەیە ، کەواتە ستەمکارە. ئینجا لە دوای ئەمە دەست دەکات بە دروستکردنی چیرۆك : رۆژێ خەلیفە سەمای ئەکرد بەدزیەوە لەگەڵ یەکێ لە کەنیزەکەکانی ، خێزانەکەی بینی و شەرمەزاری دایگرت. پاشتر شتەکە ئاسانتر دەبێت و باوی بەدزیەوە نامێنێ و دەڵێ خەلیفە هەموو هەفتەیەك کە دەچووە حەمام دەبوایە چل ئافرەتیان بەڕوتی بۆ بکردایەتە ژورەوە. هەموو شەوێك ئەگەر پەنجا ئافرەت سەمایان بۆ نەکردایە خەو نەیئەبردەوە . تاوای لێهات خەلیفە بەدیار کەسانی ناو کۆشکەوە کاری جینسی خۆی دەکرد. ئەم جۆرە قسەڕێکخستنانە کاری ئەو کەسانەن هەر لەخۆیانەوە بڕیار ئەدەن لەخۆیانەوە قسە ئەکەن ، لە نمونەی خەوارجن کە بە پێغەمبەریان دەوت عادل نیت. هەربۆیە ئەو کەسانەی ئاوا شت ئەنوسن نەئەمانەتی مێژویی ئەزانن نە ڕێزی قەڵەمی خۆیان ئەگرن بەڵکو کەسانێکی بوختان چین ئیتر ئایا لە دایکیانەوە فێربون کە خەریکی بوختان کردن بووە بۆ خەڵکی کە ئەمیش ئێستا پەرەکانی سەر دەفتەرەکەی پڕ ئەکاتەوە لەو بوختانانە یان هیچ نازانن و ئەیانەوێ خۆیان دەرخەن. کەسی وا هەیە دەڵێ : باشە ئەگەر ئەمانە ڕاست ناکەن ئەم هەموو

قسانەیان چۆن ڕێکخستووە ؟، بۆچی خەڵکی زوو باوەڕدەکات و شوێنیان دەکەوێ ؟ منیش ئەڵێم: تۆ ئەوەندەی حەزت لە غەیبەت و درۆ و بوختانە و گوێی بۆ دەگریت ، ئەوەندە حەزت لە قسە و وتاری ڕاست هەیە؟، ئەگەر لەمیشدا درۆ نەکات، دەبێ بڵێ: نەوەڵڵا. ئینجا پێی ئەڵێم ئەرێ کاکە تۆ ئەوەندەی حەزت لە مۆسیقا و گۆرانی غەزەل و دڵداری هەیە ، ئەوەندە حەزت لە قورئان هەیە؟ ئەویش ئەڵێ : نەوەڵڵا ، حەز ئەکەم لە تەعازێشدا لە جیاتی قورئان ، گۆرانی یا مۆسیقایەکی هێمن بێ. منیش دەڵێم : باشە دەی کاکەگیان ئەوەت هەڵبژاردووە کە خۆت حەزت لێی هەیە، کەسی بوختانچی حەزئەکات هەموی بوختانچی بێ، کەسی......

ئەگەر نا ئەم مێژووەت چۆن ئاوا پاك و بێ هیچ جیاوازی ڕایەك و قیلە و قالەیەك نوسیەوە ، ئەبێ ئەوەی تۆ نوسیوتە مێژوو نەبێ پەخشان بێت، چونکە مێژوو بەدوور نیە لە جیاوازی و خیلاف بەتایبەتی لە مێژوی ئیسلامیدا.... بۆ نوسینی ئەم بابەتەش پشتم بەم سەرچاوانە بەستووە، لەگەڵ چەند سەرچاوەیەکی تر کەلەناو بابەتەکەدا ئاماژەم پێداوە

**سەرچاوە کۆنەکان**


- العصامي : سمط النجوم العوالي في أبناء الأوائل والتوالي.
- التقي العزي: الطبقات السنية في تراجم الحنفية.
- القلقشندي: صبح الأعشى
- الذهبي: سير أعلام النبلاء.
- أبوحامد الغزالي: التبر المسبوك في نصيحة الملوك.
- ابن الطقطفي: الفخري في الاداب السلطانية.
- ابن طاوس: فرج المهموم ي تأريخ علماء النجوم.

- ابن النديم: الفهرست
- السيوطي: تأريخ الخلفاء.
- إبن الأثير: الكامل في التأريخ.
- ابن الجوزي: مختصر صفة الصفوة.
- ابن خلدون: مقدمة.
- إبن كثير: البداية والنهاية.
- الأشعري: مقالات الإسلامي.
- حاجي خليفة: كشف الظنون.
- شهرستاني: الملل والنحل.
- الطبري: تأريخ الطبري المعروف بتأريخ الأمم والملوك.
- مسعودي: مروج الذهب و معادن الجوهر.
- البغدادي: الفرق بين الفرق.

**سەرچاوە نوێکان /کوردی**

- دکتۆر حاکم المطيري: ئازادی یان تۆفان، و: فاتح سەنگاوی.
- مصلح جلالي: شوراتەکان.
- هەزارو یەکشەوە ، بەرگی یەکەم.

**سەرچاوە نوێکان /عەرەبی**

- الدكتور محمد جواد سعدالدين و نافع يحيى الدراجي: الرياضيات في التراث العربي الإسلامي.
- الدكتور شوقي أبوخليل: أطلس الفرق والمذاهب الإسلامي.
- الدكتور إبراهيم أيوب: التأريخ العباسي السياسي والحضاري.
- برنار أوكان: كنوز الإسلام ، ت: نورما نابلسي.

- ميخائيل عواد: صور مشرقة من حضارة بغداد في العصر العباسي.
- شيخ محمد الخضري بك: الدولة العباسية.
- حنا الفاخوري : التأريخ الأدب العربي.
- سيف الدين الكاتب: أطلس تأريخ العرب والإسلام.

**گۆڤار و بابەتی ناو سایتەکان**

- گۆڤارى التراث الشعبي: العدد الفصلي الأول- شتاء ١٩٨٩. عدد خاص من الف ليلة وليلة.
- سميرة تحسين الفيلي: نساء في الخليفة هارون الرشيد، واسط.
- www. Mesopotamia.com
- حوار الثقافات في كتاب الأغاني لأبي الفرج الأصفهاني.

**گرنگترین وتەکان لەبارەی رەشیدەوە**

- هاوەڵی زانایان و پیاوچاکانی کردووە و پارێزگاری لە نوێژ و پەرستشە دینیەکان کردووە و نوێژی بەیانی لە کاتی خۆیدا کردووە ، ساڵێ غەزا و ساڵێ حەجی کردووە . ((ئیبن خەلدون))
- زیرەك و ئازا و دوربین و ستایشکەر بووە ، بە پێی دین و سوننەت .
((ئیبن عیماد))
- ڕەشید (رحمه الله) وتەبێژان و نوسەرانی خۆشویستووە ولە رۆژانی خیلافەتیدا کەسێکی لێبوردە و رێزگیر و دادپەروەر بووە، بێ فیزبووە و چۆتە دیدار و سەردانی زانایان. ((ئیبن عیماد))
- نەهی کردووە لە مشتومڕکردن و زیادەڕۆیکردن لە دیندا و لەو بارەشەوە وتویەتی :(ئەمە هیچ ئەنجامێکی باشی نیە).
((خەتیبی بەغدادی))

- هەموو ڕۆژێ (١٠٠) ڕکات نوێژی کردووە تاوەکو وەفاتی کرد جگە لەو ڕۆژانەی کەنەخۆش دەکەوت، هەموو ڕۆژێکیش لە ماڵی خۆی (١٠٠٠)درهەمی ئەبەخشی. ((خەتیبی بەغدادی))

- خەلیفەیەکی جوامێر و شەرمن بوو. خاوەنی حەج و جیهاد و غەزوە و ئازایەتی بوو.بۆچونی جوانی هەبوو لە ئەدەب و فیقهدا و زانایانی خۆشدەویست و پیرۆزیە دینیەکانی گەورە ڕادەگرت و بە مشتومڕکردن و کەلام تورە دەبوو. (( ئیمامی زەهەبی))

- مردنی هیچ کەسێك کاریگەری نەبووە لەسەرم بە قەدەر مردنی هارون ئەمیری موسڵمانان ، حەزم ئەکرد خوا تەمەنی درێژبکردایە لەسەر تەمەنی من. (( فەزیل کوڕی عیاز ))

- حەجی ڕەشید ، ساڵی ( ١٧٠، ١٧٣، ١٧٤، ١٧٥، ١٧٦، ١٧٩، ١٨١، ١٨٦، ١٨٨، ١٩٣ )ك. ((خەلیفە کوڕی خیات))

## هارون ڕەشید لە تۆمارە مێژوییەکاندا

١. هارون ڕەشید لە دایك بووە لە شاری (رەی) لە (طبرستان) لە کۆتاییەکانی ذي الحجة ی ساڵی (١٤٥)ك ، یان دەڵێن لە سەرەتای محرم ی ساڵی (١٤٦)ك ، دایکی ناوی خەیزەرانە و لە یەمانیە لە دایك بووە.

٢. بەیعەتی خیلافەتی پێدرا لە ڕۆژی جومعە (١٢ی ربیع الاول)ی ساڵی (١٧٠)ك لە بەیانی کاتی چێشتەنگاوی ئەو شەوەی براکەی (هادی) وەفاتی تێدا کرد.

٣. ڕەشید لە ساڵی بەیعەتدانیەوە بە خەلیفە (یەحیا کوڕی خالدی بەرمەکی) کردە وەزیری خۆی و هەتا کۆتای ژیانیشی دەیوت: لاسایت دەکەمەوە لە فەرمانکردنم بەبەردەستەکانمدا.

٤. له ساڵی (١٧٥)ك ڕەشید کوڕەکەی لە زوبێدە (محمد ئەمین) کردە وەلی عەهدی خۆی کە ئەوکاتە تەمەنی تەنها پێنج ساڵان بوو.

٥. له ساڵی (١٧٦)ك یەحیا کوڕی عەبدوڵا دەرچوو لە دیلەم و ڕەشیدیش (فەزڵ کوڕی یەحیای بەرمەکی) نارد بە (٥٠)هەزارکەسەوە بەمەش هێمنی و ئاسایش گەڕایەوە ناوچەکە.

٦. کوژانەوەی (خامۆشکردنی) چەند فیتنیەك لە ( جەزیرە و دیمەشق) لە ساڵانی (١٧٧ و ١٧٨)ك.

کوڕی عیسا).لە پاش ئەمە (جەعفەری کوڕی یەحیای بەرمەکی) بە سوپایەکی گەورەوە چووە شام و کۆتای بە فیتنەکە هێنا.

٨. لە ساڵی (١٨٢)ك ڕەشید بەیعەتی بە کوڕەکەی (عەبدوڵلا)دا و کردی بە وەلی عەهد لە دوای براکەی (محمد ئەمین)ەوە کردیە والی خوراسان و نازناوی (مەئمون)یشی پێدا، پاشان بەیعەتیشیدا بە کوڕەکەی (قاسم) وکردیە وەلی عەهد لە دوای مەئمون و نازناوی (مؤتمن)ی پێداو کردیە والی لە جزیرە و سنورەکانی دەوروبەری*.

٩. لە ساڵی (١٩٠)ك ڕەشید چووە شەڕەوە لە بەرامبەر (نقفور) مەلیکی ڕۆم بە سوپایەکی (١٥٠)هەزار کەسیەوە و سوپاکەشی بە سەرکەوتنێکی گەورە گەڕایەوە.

---

* لە کتێبەکانی (صفوة الصفوة ی ئیبن جەوزی و وفيات الأعيان:١/١٦٨) باس لە کوڕێکی ڕەشید دەکرێ کە بەهیچ شێوازێك بەشداری لە کاری سیاسی و دەسەلاتی باوکی نەکردووە بەڵکو کەسێکی زاهید بووە بەم شێوازە: (ئەبو عەباس ئەحمەد کوڕی هارون ڕەشید) ناسراو بە (السبتي: شەممە) عەبدێکی سالح و پیاوچاك بووە ، تەرکی دونیاو دەسەلاتی باوکی کردبوو ، بۆیە پێشیان دەوت (السبتي) چونکە لە شەممەدا هەموو ئەو شتانەی لەو هەفتەیەدا کۆیدەکردنەوە لە شەممەدا دەیبەخشینەوە، وە زۆر سەرقاڵی عیبادەت کردن بوو ، بەر لە باوکیشی وەفاتی کرد لەساڵی ١٨٤ك.

١٠. له ساڵی (١٩٢)ك ڕەشید دەرچوو بۆ شەڕكردن لەگەڵ (رافع بن الليث) له خوراسان به سوپایەكی گەورەوە و له (ڕەی) نەخۆش كەوت.

١١. گەیشتنە (طوس) لـە سـاڵی (١٩٣)ك ، ڕۆژی شـەممە كـە چـوار ڕۆژی مابوو له (جمادي الثاني) وەفاتی كرد

## قـــسەی دژ بـەیـەك

ڕەشید نوێژی دەكرد و به ڕۆژیشدا به ڕۆژوو بوو . مەسـروفی زۆری دەكـرد لـە رابـواردن و خۆشـی و گاڵتــە و گــەپی شــەوانیدا . گـوێی لــە پیاوچاكان و ئامۆژگاری كەران دەگرت و دەگریا تا ڕیـشی تـەڕ ئـەبوو. لـە دانیــشتنی لـــەهو و گــۆرانی وتنــدا گاڵتـــە و گـــەپی زۆری دەكــرد و زۆر پێدەكـەنی. ئـەم وێناكردنانــە بـۆ خەلیفەیـەكی گـەورەی وەكـو (هــارون ڕەشید) كه له ڕۆژئاوادا به گەورەترین خەلیفەی ئیمپراتۆریـەتی ئیـسلامی ناوی دەبەن جێگای تێرامانه ئەو وێنا پێچەوانە و دژبەیەكانه.

لـه ڕاسـتیدا مـن پـێم وایـه مێـژوی خیلافـەتی عەباسـیەكان ، مێـژوی (زانایــان ، دادوەران، فوقــەهاكان، ئــەمیرەكان، خەلیفــەكان )ە هەربۆیــە پێویـــستمان بـــە وردبینـــی و تێڕامـــانی زۆر هەیـــە لەســـەر ڕوداوەكـــان و كەسایەتیەكانی نێو ئـەم مێـژووە، بـۆ نمونـە كـاتێ زانایـەكی ئـاینی دێـت مێژووەكـە دەنوسـێتەوە، ڕەنگـە لەوانەیـە بـەو بـارەدا بیـشكێنێتەوە كـە زانایــان بــەش خــوراو بــون و چەوســێنراونەتەوە ، لــە وەتــەی مێــژووی ئیسلامی هەیـە زانـا خـاوەنی ڕای خـۆی نـەبووە و نـەیتوانیوە بـە ئـازادی قـسەبكات، ئەمــەش بــە پــشت بەسـتن بــە هەنـدێ چـیرۆك و خورافیــات و كتێبی ئەدەبی و هەندێ پارچە شیعر كارەكەی بەرێ دەكات.

هـەروەها ئـەو هەڵانـەی کـە خراونەتـە سـەر هـارون ڕەشـید تـەنها لـە دەربـاری عـەرەب و رۆژهەڵاتیەکانـدا نیـە، بـەڵکو زیـاتر هۆکارەکـەی لـە خۆرئاواوەیە لە ئەنجامی نـاوداری ئـەو کەسـایەتیە و بڵاوبونـەوەی کتێبـی (الف لیلة ولیلة: هەزار و یەکشەوە) بۆ چەندین زمانی رۆژئـاوایی، بەمـەش لەو ئەفسانانەی ناو ئـەو کتێبـەوە دەسـتیان دایـە نوسـین لـە بـارەی ئـەو کەسەوە.

لێـرەدا نمونـەی کەسـێك دێنینـەوە کـە ( رۆژهـەڵاتناس ، موسـڵمان ، رۆژئاویی)ە ئەویش (الحاج عبدالله فلبی)ە کە پێش ئەوەی موسـڵمان بێـت ناوی (جون فلبی) بوو، زۆر کاریگەر بوو بە مێژوی ئیسلامی. ماوەیەك ژیـا لـە (عێـراق و مەککـە و طـائف) لـە دەورانـی مـەلیك ( عەبدولعـەزیز ئـال سعود)دا پاشان هەردوو کتێبی (بلاد العرب الوهابیة و الربع الخالي) دانا لە باسی مێژووەکەیدا دەست درێژییەکی گەورەی کردۆتە سەر خەلیفـەکان و سەردەمەکەیان ،لەوانە خەلیفـە (ئەبوبـەکری صـدیق و هـارون ڕەشـید)بـە شێوازێکی ئەدەبی و لەگەڵ شیکردنەوەی بابەتەکە بـە پێـی بـیری خـۆی، لەوێدا زوڵمێکی گەورە لە مێژوی ڕەشید دەکات و دەڵێ : (هارون یەکێکـە لە داروخێنەرانی دەوڵەتی عەباسی).

لەمـەوە تێدەگـەین و پاشـتریش زۆرترمـان بـۆ ڕون دەبێتـەوە کـە ئـەو فیکرە دژەی رۆژئاوا لە بارەی دەوڵەت و خیلافـەتی ئیـسلامیەوە هەیـەتی بە تایبەتی لە دەورەی یەکـەمی عەباسـیاندا بـۆ ئـەو پەسـتانە گەورەیـەی خیلافەتی ئیسلامی دەگەڕێتەوە کە لەسەر رۆژئاوا دروستی کردبوو.

## له ئینسکلۆپیدیای بەریتانی ، ساڵی ٢٠٠٩دا هاتووە

**هارون ڕەشید کوڕی محمد مەهدی**

فبرایر/ شوباتی ٧٦٦ز یان مارس/ ئـازاری ٧٦٣ز لـە (رەی) ئێـران لـە دایــك بــووە . مــردووە لــە (٢٤ی مــارس/ ئــازاری ســاڵی ٨٠٩ز) لــە (طـوس).خەلیفـەی پێنجـەمی دەوڵـەتی عەباسـیە و مـاوەی حوکمەکـەی (٧٨٦–٨٠٩)ز . ئیسلام لەم ئیمپراتۆریەتەدا لە بەغداد گەیشتە ئەوپـەڕی بەهێزی، ئەمەش لە هەزار و یەکشەوەدا باسی لێوە کراوە.

ژیانی خێزانی

هارون رەشید کوڕی مەهدیە ، کـە خەلیفـەی سـێهەمی بنەماڵەکەیـە و ماوەی حوکمەکەی(٧٧٥–٧٨٥)ز. خـەیزەرانی دایکیـشی کـچی کۆیلەیـەك بوو لە یەمەن، جاریـەکی بـەهێز بـوو، کـە دەور و کاریگەریـەکی بـەهێزی هەبوو لە دەورانی مێرد و کوڕەکانیدا . هادی ئەمیری یەکـەم بـوو، هـارون لــە دوای ئــەو لــە دایــك بــوو. ئەوانــەی دەبونــە حــوکمڕان دەبوایــە شـارەزابکرانایە لـە قورئـان (کتێبـی پـیرۆزی ئیـسلام) ،شـیعر ، مۆسـیقا، چــیرۆکەکان لــەبارەی پێغەمبــەرەوە ، هــەروەها مێــژوی ئیــسلام و مومارەسەکردنی بنەما یاساییەکان . هارون بووە کەسێکی شارەزا لەسـەر دەستی بەرمەکیەکان کە خزمەتکاری دایکی بون. لە ساڵی (٧٨٠–٧٨٢)ز هارون ناوی گەورە بوو لە جیهاندا کـاتێ لـە دژی ئیمپراتۆریـەتی بیزەنتـی شەڕی کرد. ئـەوەبوو لـە سـاڵی (٧٨٢)ز گەیـشتە بـسفۆر لـە کـەنارەکانی قوستنتنیە و بـە مـەرجی پێـدانی سـەرانە بـە موسـڵمانەکان شـەڕ کۆتـای پێهـات. ئەمــەش بــە یەکــەم دەرکــەوتنی نــاوی بــە شــێوەیەکی گــەورە دەبینرێت. دووەم ناویشی کـاتێ بـوو کـە بـووە فـەرمانڕەوا لـە (تـونس و

میسر و ئەرمینیا و ئازربیجـان) لـە ژێـر چـاودێری مامۆسـتاکەی (یـەحیای بەرمەکی)ئەمەش ئامادەکاری خـەیزەران بـوو بـۆ کوڕەکـەی بـە هاوکـاری یەحیا ، تاوەکو لـە بـەڕێوەبردنی وڵاتـدا شـارەزا بێـت. کـاری دووەمیـشی ئەوەبوو کە مەهدی قەناعەت پێبکات کە لە پاش خۆی هـارون بکاتـە وەلی عەهد، بەڵام مەهدی لە (اغسطس/ئابی ٧٨٥)ز بەبێ ئەوەی بەشێوەیەکی ڕەسمی ئەو گۆڕانە بکـات وەفـاتی کـرد و هـادی بـووە خەلیفـە و هـارونی شکاند، پاشتر هادی مرد بـە شـێوەیەکی پـەنهانی (نهێنـی) لـە (سـبتمبر/ ئەیلولی ٧٨٦)ز کە پێـشنیاری ئـەوە دەکرێـت خـەیزەران لـە پـشتی ئـەم کارەوە بوبێت تاوەکو دەسەڵات و پلەی جارێکی تر بگەڕێتەوە.

هـارون رەشـید بـووە خەلیفـە لـە (١٤ی سـبتمبر/ ئـەیلولی ٧٨٦)ز . سەرکەوتوو بوو لە حوکمکردنی ئیمپراتۆریەتەکـەی لـە ڕۆژئـاوایی دەریـای سپی ناوەڕاستەوە تاوەکو هند. یەحیای کردە وەزیری ڕەسمی خۆی و بە بەشـداری کورەکـانی (فـەزڵ و جەعفـەر) ئـەیانتوانی داواکارییـەکانی خەیزەران بەدی بێنن ولە بەڕێوەبردنی وڵاتیشدا دەستێکی باڵایـان ببێـت، ئەمـەش بـەهۆی ئـەو کاریگەرییـە گەورەیـەی خـەیزەران هـەیبوو لەسـەر دەسـەڵات و کوڕەکـەی ، بـەم شـێوەیەش مایـەوە تـاوەکو لـە (٧٨٩)ز وەفـاتی کـرد، بـەڵام بەرامکـەکان تـاوەکو (٨٠٣)ز دەسـەڵاتیان بەسـەر ئیمپراتۆریەتەکەدا هەبوو بەشێوەیەکی باڵا.

خەلیفە چەند کێشەیەکی ناوخۆیی بۆ دروست بوو لـە چـەند کـاتێکی جیـاوازی مـاوەی دەسـەڵاتەکەیدا ، ئـەویش دروسـتبونی شـۆرش بـوو لـە ناوچەکانی (میسر ، سوریا ، یەمەن، هەندێ لە پارێزگاکانی ڕۆژهـەڵاتی) . بەڵام حکومەتی مەرکەزی توانی بەهێزی خۆی لە دەست نەدا و ڕووبەڕویان

بوەستێتەوە، پاشان ئەوەبوو لە (تونس) ساڵی(٨٠٠)ز ئیبراهیمی کوڕی ئەغلەبی دانا لە بەرامبەر پێدانی نیوە سەربەخۆییەك ساڵانە دەبوایە (٤٠)هەزار بداتە پایتەخت(بەغداد)، ئەمەش بە سەرەتای هەوڵدانی ئەغلەبیەکان دادەنرێت بۆ سەربەخۆیی و پشتکردنیان لە بەغداد، هەروەها بە سەرەتای دەرکەوتنی دەوڵەتە هەرێمیەکان دادەنرێت لە سنورەکەدا.

لەم دەورەیەدا ئیمپراتۆریەتی عەباسی گەشەسەندنێکی گەورەی بەدەستهێنا لە پیشەسازی (چینراوەکان، پارەی وردە، وەرەقە،......).بازرگانیش بە هەمان شێوە گەشەسەندنێکی گەورەی بەخێوەبینی.

هارون وەصفێکی زۆر جوانی دەسەڵاتەکەی کراوە لە (هەزار و یەکشەوە)دا لە کەیف سازی و ڕابواردنەکانی شەوانەیدا و لە بەهێزی دەسەڵاتەکەی و دەرکەوتنی وەکو سەرکردەیەکی گەورە.

لە پاش شۆرش و دامەزراندنی پایتەختی نوێ لە (٧٦٢)ز لە بەغداد. دەسەڵاتدارانی بنەماڵەی عەباسی سەرگەرمی خۆیان دایە زۆری ژنەکانیان و ڕازاندنەوەی سفرە و خوانەکانیان بە قاپ و قاچاغی ئاڵتونی و زیوی. لە کۆشکەکەی هارون کچی گۆرانیبێژ و خزمەتکاری ژن و پیاویشی لێبوو. هارون بۆ خۆی زۆر حەزی لە مۆسیقا و شیعر دەکرد. هەمیشە لە دانیشتنەکانیدا زیادەڕۆیی دەکرد لە سەرفکردن و پێدانی دیاری بە مۆسیقاژەن و شاعیرە ناودارەکانی. هەروەها زۆر گوێی لە مۆسیقا ڕادەگرت و سەیری یاری (شەڕە کەڵەشێر و سەگەکان)ی دەکرد، زۆر خێراش حوکمی مردنی دەردەکرد(اعدام الفوری). لە گەشتەکانی

شەوانەشـــیدا هەمیـــشە مەســـروری شـــیرهەڵکێش(ســـەربڕ) و جەعفـــەری بەرمەکی هاورێی و ئەبونەواسی شاعیری گەورەی لەگەڵدابوو.

بەرمەکیەکان

بەرمەکیـــەکان بـــۆ مـــاوەی (١٦) ســـاڵ بەشـــێوەیەکی ســـەرەکی لـــە ئیدارەی ئیمپراتۆریەتەکەدا بوون، جەعفەری بەرمەکیش وەکو هاوڕێیـەکی تایبەتی هـارون ، لەگـەڵ ئـەوەی کـە پلەیـەکی گـەورەی هـەبوو بـەڵام لـە ئـەنجامی هێنـانی عەباسـەی خوشـکی هـارون بـە نهێنـی و بـەبێ هـیچ مـەرجێکی زەواج و پاشـتریش ئاشـکرابونیان لـە ئـەنجامی دروسـتبونی منداڵـەوە. هـارونی زۆر تـوڕە کـرد، هەربۆیـە لـە (٢٩ی کـانونی دووەمـی ٨٠٣)ز جەعفەری کوشت و زۆربەی بنەماڵەکەشی ڕەوانەی زیندان کرد.

یاخود مێژونوسان بۆ بەربەرەکانێی (عەرەب و فـارس)ی دەگێرنـەوە کە هارون ویستویەتی پۆستی وەزیری و پۆستە بەرزەکان بداتـە کەسـانی عەرەب نـەك فـارس ، ئەمـەش بـۆ پلانـی وەزیـری عـەرەب (فـەزڵی کـوڕی ڕەبیع) دەگەڕێتەوە کە لە هەوڵی شێواندنی ئەو بارودۆخەدا بـووە تـاوەکو پلە و دەسەڵاتی خۆی بەرزتر بێتەوە. کە پاشتریش بە هەمان شێوە بووە هۆی دروسـتکردنی کێـشە لـە نێـوان مـەئمون و کـوڕی ئـەمیرەی عـەرەبی (زوبێدە)، کە فەزڵی کـوڕی ڕەبیـع پـشتیوانی لـە کوڕەکـەی زوبێـدە کـرد وەکو عەرەبێك و (فـەزڵی کـوڕی سـەهل)یـش پـشتیوانی لـە مـەئمون کـرد چـونکە کـچی عەبـدێکی فارسـی بـوو ،کـە کۆتاییەکەشـی بـە سـەرکەوتنی فارسەکان کۆتایی هات*.

* لێرەدا تەنها ئەو وشانەی کەلە مێژودا هیچ بونێکیان نیە و دروستکراوی کتێبە ئەدەبیەکانە خەتم بەژێردا هێناوە.

## ولایــەتی عــەهـد

لە دوای سەردەمی ڕاشیدینەکان سیستمی فـەرمانڕەوای تێکـچوو کـە لەسەر شێوازی (شورا)بەڕێوە دەچوو، وە گۆڕا بۆ سیـستمێك کـە لەلایـەن موعاویەوە دانرا ئەویش سیستمی (پشتاوپشت)ی بوو یان (ولایەتی عەهد) ئەمەش بە درێژایی حوکمی (ئومەویەکان ، عەباسـیەکان ، عوسمانیـەکان) و هــەروەها دەوڵەتــە لابــەلاکانی وەکـو ( ئەدارسـە ، فـاتیمی ، ئـەیوبی ، مەمالیك)هەروەها لە نێو میرنشینە کوردییەکاندا چ لە دەورانی عەباسـی و چ لە دەورانی عوسمانیدا ....

لێرەدا نامەوێ و بە گرنگی نـازانم کـە بـە درێـژی بـاس لـە چـۆنیەتی هـاتنی عەباسـیەکان و سـەرهەڵدانیان لـە سـەرەتاکانی سـەدەی دووەمـی کۆچی و لـە ناوچـەکانی خوراسـان و پاشـان زاڵبونیـان بەسـەر خیلافـەتی ئومەویدا بکەم. بەڵکو ئەوەی پێویستە باسبکرێ تەنها چۆنیەتی تێکچونی ولایـەتی عەهـد و گواسـتنەوە و جێگیربـونی لـە دەسـت بنەماڵـەی بـەنی عەباسدا و تاوەکو گەیشتنی بە دەورانی ڕەشید.

کاتێك (ئەبوعەباس سەفاح) بووە دامەزرێنەری خیلافەتی عەباسی ، گوێی نەگرت بۆ ئەو دەنگدانەوە و ڕوداوانـەی کـەوا لـە مێـژوی ئیـسلامیدا رویاندا لە نێـوان ئومـەوی و ئـالی عـەلی ، کـە خـۆی دەبـوو لـە دوای خـۆی دەسەلأت بدرێتەوە دەسـت (ئـالی عـەلی) بـەلأم سـەفاح گـوێی بەمەنـەدا و ولایـەتی عەهـدی دایـە هــەردوو کوڕەکـەی (ئـەبو جەعفـەری مەنـصور) و (عیسای کوڕی موسا).

کاتێ مەنصوریش لە دوای سەفاح بووە جێنشین دوبـارە نـاڕەزایی و شۆڕش هەندێ لە ناوچەکانی گرتەوە بەهۆی هەواداریان بۆ بنەماڵەی عەلی

(محمــد نفــس زەكیــە و ئیبراهیمــی )كــەبرا بــون ، بــەلاَم بــەهۆی توندوتیژیەكانی مەنصورەوەلە بـواری سـەربازیدا كۆتـایی بـە شۆرشـەكان هێنا ، بە وازهێنـانی محمـد نفـس زەكیـە لـە كـاری ئـاژاوەگێڕی و پاشـان شەڕكردن لەگـەڵ ئیـبراهیم تـاكو كـوژرانی . دووەم مەترسـیش كـە مـابوو لەسـەر دەوڵەتەكـەی مەنـصور بـونی ئەبوموسـلیمی خوراسـانی بـوو لـە ناوچەی خوراسان كە وەكـو فەرمانڕەوایـەكی ئـەو ناوچـەیە خـۆی ئەدایـە قەڵـەم ، هەربۆیـە لـە دوای نزیـك كەوتنـەوە و هەسـتكردن بـە گـەورەیی پێگەی دەسەلاَتی لە حۆران كوشتی.

لە پاش خۆیشی ولایەتی عەهدی نەدایە براكەی (عیسا كوڕی موسـا) بەڵكو مەهدی كوڕی كردە خەلیفە و جێنشینی خۆی، عیسا لـە سـەردەمی مەهدیدا فەوتی كرد تاوەكو لە دوای مەهدی دەسـەلاَت بگرێتـەوە دەسـت، بۆیە مەهـدیش بەیعـەتی دایـە هـەردوو كوڕەكـەی (موسـا هـادی و هـارون ڕەشید).

لە تەواوی كتێبە مێژوییەكاندا ، بەم شێوازە باسكراوە[1] :

هادی بووە خەلیفە و هارون ڕەشیدیش هاوكارێكی باشـی بـوو، بـەلاَم هادی هـارونی نـەكردە جێنـشینی خـۆی و بـەڵكو بەیعـەتی بـە كوڕەكـەی (جەعفەر)دا كە زۆر بچوك بوو، ئەمەش بووە هۆی مشتومڕ و ناخۆشـی لـە نێوان ئەم دوو برایەدا ، ئەوەبوو هادی بڕیاری سجنكردنی هارونیدا. یەحیا كوڕی خالدی بەرمەكیش كەوتە نێوانیان بۆ چارەسەركردنی كێشەكە، لـە دوای چەندین جار لە بردنی قسەی ئەم و ئەو بـەلاَم هـادی لەسـەر قـسەی خـۆی سـور بـوو كـە دەبـێ بەیعـەت لـە دوای خـۆی بـۆ كوڕەكـەی بێـت،

---

[1] ابن كثير : البداية والنهاية ، ج٢/ ١٠٩–١١٠ . السيوطي : تأريخ الخلفاء ، ص ٢٠٧.............

ڕەشیدیش بە هیچ شێوەیەك قایل نەبوو، بۆیە كاتێ یەحیا نەگەیشتە هیچ ئەنجامێك خەیزەرانی لەمە ئاگادار كردەوە، ئەویش بڕیاری كوشتنی ئەویدا ، چونكە هادی كوڕی ببووە بەربەست لە ئەنجامدانی كارەكانی لە وڵاتدا و ئەو دەسەڵاتەی نەبوو وەكو لەدەورەی مێردەكەیدا هەیبوو.

لەبارەی مردنەكەیشیەوە ڕای پێچەوانە هەیە كە:

– هەندێك پێیان وایە ژەهرخواردوو كرابێت لە لایەن جاریەكەوە بەناوی (عاتكە).

– هەندێكی دیكە پێیان وایە هەر بۆ خۆی نەخۆشی لەگەڵدا بووە و فەوتی كردووە.

– هەندێكی دیكە پێیان وایە خەیزەران ڕای سپاردووە بە هەندێ لە كەنیزەكەكانی كاتێ خەلیفە خەوی لێكەوت ، بەو ڕایەخەی لەژێر خەلیفەدا ڕاخرابوو لولی بكەن و لەسەری دانیشن تاوەكو خەلیفە بخنكێ. چونكە هادی بڕیاری كوشتنی ڕەشیدی دابوو ئەگەر بەیعەت نەداتە كوڕەكەی.

– هەروەها جۆرێكی دی لە مردنەكەی كە زۆر باسی لێوە نەكراوە، ئەویش ئەوەیە كە كاتێ زۆری خواردۆتەوە ئەو قامیشەی كە پێی خواردۆتەوە قرتاوە و لە قورگیدا گیراوە و هەناسەی بۆ نەدراوە و خنكاوە[1].

هادی لە شیعرێكدا بە هارون دەڵێ[2]:

نصحت لهارون فرد نصيحتي

---

[1] العصامي: سمط النجوم العوالي في أبناء الأوائل والتوالي ،٢/ ١٩٣.

[2] العصامي: سمط النجوم العوالي في أبناء الأوائل والتوالي ،٢/ ١٩٣ –١٩٤.

وكل امريء لايقبل النصح نادم

وأدعوه للأمر المؤلف بيننـــا

فيبعد عنه :وهو في ذاك ظالـــــم

ولولا انتظاري منه يوما الى غد

لعاد الى ما قلته وهو راغـــــــــم

زەهــەبیش دەڵــێ :(هــادی لــە ڕەبیعــی دووەمــی ســاڵی ١٧٠ك لــە تەمەنی ٢٣ ساڵیدا وەفاتی كـرد، كـە مـاوەی خیلافەتەكـەی سـاڵێك و دوو مانگ بوو)[1] بەڵام بە گشتی كۆشك بە مردنـی هـادی دڵخـۆش بـون چـونكە كارە ناشیرینەكانی تەواوی كۆشكی بێزاركردبوو.

سەعالیبی دەڵێ: (دروست نەبووە شەوێكی تـر وەك ئـەو شـەوە لـە مێژودا كە شەوی شەممە ١٤شەو تێپەڕی بوو لـە مـانگی ڕەبیعـی یەكـەمی ساڵی ١٧٠ك: خەلیفەیەك مرد، خەلیفەیەك لەدایك بوو، خەلیفەیـەك دانـرا . هادی مرد، مەئمون لەدایك بوو، ڕەشید بووە خەلیفە. هەربۆیە ناودەبرێـت بە شەوی خەلیفە ( ١٤ی ئەیلولی ساڵی ٧٨٦)ز[2].

لە كۆتایی ئەم بابەتەدا دەگەین بەوەی كە هـادی خەلیفەیـەكی بـاش نەبووە، چ لە كەسێتیدا كـە كەسـێكی تـوڕە و قـسە ڕەق بـووە، وە چ لـە كردەوەكانیدا : بە دورخستنەوەی دایكی لە بەڕێ كردنی كێشە و گرفتـی خەڵكی و دورخستنەوەی براكەی لە وەلی عەهدی و بریاری كوشتنیدانی لە زینداندا، ئەمە بەشێوەیەكی تایبەتی بەشێوەیەكی گشتیش خەلیفەیـەكی بێزراو بووە و خەڵكی خۆشیان نەویستووە.

---

[1] السيوطي : تأريخ الخلفاء ، ص٢٠٨.

[2] ميخائيل عواد: صور مشرقة من حضارة بغداد في العصر العباسي .

## مـــێژووی هــارون ڕەشـید

هارون ڕەشـید بـووە خەلیفـە لـە (١٤ی ربیـع الاول، سـاڵی ١٧٠ك ) لـە تەمەنی (٢٢)ساڵیدا، کاتێ ڕەشید بووە خەلیفە ڕۆژی جومعە بوو، خەڵکی ماڵـەکانیان چـۆڵ کـرد و لـە ناوچـەیەکی بەرفراوانـدا کۆبونـەوە . پیـاوان دروشــم و هوتافیــان دەکێــشا و ژنــانیش هەلهەلــەیان لێــدەدا، هــارون ڕەشیدیش بەناویاندا بەرەو پێشەوە دەڕۆیشت و لە دوایشیەوە ئەسپسوار هەبوون کە شمشێرەکانیان بۆ ئاسمان بـەرزکردبۆوە، لـە دوای دانیـشتنی لە شوێنێکدا تایفە و خێڵەکان سەردانیان کرد و بەیعـەتیان پێـدا، بەمـەش ڕەشـید بـووە یەکـەم خەلیفـە و یـەحیا کـوڕی خالیـدی بەرمـەکیش بـووە یەکەم وەزیری[١] .

مامۆســتا (عــەباس مــەحمود عقــاد) لــە بــارەی هــارون ڕەشــید و ســەردەمەکەیەوە دەڵـێ: (هـارون ڕەشـید سـوڵتانی دەوڵـەتی ئیـسلامی، بەپێی گێڕانـەوەکان لـە نمونـەی (ڕەمـسیس)ی دەوڵـەتی میـسری کـۆن و (لویسی چواردەهەم)ی دەوڵەتی فەرەنـسای نوێیـە. هۆکـاری ئەمـەش بـۆ ئەو گێڕانەوانە دەگەڕێتەوە کەبـە شـێوازێکی سـەرپێیانە و بـە گـشتی بـێ قوڵ بونەوە لە بارودۆخەکە ڕوداوەکانیان تۆمارکردووە.

ڕەشـید ئـەم سـەرکەوتنەی لـە بـەناوبانگی گەلەکەیـەوە بـە دەسـت هێناوە، کەهەنـدێك بەڕاسـتی باسـیان لێـوە کـردووە و هەنـدێکی دیکـەش زیـادەڕەوی، ئەمـەش لـە کـۆن و نوێـدا هەیـە. یەکـەم خەلیفـە بـووە کـە دەســتی داوەتــە نــاو مــاڵی خــۆی (دەوڵەتەکــەی)و گرنگــی داوەتــە دانیشتنەکانی شاعیران و ئەدەب دۆستان و گوێی گرتووە لـە بیروبۆچـونە

[١] د. محمد رجب البیومی : هارون الرشید ، ص٦١–٦٥.

جیاوازەکـان و دەسـەڵاتی بـەرفراوان کـردووە بـە ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئـاوادا، کەسێکی فیکر غامض نەبووە وەکو مـەئمون بـەڵکو کەسـێتیەکی شـەعبی بووە و سادەبووە لەگەڵ ئـەوەی کـە گرنگیـشی داوەتـە لایـەنی فیکـری و کردنـــــەوەی قوتابخانـــــەکان بــــۆ کــــاری دەرس وتنــــــەوە)[1].

## کـــەسێتی ڕەشـــــید

ئەگەر بێت و ئێمـەش لەسـەر هـەمان پێـوەری پرۆفیـسۆری مێـژووی ئیسلامی زانکۆی سلێمانی برۆین و بڵێین : ڕەشید ڕۆژی ١٠٠ ڕکـات نوێـژی دەکـرد و بـە ڕۆژووش بـوو ، هەمیـشە دانیشتنەکانیـشی زانـای پلەبـەرزی زانستە جیاوازەکانی تێدا بوو، شەویش لە دوای ئەوەی ڕۆژووی دەشـکاند و ئیمامەتی دەکرد بـۆ موسـڵمانان، ماڵەکـەی دەبـووە مـەلها و کەنیزەکـە بـــەڕۆژوو بوەکـــان و قورئـــان خوێنـــەکان ئەوانـــەی هـــەموو بەیانیـــەك هەڵدەستانەوە بۆ نوێژی بەیانی جلەکانیان لادەبرد و سەمایان دەکـرد بـۆ ئیمام و زانا و خەلیفەش، ئەگەر شەوێکیش سەمایان بۆ نەکردایـە ئـەوا تـا بەیانی خەوی لێ نەدەکەوت و پارشێویش هەڵدەستایەوە ڕۆژوی دەگـرت و نوێـژی بەیانیـشی نەدەچـوو. ئەگـەر بـەم پێیـەبێت ڕەشـید نەخۆشـیەکی نەفسی زۆر گەورەی بووە ! بـەڵام  ئەگـەر وابێـت چـۆن دەبێتـە (جـەباری بـەنی عـەباس)؟ چـۆن دەتوانێـت ئیـدارەی خیلافـەتێك بکـات کـە لـە ڕۆژهەڵاتـەوە تـاوەکو هیندسـتان و لـە ڕۆژئاواشـەوە تـاوەکو مـەغریبی دوور(مەغریبی ئێستا).

---

[1] عباس محمود العقاد: حیاة فیکري في عصر هـارون الرشـید ، عـدد الخـاص بهـارون الرشـید ، أول أغسطس . ١٩٤٠، ص١٠٩٣.

خاوەنی کتێبی (الامامة والسياسة: ١٨٦/٢)دەڵێ، ڕەشید: (شەوەکانی دابەش کردبوو بۆ حەوت بەش ، شەوێکیان بۆ وەزیرەکان و باسکردنی حاڵی خەڵکی و پرس و جۆکردن لەسەر کارە گرنگەکان و پرۆژەکانی دەوڵەت، شەوێکیشیان بۆ دیوانەکان و حساباتی ماڵی موسڵمانان و ڕێکخستنی و چاککردنی، شەوێکیش بۆ ئەمیر و سەربازەکان لە بارەی سەرکەوتن و هەواڵەکانی دەرەوە و پاراستنی سنورەکانی دەوڵەت. شەوێکیش بۆ دانیشتن لەگەڵ زانا و فەقیهەکان لە بارەی زانستەکان و دراساتە فیقهیەکانەوە، شەوێکیش بۆ قورئان خوێندن و عیبادات و پاککردنەوەی دڵ و دەروون و گوێگرتن لە ئامۆژگاری مامۆستایان، شەوێکیش بۆ ئافرەتان ڕابواردن و دانیشتن لەگەڵیاندا، شەوێکیش بەتەنها و لە خەڵوەتدا تاوەکو نەفسی سەرشۆڕبکات، ئەو شەوە نەدەبوو کەس لێی نزیك بێتەوە و بچێتە ژورەکەیەوە،......).

ئەمەش بۆ خۆی بریتیە لە قسەی پڕوپوچ و بێ مانا بەبەڵگەی ئەمانەی لای خوارەوە:

١. کەسێك شەوانە گوێ بگرێ لە ئامۆژگاری زاهیدان و زانایان و وتەکانیان و گفتوگۆیان لە بارەوە بکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە شەو کەیفی خۆی نەکەوێ و لەگەڵ ژناندا ڕابوێرێت. ئینجا ئەمە (شەهوەتبازی بەنی عەباسە ) یان (جەباری بەنی عەباس).

٢. باشە ئەگەر شەوەکانی ئاوا دابەش کردووە ، ئەی ئەم دابەش کاریە چی لێبکەین و چۆن لەگەڵ ئەم شەوانەی تردا بیگونجێنین ، کە ئیبن خەلدون دەڵێ:(ساڵێك دەچووە غەزا و ساڵێکیش حەجی دەکرد).

٣. ئەگەر كەسێكی ئاوا ئارەزوو باز بووە گریان لە كوێوە دێت؟ خۆ گریان و زیرەكی شتێك نیە هەر لە خۆیەوە دروست ببێت، خەلیفەیەك كە ئیدارەی ئەو هەموو ولاَتانەی پێدراوە چۆن لە هەفتەیەكدا سێ شەوی لە بێئاگای میللەتەكەی بەرێتە سەر (شەوێك بۆ ڕابواردن ، شەوێك بۆ خەلوەت ، شەوێك بۆ زوهد و عیبادەت).

مامۆستا (عومەر ئەبو نەصر) لە پێشەكی كتێبەكەیدا دەڵێ:(هارون ڕەشید لە ڕاستیدا كەسێتیەكی غەریب بووە ، وە ژیانی پڕیەتی لە نمونەی دژبەیەك، لە هەندێ كاتدا كەسێتیەكی دەست بلاَو و غەرقی ڕابواردنی خۆی بووە، لە حاڵەتێكی تردا بەهێزترین خەلیفەی ئیسلام بووە و موحارەبەی بەهێزترین دەسەلاَتی ئەوكاتە كە بیزەنتینەكان بون بكات و سەرانەیان بخاتە سەر ..... هەروەها لە لایەكی تریشەوە بەرامكەكان لە چوارچێوەی دەسەلاَتەكەیدا بون و یەحیاش وەزیری بوو . لەگەڵ خێزانیدا تەبا و دڵخۆش بووە ، لە هەمان كاتدا كەسێكی ئارەزوو باز بووە و لەگەڵ ژناندا ڕای بواردووە ...... بەناو بازارەكاندا ڕۆیشتووە و لە حاڵی خەڵكی پرسیوە ، وەكو عومەری كوڕی خەتتاب، هەوڵی دادپەروەری كۆمەلاَیەتی داوە و بەشێوەیەكی باش چەسپاندویەتی).

پاشان دەڵێ :(ئەدیب بووە ، فەقیە و زانا بووە، زانا و فەقیهەكانی لە خۆی نزیك كردۆتەوە و گرنگی بە زانست و ئاداب و هونەرەكان داوە، هەروەها خەلیفەیەكی زاهید و لە خواترس بووە ، پارێزگاری لە دروشمەكانی ئیسلام كردووە، لە نیوەی شەویشدا هەڵساوەتەوە بۆ

نوێـژکردن و قورئـان خوێنـدن هـەتاوەکو بەرەبـەیان، بێگومـان ئەمـە کەسێتیەکی غەریبە)[1].

نوسەر لە جیاتی ئەوەی کتێبەکەی بەشێوەیەکی شـیکاریانە بێـت و باس لـەو دەقانـە بکـات کـە مێـژوی ئـەم کەسـایەتیەیان شـێواندووە ، بـە هەمان شێوەی کەسەکانی دی دێتەوە سەر ڕێگـا بـێ گرفـت و بـێ مانـدوو بون دەقـەکان دەکاتـەوە بـە گـژی یـەکتردا و بـەوە کۆتـایی بـەو مەسـەلە دێنێت ( ئەم خەلیفەیـە بێگومـان کەسێکی غەریبـە)! ئـاخر بۆچـی؟ ئـەو کاریگەریانە چین کە مێژوی ئەم کەسایەتیەیان شێواندووە؟ کەس نازانێت ڕاستی کامیانە، ئەدەبیانە؟ مێژوویانە؟ فیکریانە؟ یان چۆن لە بابەتـەکان بڕوانین؟.

ئیبن خەلدون لە مێژووەکەیدا دەڵـێ:(ڕەشـید ئـارەق خـۆر نـەبووە و هاوەڵی زانایان و پیاوچاکانی کردووە، پارێزگاری لـە نوێـژ و عیباداتـەکان کردووە و هەستاوە بۆ نوێژی بەیانی لە کاتی خۆیدا، ساڵێ غەزای کردووە سـاڵێکیش حـەجی کـردووە . ڕەشـید بـادەی خورمـایی خـواردووە کـە سەرخۆشکەر نەبووە و لەسەر مەزهـەبی ئەوکاتـە حـەلاڵ بـووە و فـەتوای حەلاڵی دراوە، ئەگەر نا ئارەقی سەرخۆشکەری نەخواردۆتەوە و نـاگونجێ پیاوێـك لێپێـچینەوە بکـات لەسـەر حەرامـەکان ، کەچـی خـۆی یـەکێ لـە گەورەترین تاوانەکان ئەنجام بدات[2]). مێژوونوسـی گـەورەش ئـیبن ئەسـیر دەڵێ: (ئەمە لە کوێ هەستابێت بە خیلافەتکردنی بە دیـن و دادپـەروەری و هاوڕێیەتی زانایان و پیاوچاکان . ئەمە لە کوێ گفتوگۆی لەگەڵ (فەزیلی

---

[1] الهوى والشباب في عهد الرشيد، الطبعة الثانية ، ص ٥.

[2] تأريخ ابن خلدون،١/١٤.

کوڕی عیاز و ئیبن سماك و عـەمری)کردبێـت و گـوێی لـە ئامۆژگارییـەکانی (سوفیانی سەوری) گرتبێت، ئەمە لە کـویٚ دوعابکـات لـە کـاتی تەوافـدا و هەموو بەیانیەك ئامادەبێت بۆ نوێژی بەیانی[1]).

ئەبو حامدی غەزالیش دەڵێ:(شەقیقی بەڵخی چوو بۆ لای ڕەشید

_ ڕەشید: تۆ شەقیقی زاهیدیت؟

_شەقیق: من شەقیقم بەڵام زاهید نیم.

_ ڕەشید: ئامۆژگاریم بکە.

_شەقیق: ئەبوبەکر نمونەی ڕاسـتگۆیی بـوو، عومـەری کـوڕی خـەتتابیش جیـاوازی لـە نێـوان حـەق و باتڵدا دەکـرد ، عوسمـانی کـوڕی عـەففانیش نمونەی حـەیا و شـەرم و بەخـشندەیی بـوو، عـەلی کـوڕی ئـەبی تـالیبیش گەیشتبووە پلەی باڵا لە زانست و عەدلدا.

_ ڕەشید: زانیاری زیاترم پیٚ ببەخشە.

_ شەقیق: من ئەزانم لە دوارۆژدا ڕزگارت نابێت، تاوەکو حـەقی ئـەم سـیٚ شتە نەدەیت: (بەیتولمال ، شیلاق، شمشێر) ئەوانەی موحتاجی پارە بون و پارەیان پیٚ نەگەیشتووە، ئەوانەی سەرپێـچیان نـەکردووە و بـە شـیلاخ ئەدەب دراون، نەفسێکتان بە ناحەق و بە شمشێر کوشـتبێت، کـە دەبێـت بکوژرێتەوە بە ئیزنی وەلی کوژراو.

_ ڕەشید : پێم ببەخشە.

_ شـەقیق: ئێـوە وەکـو بنجـۆ و سەرچـاوەی ئـاوێکی زولاڵـن و تـەواوی زانایانی جیهانیش وەکو خواروی ئەو ئـاوەن، ئەگـەر سەرچـاوەی ئاوەکـە ساف و پاك بێت هیچ خراپیەك نیە ئەگەر لە خواریشەوە ئاوەکە لیٚلٚ بێت،

---

[1] ابن الأثير : الكامل في التأريخ ، ٥/١١٤.

بەلاّم ئەگەر سەرچاوەکەی لیّلّ بێت ئەوا هیچ کات سودی نابێت ئەگەر خواروی ئاوەکەش پاك بێت[1]).

ئیبن ئەسیریش دەلّیّ:(ڕەشید چوو بۆ عەمرە لە مانگی ڕەمەزاندا و گەڕایەوە مەدینە لە سالّی ١٧٩ك، لە کاتی حەجدا هەستا بۆ حەج لەگەلّ خەلّکیدا و ڕۆیشت بۆ مەککە لە وێشەوە بۆ مینا پاشان بۆ عەرەفات و تەواوی مەشاعرە دینیەکانی بە پیّ ئەنجامدا). پاشان لە کۆتایدا دەلّیّ: ڕەشید لە کەعبەدا بینراوە کە لەسەر پەنجەی پێیەکانی وەستاوە و دەیگوت:(یا من یملك حوائج السائلین، و یعلم ضمائر الصامتین، ان لکل مسألة منك ردا حاضرا ، و جوابا عتیدا، ولکل صامت منك علم محیط ناطق بمواعیدك الصادقة، وأیادیك الفاضلة، ورحمتك الواسعة، صل علی محمد وعلی ال محمد، واغفرلنا ذنوبنا، وکفر عنا سیئاتنا......... یامن خشعت له الأصوات بجمیع اللغات یسألونك الحاجات، ان من حاجتي الیك أن تغفرلي ذنوبي، اذا توفیتني ، وصرت في لحدي، وتفرق عني أهلي وولدي .... اللهم أحیانا سعداء، وتوفنا شهداء، واجعلنا سعداء مرزوقین، ولاتجعلنا أشقیاء محرومین).

واتە:

(ئەی ئەو کەسەی کە خاوەنی پێداویستیەکانی داواکارانی، ئەزانی چی لە ناخی بێدەنگەکاندایە، بۆ هەموو داواکاریەك وەلاّمێکی خێرا و تەواوت هەیە. بۆ هەموو بێدەنگێك زانستێکی فراوانت هەیە ، بە پەیمانێکی ڕاستگۆیانە و بە دەستێکی بەخششانە و بە ڕەحمەتێکی بەرفراوان. درودی خوا لە پێغەمبەر و ئالوبەیتەکەی لە تاوانەکانمان خۆشبە و

---

[1] التبر المسبوك في نصیحة الملوك : ٥/١ .

تاوانەکانمان بسڕەڕەوە....... ئەی ئەو کەسەی گوێ دەگریت بۆ هەموو زمانێك داوایەکت لێدەکەم ئەویش لێخۆشبونە لە گوناهەکانم کاتێ کە مردم و رۆیشتمە ناو گۆڕ و جیابومەوە لە ماڵ و منداڵم. خودایە بە بەختەوەری بمانژێنە و بە شەهیدی بمانمرێنە، خودایە بمانکەیتە بەختەوەرێکی رۆژی دراو نەك دڵتەنگێکی بێ بەری کراو[1]).

ئەبو مەعالی کلابیش لەبارەیەوە دەڵێ:

فمن يطلب لقاءك أو يرده فبالحرمين أو أقصى الثـغور

ففي أرض العدو على طمر وفي أرض البنية فوق كـور

وما حاز الثغور سواك خلق من المستخلفين على الأمـور

مێژونوسی سوری (محمد کرد علی) لە بارەی ئەو توهمە و ناشیرینکردنانەی لەسەری دروستکراون، دەڵێ:(ڕەشید لە دانیشتنەکانیدا لەگەڵ فەقیه و موجتەهیدین و زانایاندا باسیان لە شتە حەرامکراوەکان کردووە و بەپێی تەواوی زانایانی ئەو کاتە کەسێکی دیندار بووە. دەی ئەگەر وایە چۆن لە دانیشتنەکانیدا دەتوانێ کاری لادەری ئەنجام بدات.[2]...).

ئیبن خەلدونیش بەهۆی موتەئەسیر بونی بە وەسیەتەکەی ڕەشید، بەشێکی بۆ تۆمارکردوین و دەڵێ:(ڕەشید وەسیەت بۆ ئەحمەر دەکات کە ناوی عەلی کوڕی مبارکە: ئەی ئەحمەر! ئەمیری باوەڕداران دەیدا بە تۆ گیانی خۆی و بەرهەمی دڵی، تۆش با دەستت فراوان بێت ، مل کەچی تۆ بۆ ئەو واجبە(بەمەرجێ لەسەر حەق بێت) و لەو شوێنەدا ئامادەبە کە

---

[1] الكامل ، ٢٣١/٥.

[2] مجلة الهلال ، العدد الخاص بالرشيد ، ص ١١٠٠، أغسطس ١٩٤٠

ئـەمیری بـاوەڕداران داینـاوی، قورئـانی بـۆ بخوێنـە و هـەواڵی پـێ بـدە و شیعری بـۆ بخوێنـەوە و سـوننەتەكانی فێـر بكـە ، لـە كـاتی قـسەكردنیدا ئاگاداری بە و لە كاتی دەست پێكردنیدا رێگری بكە لە پێكـەنین جگـە لـە كاتە تایبەتیەكان، ئاوا فێری بكە كاتێ گەورانی بەنی هاشـم هـاتن بـۆ لای بـە گـەورە سـەیریان بكـات و ئـەو دانیـشتنانە گـەورە ڕابگـرێ كـە سەركردەكان تێیدا ئامادەن. هەموو ساتێك سـودی پـێ ببەخـشە و فێـری شـتی بەسـودی بكـە جگـە لـەو شـتانەی لـە زیهنیـدا كـۆی كردونەتـەوە، قەدەغـەی مەكـە لـە یارمەتیدانـەكانی و لەكاتـە بەتاڵەكانیـدا لەگـەڵی بـە، ئەگەر گوێڕایەڵی كردیت بە نەرم و نیانیەوە هەرچی باشە پێی بڵێ ئەگـەر نا بەتوندی و توڕەییەوە پێی بڵێ و مل كەچی بكە[1][*]).

## ڕەوشــتی ڕەشیـد لە نێوان كتێبە مێژوویی و كتێبە ئەدەبیەكاندا

لێكۆڵەر ناتوانێت بۆ ڕیوایەتی فەرمودەكانی پێغەمبەر بگەرێتەوە بۆ كتێبە ئەدەبیەكان ، لەبەر ئەوەی فەرمودە ڕێبازی تایبەتی خۆی هەیە لە ڕیوایەتــدا. زانــستێكی جیایــە پەیوەســت بەخۆیــەوە ، لــە نێــو فەرمودەكانیـشدا فـەرمودەی جیاجیامـان هەیـە وەكـو (مرفـوع، متـصل، موقــوف، مقطــوع، مرســل، مــسند، ضــعیف، منقطــع، مــدلس، شــاذ، منكر،.......). بەڵام ئەم ڕێكوپێكردنە لە ڕیوایەتـە مێژوییەكانـدا نـابینرێ، هەربۆیە توشی ئەم كێشە گەورەیە هاتوین لە مێژوی ئیسلامیدا.

---

[1] ابن خلدون: مقدمة ، ص٦٣٣.

[*] ڕەشید مەبەستی كوڕەكانیەتی ، كە دوای خۆی دەبنە ئەمیری باوەڕداران

لێکۆڵەری گەورە مامۆستا (اسد رستم) مامۆستای مێژوو لە زانکۆی (اللبنانیـــة) کتێبێکـــی باشـــی دانـــا بـــەناوی (مـــصطلح التـــأريخ) تیایـــدا شیکردنەوەی کردووە بۆ دەقە مێژووییەکان لەسەر بنچینەی لێکۆڵینـەوە و ڕاستکردنەوە ، ئەمەش یەکەم مێژونوسە کە هەوڵی لەو جۆرەی دابێت لەو بـــوارەدا تـــاوەکو هەريـــەك لـــە نمونـــەکانی (ابـــن الأثـــير ، القفطـــي ، المقريـــزي،...)بخرێنـــە تـــای تـــەرازووەوە. لـــە پێـــشەکیەکەدا ئـــەوە ڕون دەکاتەوە کە مەرجیعی سەرەکی بۆ کتێبە مێژووییەکان دەبێ ئـەو کەسـە گوماناوی نەبێت و هەروەها کتێبە ئەدەبیەکان بە هیچ شێوازێك بەشـداری نەکـەن لـەم بـوارەدا ، وەکـو (پەخـشانەکانی العقـد الفريـد ، محاضـرات الأدبـاء، المـستظرف) کـە ئەوپـەری لێکـدژیان تێدایـە، هـەروەها کتێبـی (الأغاني)ش بـە هـەمان شـێوە لێـدانێکی گەورەیـە لـە مێـژوی ئیـسلامی ، گێڕانەوەکانی هیچ ڕاست نـین و شـیکراوە نـین و تـەواوی لێکۆڵـەرەوانیش لەسەر ئەوەن کـە ئـەم کتێبانـە سەرچـاوەیەکی دروسـت نـین بـۆ مێـژوو و نابێت پشتیان پێ ببەسترێت، بەڵکو تـەنها وەکـو شـیعر یـاخود پەخـشان ئـەتوانرێ سـودی لێوەرگیرێـت، ئەگـەر نـا بـەهیچ شـێوازێك بـۆ کەسـێتی خەلیفـــەکان و ئـــەمیرەکان و ســـەرۆك لەشـــکرەکان و هەواڵـــەکانی ئـــەو سەردەمانە سودیان لێوەرناگیرێت.

دکتـــۆر (ئەحمـــەد ئـــەمین)یـــش لـــەژێرناوی (دوو وێنـــە)دا دەڵێ:(جیاوازیەکی دژبەیەکی گەورە هەیە لە نێوان وێنـەی ڕەشـید لـەلای مێژونوسانی وەکو تەبـەری و ئـیبن خەلـدون و ئـەبی یوسـف لـە خـەراج و وێنەی ڕەشید لە ألف ليلة وليلة و الأغاني و اعلام الناس فيما وقع للبرامكة مع بني العبـاس. لەوێنـەی یەکەمیانـدا ڕەشـید پیاوێکـە لـە دژی ڕابـواردن

ڕاوەستاوە و لەوێنەکانی دووەمیشدا پیاوێکە غەرقی ڕابواردن بـووە ، کـە پێم وایە وێنـەی مێژونوسـەکان ڕاسـتە بـەڵاّم نوسـراوە ئەدەبیـەکان زیـاتر ئازادانەتر نوسراون[1]). ئەحمەد ئەمین کتێبی (هـارون الرشـيد)ی لـە سـاڵی (١٩٥١)زدا نوسیوە دوای بیست ساڵ کتێبـی (ضـحى الاسـلام)ی دانـا ،لـە بەشی یەکەمی کتێبەکەیدا باس لەوە دەکات کە کتێبـی (الأغـاني)لـە ڕوی گێڕانەوەکانیەوە جێگای ڕەخنە لێگرتنە.

الطحـاوي دەڵـێ:(بیـستومە لـە بکـا کـوڕی قوتەیبیـەوە دەیـوت : بیستومە لە هلال کوڕی یەحیا کە بینیویەتی : کـاتێ تـەوافی مـاڵی خـوام دەکرد ، هارون ڕەشیدم بینی تەوافی دەکرد لەگەڵ خەڵکیدا و پاشـان بـۆ نیازکردن چووە ژورەوە[2]).

ئـیبن عەبدولحەکـەم دەڵـێ بیـستومە لەمالیکـەوە دەیـوت:(ڕاوێـژی پێکردم ڕەشید لە سێ شتدا قبوڵم نەکردن : الموطأ لە کەعبـەدا دابنرێـت. الموطأ بکرێتە مەرجەعی خەڵکی و خـەڵکی لەسـەری بـڕۆن، مینبەرەکـەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خراپ بـووە و بێڵێـت چـاکی بکەنـەوە بـە ئاڵتون و زیو . ڕەشیدیش بەگوێی کردم[3]).

ئـیبن سمـاکیش لـە یـەکێ لـە ئامۆژگاریەکانیـدا بـۆ هـارون ڕەشـيد [4]دەڵێ:(ئەی ئەمیری باوەڕداران ، تـەنها لـە خـوا بترسـە ، بزانـە سـبەینێ ڕائەوەستێنرێی لە بەردەمی خوای گەورەدا ، پاشان ئەتگەیەنن بـە یـەکێ

---

[1] هارون الرسيد ، ص١٨٣.

[2] التقي الغزي: الطبقات السنية في تراجم الحنفية، ١٦٩/١.

[3] الذهبي : سيرأعلام النبلاء ،٩٨/٨ .

[4] ئەم ئامۆژگاریانە ئیبن سماك لە کتێبەکانی (البدايـة والنهايـة ، تـأريخ الأمـم والملـوك ·الطـبري)دا هاتووە.

لەم دوو شتە کە سێهەمیان نیە: بەهەشت یان دۆزەخ .....ڕەشیدیش دەستی کرد بە گریان).

لە دانیشتنێکی تردا ، ڕەشید داوای ئاوی کرد و خواردیەوە و سوپاسی خوای کرد . پاشان ئیبن سماك بە ڕەشیدی وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران چی لە پێناودا ئەدەی ئەگەر خواردنەوەت لێ قەدەغە بکەن ؟!. ڕەشیدیش وتی : نیوەی ماڵەکەم . ئیبن سماکیش وتی: ئەگەر بیخۆیتەوە و بەڵام نەچێتە لاشەتەوە ، چی لە پێناودا ئەدەی ؟!. ڕەشید وتی : نیوەکەی تری ماڵەکەم. ئیبن سماك وتی: هەموو ماڵەکەتدا بۆ ئاو خواردنەوەیەکی باش ، ئەی بۆ یەك هەناسەدان ؟!

یەکێ لە پاشایانی (سند) هۆگری مشتومڕ و موناقەشە بوو داوای لە ڕەشید کرد کە یەکێکی بۆ بنێرێت تاوەکو لە بارەی هەندێ مەسائیلی عەقائیدیەوە مشتومڕبکەن، ڕەشیدیش خێرا وەفدێکی نارد و دانیشتنێکی گەورەیان سازدا ، لە کۆمەڵی وەفدەکە پرسیاریان کرد: ئایا خوا قادرە لە هەموو شتێکدا ؟ وتیان: بەڵێ ، بێگومان . سندیش ووتی : ئایا توانایی هەیە وەکو خۆی دروست بکات ؟ وەفدەکە وەڵامیان نەدایەوە و وتیان : ئەمە مەسائیلێکی زانستی کەلامە و ئێمە دژی ئەوەستین. گەڕانەوە بۆ بەغداد و ئەوەی کە بوو گێڕایانەوە. ڕەشید توڕەبونێکی زۆر گرتی و ووتی: کەسێك نیە بەرگری لەم دینە بکات ؟ وتیان : بەڵێ ، ثمامە کوڕی ئەشرس بۆ ئەمە چاکە. ڕەشیدیش ناردی بۆ سند، کاتێ سندی پرسیارەکەی کرد خێرا ثمامە وەڵامی داوە و وتی: ئەمە مەحاڵە چونکە

دروستکەر کۆنە ئەگەر وەکو خۆی دروست بکات تازەیە و وەکو خۆی نیـە ! بەمەش سیندی بەزێنراو مەجلیسەکە کۆتای هات[1] .

ڕەشـــید دژی موناقەشـــە بـــووە بـــە تایبـــەتی لـــە مەســـائیلی یەکتاپەرستیدا و دەیگوت: پێویست بەوەها دانیـشتنێك ناکـات. بـەلاّم بـۆ ئەو موناقەشەیەی کە هاتە پێشەوە دەیگوت: (لێدانی ئاسن بە ئاسن).

هارون ڕەشید ویستی بۆچونی خۆی دەربارەی لابردنی ئەو زیادانـەی لە مینبەرەکەی پێغەمبـەردا و دروسـتکردنی قادرمـەی زیـاتر لـە دەورانـی موعاویەدا دەرببرێت بۆ ئیمام (مالك) ئەویش لە وەلاّمـی ئەمـەدا پێـی وت: (کـاری وا مەکـە ئـەی ئـەمیری بـاوەڕداران ، مینبەرەکـە لـە داری بـچوك دروستکراوە و بەشەکانی جیادەبنەوە ، ئێمە هێشتومانەتەوە تەنها وەکـو پیرۆزیەك بـۆ ئـەو کەسـەی لەسـەری دائەنیـشێت، ئـەو پیرۆزیـە لەدەسـت ئەدات کە دەستکاری بکـەیت، هەرکەسـێکیش لـە دوای تـۆ هـات دەڵێـت: پێویستە بۆ مینبەرەکەی پێغەمبەر ئـەوە و ئـەوە بکرێـت ، یـان لەوانەیـە پێشنیاری ئەوە بکرێت بگوازرێتەوە لە مەدینەوە بۆ پایتـەخت بـۆ ئـەوەی ببێتە مینبـەرێك بۆ خەلیفە، هارون ڕەشیدیش وەلاّمی دایـەوە: باشـە ، بـا وازی لێبهێنرێت . ئەم فەرمانـەی ئیمـام مالیـك بـووە دەلاقەیـەك بـۆ سـەر والیەکان و وەلاّمێکیش بۆ پێشنیارەکەی ڕەشید و ئەویش ملکەچی بوو).

مامۆسـتا (محمـد ئەحمـەد عرفـە) کـە یەکێکـە لـە گـەورە زانایـانی ئەزهـەر ، لـەژێر ناونیـشانی( بـين التـشريع والـسياسة في عهـد الرشـيد)دا دەڵێ:(لە دەورەی هـارون ڕەشـیددا مالـك کـوڕی ئەنـەس (زانـا و ئیمـامی

[1] البغدادي: المنية والامل ، وەرگیراوە لە کتێبی (د.شعوط ، ص٣٦٠). ئێمەش لـە د. محمـد رجـب البيومي : هارون الرشيد ، ص٩٨.

مەدینە) بەیعەتی بە هارون نەداوە و هەربۆیە گیراوە و بۆ ماوەیەکی زۆر لە زیندانـدا لێـی دراوە تـاوەکو شـانەکانی داکـەوتون . ئـەم ڕوداوە بـەو شێوازە بڵاوکراوەتەوە و وتراوە کە لەسەردەمی هارون ڕەشیددا و لەسـەر دەستی والی مەدینە (جەعفەر کوڕی سلێمان) بەڵام ئەم کارە لەسـەردەمی ئەبوجەعفـەری مەنـصوردا ڕویـداوە و هـیچ پەیوەندیـەکی بەسـەردەمی ڕەشیدەوە نیە). بۆ زانیاری زیاتریش ئەتوانن بگەڕێنەوە بۆ ئـەو بابەتـەی مامۆسـتا کـە بـڵاوی کردۆتـەوە ، چـونکە لـە ڕاسـتیدا هـیچ مـشتومڕ و لێکدانەوەیەکی خراپ لە نێوانیاندا نـەبووە و ئیمـام هـیچ جـۆرە لێـدانێکی بەرنەکەوتووە .

لەبارەی هەڵوێستی ڕەشید لـە بەرامبـەر ئیمـامی شافیعیـشەوە، بـە هـەمان شـێوە هەڵوێـستێکی دژ و ڕق لێبونـەوە نیـە و ڕوداوەکـەش بـەم شێوازەیە:(ئەو کات حاکمی یەمەن حماد بربری بـوو کـە شـافعیش نـاکۆك بوو لەگەڵیدا لە هەندێ کردەوەی دەربارەی ستەملێکراوان، هەربۆیە حماد نوسـی بـۆ ڕەشـید: عەلەوییـەکان جوڵانـەوەیان ئەنجامـداوە لـە یەمـەن و پیـاوێکیش کـە کـوڕی شـافع کـوڕی سـائب لـە بـەنی موتەلیبـە فـەرمان وەرناگرێت و نەهیشیان لێناکات، ڕەشیدیش فەرمانیدا: سـەرۆکەکانی ئـەو شۆرشە دەستگیر بکەن و لە نێویشیاندا (محمد کـوڕی ئیـدریس شـافیعی) تێـدا بـوو. پاشــان بـران بـۆ بەغـداد ولـە کـاتی دادگاییەکـەدا کـاتێ سەرەگەیشتە ئیمامی شافیعی وتی بـە ڕەشـید: ئـەی ئـەمیری بـاوەڕداران ڕات چـیە دەربـارەی دوو پیـاو، یـەکێکیان وەکـو بـرا سـەیرم بکـات و یەکێکیشیان وەکو کۆیلە (بەندە) کامیان بۆ من خۆشەویستن؟ ڕەشیدیش وتی : ئەوەیان وەکو برا سەیرت دەکات، شافیعی وتـی: تـۆ ئـەی ئـەمیری

باوەڕداران کوڕی عەباسن، ئەوانیش کوڕی عەلین ، ئێمە برای ئێوەین لە بەنی موتەلیبەوە وئێوە وەکو برا دەمان بینن و ئەوانیش وەکو بەندە سەیرمان دەکەن. ڕەشیدیش دانیشتنەکەی هێورکردەوە و لێی خۆش بوو).

لە بارەی ئەم ڕوداوەشەوە (دکتۆر محمد ڕەجەب بیومی)دەڵێ:(شافیعی دەقیق بووە لە قسەکانیدا کاتێ دەڵێ: رات چیە لە کەسێك وەکو برا سەیرم بکات و یەکێکیش ئاوا سەیرم نەکات) لەبەرئەوەی کوڕانی عەلی کوڕانی (بەنی مطلب)یان وەکو بەندە نەدەبینی بەڵکو وا سەیریان دەکردن کە شایەنی خیلافەت نەبن. واتە لێرەدا دەمانەوێ ئەوە بڵێین لەم دەقەدا ئەوەی ئیمامی شافیعی دەیڵێ لە بارەی ڕوانینی (بەنی طالب بۆ بەنی مطلب)وەکو کۆیلە ڕاست نیە ، بەڵکو وشەی (کۆیلە : لەلایەن غولاتی شیعەوە بەکاردەبرا بۆ قوڕەیشیەکان (بەنی موتەلیب)).

ئەوانەی وا باس لە سزادانی ئیمام دەکەن لەلایەن ڕەشیدەوە و دەڵێن:(لەبەرئەوەی ئیمام لە زۆرێك لە مەسائلەکاندا خیلافی ئیمام ئەبوحەنیفە بووە، هەندێ لە توندڕەوەکانیش دەڵێن کە ئەبایوسف ئیشارەتی داوەتە ڕەشید کە فەرمانی کوشتنی شافیعی بدات، هەروەها (محمد کوڕی حەسەن)یش لەبەر ئەوەی هەردوکیان قوتابی ئەبوحەنیفە بون بۆیە ئەمیش لەسەر ئەم کارە سوربووە و پشتگیری لە ئەبایوسف کردووە کە ئیمام سزا بدرێت) بەڵام لە ڕاستیدا ئەبا یوسف ئیمامی شافیعی نەبینیوە و مردوشە بە دوو ساڵ پێش ئەوەی ئیمام بهێنرێت بۆ بەغداد محمد کوڕی حەسەنی شەیبانیش بەهۆی ئەو ئەخلاقیاتە جوانانەی

که هـەیبون لـه (بەخـشینی زۆرینـەی ماڵەکـەی بـه هـەژاران ، وتاربێـژ لـه مزگەوتی جامع، کەسێکی دۆستخواز، هەروەها بونی پێگەیەکی گـەوره لـه فیقهـداو قـازی قازیـان ) ناگونجێـت ڕوداوێکـی لـەو جـۆره بـونی هـەبێت ، بەڵکو دروستکراوی مەزهەبچیەکانه تاوەکو یارانی هەردەستەیەکیان بکەن به گژی ئەوی تریاندا.

ئیبن موبارەك له بارەی سـەردەمەکەی ڕەشـیدەوه دەڵـێ:(لـه هـیچ سەردەمێکدا ئەوەندە زانا و قورئان خوێن و خێرکـەر نـەبووە، بەڕادەیـەك پارێزگاری له حەرامکراوەکان بکرێت که هیچی کەمتر نـەبێت لەسـەردەمی دوای مردنی پێغەمبەر و خەلیفەکانی و هاوەڵان ). ڕێژەی قورئان خوێنـان و فیقه زانان و فەرمودەناسان زۆر زیادی کردبوو له چاو سـەردەمانی دی، ئەمـەش بـۆ ئـەو بزوتنـەوە فیکریـە دەگەڕێتـەوە کـە ڕەشـید تـوانی لەسەردەمەکەی خۆیدا زیاتر گەشەی پێبدات به پێدانی ئازادی بـه هـەموو فیکـره جیاوازەکـان و دەرگاکردنـەوە بـە ڕوی فیکـره جیاوازەکـانی تـری میللەتانی جیاواز.

ئەوەی جێگای سەرسامیشه ئەوەیه ئەو خراپکاریانـەی کـەوا زەق و دیار و بەرچاو دەکەون و زیـاتر باسـیان لـه بـارەوە دەکـرێ لـه دەوڵـەتی عەباسیدا ڕێك ئەو دەورەیه که به سەردەمی زێڕین ناسراوە لـه مێژوویانـدا که له نێوان ساڵانی(١٣٢–٢٣٢)ك درێژدەبێتەوە.

ئەوانەی ئەم لایەنه له مێژوی ئیـسلامیدا زەق دەکەنـەوە سەرچـاوە سـەرەکیەکانیان (هـەزار و یەکـشەوە و ئـەغانی)ە کـه هـیچ لایـەنێکی زانـستیان تێدا بـەدی ناکرێـت تـاوەکو بـۆ ڕاسـتیه مێژوییـەکان پـشتیان

پێببەسترێت، لەبەر ئەوەی ئەو کەسایەتیانەی کە (ئەبی فەرەج [*])پشتیان پێدەبەستێت و بۆ ڕاستی ڕوداوەکان دەیانهێنێتەوە کەوتۆتە هەڵەیەکی

---

[*] أبو الفرج الأصفهاني (٢٨٤-٣٥٦ك/ ٨٩٧-٩٦٧ز)

ناوی (ئەبوفەرەج عەلی کوڕی حسین قرشی ئومەوی)ەلە ئەصفهان لە دایك بووە و لە بەغداد گەورە بووە . مێژونوسان ڕای جیاوازیان هەیە لەسەر ڕەچەڵەك و ئاینی و دەڵێن فارسیە هەندێکی دیکە دەڵێن عەرەبە، هەندێك دەڵێن موسڵمانە و لەسەر مەزهەبی شیعی زەیدیە و هەندێك دەڵێن نەصرانیە، هەروەها دەڵێن (١٨)دانراوی هەیە و گرنگترینیان (ئەغانی)یە . شاعیرێکی مەست و سەرخۆش بووە و هەر سێ زمانی (فارسی و عەرەبی و سریانی )زانیوە و ئەمەش ڕەنگی داوەتەوە لە کتێبەکەی (الاغانی)دا . ئەغانی تێکەڵکردنی کلتور و ڕۆشنبیریەکانی (یۆنانی و ڕۆمی و عەرەبی و فارسی و سریانیە )، بێ گوێدانە دینەکان (جولەکە ، مەسیحی ،موسڵمان،..)، بێ گوێدانە ریزبەندی چینایەتی (ژن _پیاو ، کەنیزەك_کۆیلە ،ڕەش _سپی، دەوڵەمەند_هەژار،..).بڕوانە/ أحمد بوحسن : حوار الثقافات في كتاب الأغاني لأبي الفرج الأصفهاني.

ئیبن نەدیمیش لە (الفهرست)دا دەڵێ:(الاغانی الکبیر نزیکەی ٥٠٠٠ وەرەقەیە ، لە کتێبەکانی تریشی کتاب مجموع الاثار والأخبار ، أشعار الاماء والمماليك ، الحمارين والحمارات ، صفة هارون، الفرق والمعيار ،.......). ص١٦٢. ئیبن خەلدونیش لە بارەی ئەغانیەوە دەڵێ: دیوانی عەرەبیە لە مۆسیقاژەنان و شیعر و شاعیرەکاندا). هەروەها لە نوسراوێکی (عەبدولرەحیم مودن)دا لەژێر ناوی (هەندێ دیمەنی گێرانەوە لە لە بەرگی یەکەمی کتێبی ئەغانی ئەبی فەرەجی ئەصفهانی)، دەڵێ : گێرانەوەکان دوو جۆرن:

١. گێرانەوەکە هاتووە لەو کەسەی ڕوداوەکەی بەسەردا هاتووە ، یان کارەکەی ئەنجام داوە .

٢. پشتاوپشتی ئەو لەوی وەرگرتووە ،ئەویش بەشێوەیی : أخبرني _ حدثني _ أنشدني. لە گرنگترین گێرانەوەکانیش:

١. السند : ئەویش دامەزراوە لەسەر دوو شێواز :

+مبنی للمعلوم.

+مبنی للمجهول.

٢. الخبر : ئەویش لەسەر دوو جۆرە :

+هەواڵەکان لەسەر کەسایەتیەکان پۆلێن کراوە. بۆ نمونە ( أخبار ابن سريج ، یان نصيب ، یان ابن محرز،..)

+هەواڵەکان بە پێی ڕوداوەکان پۆلێن کراوە.

گەورەوە لە سات و کات و سەردەمیان و شوێن و پلەو دەسەلاٌتیان ، ئاخۆ تا چەند توانیویانە شایەتی ئەو ڕوداوانە بدەن لە کاتێکدا لەو دەورەیەدا نەژیاون یان ئەسلەن لەو پلەیەدا نەبون تاوەکو ئاگاداری حاڵەتی لەو جۆرە بن.

لەئەنجامی وەرگێڕانی هەردوو کتێبی (هەزار و یەکشەوە * و

---

بەلاٌم لەگەلٌ ئەوەشدا (ڕەخنەی ئەدەبی ) زۆری لێگیراوە لەسەر ئەو پۆلێن کاریانە لە (أخبار فلان فلان) کە باس لە ڕوداوی دەورەی ئومەوی دەکات کە خۆی لە عەباسیشدا ژیاوە ...... یان لە ریوایەتی کەسەکاندا کە کەسەکان بەناوبانگ نین و زانیاریان لە بارەوە نەدراوە یان پچڕانیان تێدایە ئەمە جگە لەوەی بە گشتی کتێبەکە کتێبێکی ئەدەبیەو ناچێتە قالٌبی مێژوییەوە و بە هیچ شێوازێك ئێمە ناتوانین نمونەی ڕوخانی میرنشینی بابان لە چامەکەی (سالم)ەوە ببینین و لێکی بدەینەوە..... ئەمە سەرەرای ئەوەی کە چاپەکان جیاوازیان تێدا چ لەناوچە عەرەبیەکان و چ لەناوچە خۆرئاواییەکاندا . بۆ نمونە رۆژهەلاٌتناسی ئیتالٌی لە سالٌی (١٨٩٥)ز کاتێ ئەم کتێبەی وەرگێررا چەندین پەراوێز و ڕای جیاوازی لەسەر دەقەکان دەربڕی و شیکردنەوە و پۆلێنکاری و ڕەخنەی زۆری لێگرت. هەروەها لە بەرگی پێنجەمی سەدەی ١٣دا کاتێ لەلایەن خۆرئاواییەکانەوە وەرگێررا، بەرگی کتێبەکە وێنەی پیاوێکی ڕیشدار و قەلٌەوە کە بەژن دەورەدراوە لە تاریکیەکدا.

بڕوانە/ حنا الفاخوری : التأريخ الأدب العربي ، ص٥٨١–٥٨٥ . ابن النديم: الفهرست ، ص١٦٢.

* هەزار و یەکشەوە : باس لە پاشایەك دەکات بەنێوی (شەهریار) کە لەدوای ئەوەی ژنەکەی دەبینێ خیانەتی لێدەکات بۆیە هەرژنێك دەبینێ دەیخوازێ و پاشان دەیکوژێ . خەلٌکی ناوچەکەش لەمە بێزار دەبن و دەستی کچەکانیان دەگرن و شوێنەکە چۆلٌ دەکەن . کاتێ شەهریار داوا لە وەزیرەکەی دەکات کە کچێکی لێ مارە بکات ، ئەویش دەچێتە شارەوە و دەبینێ کەس نەماوە و مەملەکەت چۆلٌ بووە پاشان دێتە مالٌ و بەسەرهاتەکە دەگێرێتەوە، لەوێ شەهرزادی کچی قبولٌ دەکات کە ببێتە ژنی کە کچێکی زۆر زیرەك و شارەزا بووە کە نزیکەی (١٠٠٠)کتێب لە ژورەکەیدا بووە، پاش ئەمە ئیتر هەزار و یەکشەوە دەست پێدەکات ، کە باس لە بونی ئەو توانا گەورەیەی ئافرەت دەکات کە چۆن لەسەر پەتی مردن چیرۆك دەگێرێتەوە و یاری بەپیاو دەکات ، باس لەو زمانە گەورەیەی ئافرەتان دەکات لە گێڕانەوەی چیرۆك و سەرنج ڕاکێشانی پیاواندا و لەبەرامبەردا پیاوێکی دلٌڕەق و گوندە و عیناد کە تەنها توانای هێز و بازووە . دەلٌێن هەزارویەکشەوە باسکردنە لە توانای زمانی چیرۆك و ئەدەب و گفتوگۆ بەسەر گوندەیی و توانای

ئـەغانی) لەلایـەن خۆرئـاواوە لەسـەر دەسـتی ڕۆژهەڵاتناسـەكان، وێنـای ڕۆژهەڵات لەدیدی خۆرئاواوە دەبێتە وێنای ناوچەیەك كە پڕە لـە ژنـی بـێ كراس و خەلیفە و پیاوی شەهوانی . هەربۆیە تـەواوی نوسـەرانی خۆرئـاوا كـاتێ لێكۆڵینـەوە و باسـی خۆیـان لـەبارەی خۆرهەڵاتـەوە دەنوسـن سەرچـاوەی سـەرەكیان بریتـی دەبێـت لـەو دوو كتێبـەو ئەمـەش دەبێتـە مێژوویەك و دەچێتە قاڵبی ئەكادیمیەوە كە لەڕاستیدا هیچ ئەكادیمیـەتێك و ڕاستیەكی تێدانیە.

دكتۆر (زەكـی موبـارەك) لـە رسـالەی دكتۆراكەیـدا كـە لـە زانكـۆی (سـوربون)وەری گـرت لەسـەر (النثـر الفـني في القـرن الرابـع: پەخـشانی هونەری لەسەدەی چوارەمدا[1]).بەشێكی تایبەت كردووە بە (ئەغانی)یـەوە ، لەوێدا باس لەكەسایەتی ئـەبی فـەرەج دەكـات و دەڵـێ:( كەسـێكی زۆر

---

هێـز و بـازودا. بەمـەش شـەهریار دەبێتـە دیلـی شـەهرزاد و شـەو لـە دوای شـەو دەیخلافێنـێ و سەرگەرمی دەكات .

له پێشەكی عەرەبیەكەی هەزار و یەكشەوەدا لە باسی دیاریكردنی ناوی دانەری ئەم كتێبـەدا دەڵێ:(بنەمایەكی زانستیانە نیە بۆ دیاری كردنـی نوسـەری ئـەم كتێبـە ، وەك هەنـدێ جـار كتێـب دراوەتە پاڵ (ئەبونواس یان جحا)، بۆیە لێكۆلەران بەهیچ شێوەیەك نەگەیشتون بەوەی ئەم كتێبە كێ نوسیویەتی. مەسعودی لە كتێبی (مروج الذهب) دا دەڵێ:(ئەم كتێبە لە هیندستانەوە هـاتووە و كتێبێكـی وەرگێـرراوە لـە زمانـەكانی فارسـی و هینـدی و ڕۆمانیـەوە ، ناویـشی (هـەزار و یـەك ئەفـــسانەیە) كـــە بـــە زمـــانی عـــەرەبی( الـــف خرافـــە)دەگەیـــەنێت. هـــەروەها دەڵـــێن (الجهشیاری)نوسـیویەتی كـە نوسـەری كتێبـی (الـوزرا)یـە ،ئـەم كتێبـەی بـەناوی (هـەزار شـەوانی شەوچەرە) ی عەرەبی و عەجـەمی و ڕۆمیـەوە دانـاوە ، كـە حیكایـەتخوانان كـۆڕی شـەوانیان پـێ گەرم كردووە . لە كۆتایشدا دەڵێ:(ئەم كتێبە چیرۆكەكانی تێكەڵن لە ئەفسانەی فارسی و هینـدی و تـوركی و میـسری قـاهیرەی). بڕوانـە/ هـەزار و یەكـشەوە یـان هـەزار و یـەك ژن ؟! لـە سـایتی www.mesopotamia.com . هەزارو یەكشەوە : بەرگی یەكەم ، ل١٧. گۆڤاری (التراث الشعبي ، العدد الفصلي الأول –شتاء /١٩٨٩ز. عدد خاص عن الف ليلة وليلة.

[1] د.ذكي مبارك: النثر الفني في القرن الرابع ،ط٢، ج١/٢٣٥.

زیادەڕۆبووە لەلایەنی ڕابواردن و هەوەسبازیدا، ئەمەش لە کتێبەکەیدا دیاری دەدات کەکتێبی (ئەغانیە). کە یەکێکە لەوکتێبانەی هەواڵی لادەرانە و هەوەسبازییە لەنێو شاعیر و والی و دەسەلأتدارەکاندا .....
زیاتر هەوڵەکانیشی لەوەدا چڕکردۆتەوە کە لایەنی لاوازیان لە مەسەلەی ئەخلاقیدا بخاتە ڕوو. وە گرنگی نەداتە لایەنە جددی و ئاشکراکەیان، بۆیە کتێبێکی لەو جۆرە جێگای باوەڕنیە و ناتوانرێ وەکو دەقێکی ڕەسەن و باش ئیعتمادی بخرێتە سەر).

## بزوتنەوەی فیکری لە دەورانی ڕەشیددا

بزوتنەوەی فیکری لە دەورانی عەباسیەکاندا بناغەکەی لە مەنصورەوە دەست پێدەکات و لە ڕەشیددا قایم و تۆکمەتر دەبێت و دەگاتە دوا پلەی بەرەو پێشچونی لە دەورانی مەئموندا.

لەو زانایانەی کە هاودەمی ڕەشید بون ، ئەمانەن:

١. ئەبایوسف:

دەرکەوتنی زانایانی بواری فیقه لە دەورەی ڕەشیددا وێنەیەکی ناسراوی سەردەمەکەیەتی ئەمەش بۆ ئەو پێداگریەی خەلیفە دەگەڕێتەوە لە کارکردنی بە قورئان و سوننەت و هەروەها دراسەکردنێکی نوێ لەسەردەقە شەرعیەکان لە بارەی کارەنوێکانەوە ،وەکو (بازرگانی و باجدان و خەراج و .....). هەربۆیە ئیدارەتێکی نوێی پێکهێنا لە دەوڵەتدا لەسەر فەتوادانی شەرعی بۆ مەسائلە پێشهاتەکان.

ڕەشید لە ئەنجامی سەرسامیەوە بۆ زانست و شارەزایی (ئەبا یوسف) کردیە قازی قازیان لە دەوڵەتەکەیدا، دیارترین خزمەتیشی بریتی

**بوو لە کتێبەکەی (خەراج [*])کەبە دیاری بەخشیە ڕەشید، پاشتریش هاوڕێکەی (محمد کوڕی حەسەنی شەیبانی)جێگای گرتەوە.**

**٢. محمد کوڕی حەسەنی شەیبانی**

**بە یەکێك لە فەقیهە دەرکەوتووەکانی دەورەی ڕەشید دەژمێردرێ کە توانیویەتی ببێتە پارێزگارێك بۆ فیقهەکەی ئیمام ئەبو حەنیفە و توانیویەتی مەزهەبەکەی لە چەند کتێبێکدا کۆبکاتەوە بە سودوەرگرتن لە ئیمام مالیك لە مەدینە و ئەوزاعی لە شام ، لە ئەنجامی ئەم هەوڵەشەوە توانرا مەزهەبەکەی ئیمام بهێڵرێتەوە و درێژەی هەبێت ، بە پێچەوانەی مەزهەبەکەی ئیمامی ئەوزاعی لە پاش وەفاتی خۆی مەزهەبەکەشی بەرەو نەمان چوو بەهۆی نەبونی کەسێکی دڵسۆزەوە کە کارەکەی بۆ بکاتە نوسراو و بڵاوی بکاتەوە . لە بەناوبانگترین کتێبەکانیشی (المبسوط، الزیادات، الجامع الصغیر، الجامع الکبیر،...)، هەروەها بە یەکەم کەس دادەنرێ کە یاسا نێودەوڵەتیەکانی دانابێت و لە بارەی پەیوەندیەکانی ئاشتی و شەرەوە لەگەڵ وڵاتانی دەرەکیدا دوابێت ، ئەمەش بۆ خۆی تاکو ئێستا جێگای سەرسوڕمانی پیاوانی یاسا نێودەوڵەتیەکانی هاوچەرخە.**

---

[*] کتێبی (خەراج) یەکێکە لەو کتێبە زۆرباشانەی کە ڕونکردنەوە دەدات لەسەر هەندێ دیاردە کە لە دەوڵەتدا بە دیاردەکەوتن و ناشیرینیش بوو نەتوانرێ مامەڵەیەکی جوانی لەگەڵ بکرێ . هەربۆیە ئەبایوسف بەشێوەی ڕونکردنەوە و ساغکردنەوەی ئەو دیاردانە لە دیوی شەرعیەوە باسی لە بارەوە نوسی، لەوانە(مافی دەسەلأتداران لەسەر خەڵکی یان دیاری کردنی پلە و دەسەلأتی ئیمامی موسڵمانان ). بەشێکی دی پرسەکانیش لە شێوازی پرسیارو وەلأمدا بوو کە ڕەشید پرسیار کەر بوو ئەبایوسف وەلأمدەرەوە بوو ، لەوانە (حوکمی دزی، شایەتی دانی درۆ یان ڕاست ، ڕەفتارکردن لەگەڵ زیندانیاندا، ئەوانەی لەسەر زینا یان دزی گیراون،.....). بڕوانە/ د. حاکم المطیری : ئازادی یان تۆفان ، و: فاتح سەنگاوی، ل٥٠١–٥٠٧.

هەروەها یەکێکی دی لەو خالآنەی ئەم زانایەی گەورە کردووە ، ڕێزگرتنی ڕەشید بوو لە زانایان، ئەم ئیمامەش بەبێ هیچ ڕوداماێ و بێ پەردە قسەی لە ڕوداکردووە ،کە خۆی لەخۆیدا ئەمە بێ فیزی و لێبوردەیی ئەم خەلیفەیە دەردەخات. دەگوترێ رۆژێکیان خەلیفە لە پلەیەك سەروتری زانایانەوە گوێی بۆ قسەکانیان گرتبوو ، محمد کوڕی حەسەنی شەیبانیش هەستاوە و چوو لەبەردەمیدا ڕاوەستاو پێی وت: تۆ دەبێ لەبەرامبەر ئەهلی زانستدا لە پلەی خزمەتگوزاریدا بیت، ڕەشیدیش ڕەزامەندی نیشاندا و دابەزیە خوارەوە.

بەلأم ئەوەی جێگای ئاماژە بۆ کردنە بریتیە لەو قسە دروستکراوانەی کەوا هەڵبەستراون بۆ ئەم ئیمامە بەرێزە لە هەڵوێستی بەرامبەر بە ئیمامی شافیعی، کە دەڵێن بۆتە ناخۆشیان و محمد کوڕی حەسەنیش بێ ئەدەبی و قسەی ناشیرینی بە ئیمام شافیعی وتووە. بەلأم لە راستیدا پەیوەندی و مشتومڕی ئەم دوو کەسایەتیە بەرێزە بریتیە لە مشتومڕێکی زانستیانە لە بارەی هەندێ مەسائلی شەرعیەوە و دوورە لە هەر ناخۆشیەك و جنێودانێك ، خودی مشتومڕەکەش لە هەریەکە لە (مناقب الشافعی)ئیمامی (ڕازی)و دکتۆر ئەحمەد ئەمین کە ئەویش لەمەوە گواستویەتیەوە لە بەشی دووەمی کتێبەکەیدا (ضحی الاسلام)دا تۆمار کراوە.

٣. مالیکی کوڕی ئەنەس:

ئیمامی مالیك لە (موطأ)داهیچ جیاوازیەکی نەکردووە لەنێوان فیقه و فەرمودەدا و لە فەتواکانیدا پەیوەست بووە بە دەقی فەرمودە و قورئانەوە . فەرمودە لە دیدی ئیمامەوە فیقهێکی ئاشکرایە. هەروەها

سەرچــاوەیەکی ســـەرەکی خەلیفـــەکانی عەباســـی (ڕەشـــید و ئـــەمین و مەئمون)بۆ فەرموده بریتی بووه له (موطأ)ەکەی ئیمام مالیك.

ئیمام وەلیددین دەهلـەوی، خـاوەنی (الحجـة البالغـة) دەڵـێ:(کتێبـی موطأ ، ڕاسترین و بەناوبانگترین و لەپێشترین کتێبە، موطأ بنچینەیەکە بۆ مەزهەبــەکانی تــری (ئــەبی حەنیفــه ، شــافیعی، ئەحمــەد)، ئــەوەشمان لەیادنەچێت دابەشکاری فەرمودەکانی هەریەکـه لـه (صـحیح مـسلم، سـنن أبي داود، صحيح البخاري، جامع الترمذي)، له موطأەکەی ئیمام مالیکەوه وەرگیراوه[1]).

ڕەشـید لـه گرنگیـدانی بـه زانـسته عەقڵیـەکان ، مـاڵێکی دامەزرانـد بەناوی (خانەی حیکمەت) و (یوحنا کوڕی ماسـویه)ی کـرده ئـەمینی ئـەو ماڵە ، ئەوانیش هەستان به وەرگێڕانـی بڕێکـی زۆر لـه کتێـب و زۆرترینـی کتێبەکانیش له بواری پزیـشکیدا بـون و بڕێکیـشیان فەلـسەفی بـون. ئـەو کتێبانــەی وەرگێــڕدران زیــاتر لــه بەرهەمــەکانی(ئەرســتۆ ، جــالینۆس ، ئبقرات)بوون.

جبرائیل کـوڕی بختیـشوعیش پزیـشکی تایبـەتی بـوو. مێژوونوسـان لــەبارەی زیرەکیــەوه ڕوداوێــك دەگێرنــەوه و دەڵــێن:(جــارێ یــەکێ لــه کەنیزەکەکانی ڕەشید وتـی نـاتوانێ کـار بکـات و دەسـتی توشـی شـەلەل بووه، خەلیفەش جبرائیلـی بـانگ کـرد تـاکو بزانـێ چـیەتی، کـاتێ دکتـۆر بینی زانی که نەخۆشیەکەی شتێکی وەهمیه و بۆ خۆی دروستی کـردووه، بۆیه بۆ کەشـفکردنی مەبەسـتەکەی دانـەویوه گوایـه داوێنـی کەنیزەکەکـه

[1] مقدمة الموطأ،ص(ح). تحقيـق:محمـد فـؤاد عبـدالباقي. بـەلام مـن لـه کتێبەکـەی د.محمـد رجـب البيومی وەرگرتووه.

بەرزدەکاتەوە، کەنیزەکەکەش لە حەیبەتی خۆیدا ئاگای لـە خـۆی نـەما و بـەو دەسـتەی کـە دەیـوت شـەلەلیەتی بـەرگری کـرد). ئـەم ڕوداوە جگـە لـەوەی کـە نمونەیەکـە بـۆ زیرەکـی دکتـۆر ، نمونەیەکیـشە بـۆ بـەدینی کەنیزەکەکان و دوریان لە هەرکارێکی ناپەسەند و نەشیاو.

## بزوتنـــەوەی ئەدەبی لە دەورانی ڕەشیـــددا

ڕەشید گرنگیەکی زۆری دەدا بە زانایـانی (زمـان و ئـەدەب و نـەحو)، بۆیە دەبینین لـە زۆربـەی دانیـشتنەکاندا زانایـانی ئـەم بـوارە ئامادەبیـان هەبووە چونکە زۆر کاریگەر بوو بە زانایانی بواری زمانەوانی و ڕەوانبێژی، ئەوەتا لە کتێبی (المغـني[1])دا هـاتوە: شـەوێ ڕەشـید پرسـیارێکی فیقهـی نوسی بۆ قازی ئەبویوسف بەم شێوازە:

فإن ترفقي يا هند فالرفق أيمن

وان تخرقي يا هند فالحزق أشام

فأنـت طلاق والطــلاق عزيمــة

ثلاث ،ومن يــحزق أعـق وأظــلم

ئەبا یوسفیش لە وەڵامدا نوسیویەتی :(ئەمە کێشەیەکی نەحوی فیقهیـە). بەڵام دیارە بە جوانی لێی تێنەگەیشتووە. تەنانەت هەریەکە لە (کەسـائی و ئەحمەدئەمین)یش شیکاری زۆر جیاواز لە یەکتریان بۆ کردووە.

ڕەشـید زۆر حـەزی لـە ڕەخنـەگرتن بـوو لـە شـیعردا بەتایبـەتی لـە شیعری مەدحکردن چونکە خۆشی لە شیعری مەدحکردن نـەدەبینی و زۆر جاریش نەیدەهێشت تەنانەت بیخوێننەوە . کاتێ دەڵێین حەزی لـە شـیعر بووە مەبەستمان لە شیعری ئەو شاعیرانە نیە کـە لـە (ئـەغانی)دا هـاتووە

---

[1] ابن هشام: المغني ، تحقيق: محمد محي الدين عبدالحميد ،١/٥٣.

،لەنمونـەی (محمـد کـوڕی منــاذر ، مـسلم کـوڕی وەلیـد، ئـەبی عتاهیـە ، مەنسوری نمێری ، مەڕوانی کوڕی ئەبی حەفصە ، عەباس کوڕی ئەحنەف ، موصلی ، عتابی،.....).بەڵکو مەبەستمان لەو شاعیرانەیە کە لـە کتێبـە مێژوییەکانـدا باسـیان لـە بـارەوە کـراوە ،کـە جێگایـان بۆتـەوە لـە نێـو کۆشــــکەکەی خەلیفــــەدا و لـــــە ڕوی ئەخلاقیــــەوە کەســــانێکی بــــاش بون،ئەوانیش:

١. سەهل کوڕی هارون:

سەهل کوڕی هارون لە دوای ئیبن موقەفەع و پـێش جـاحظ ژیـاوە و بەهێزیەکی باشی بووە لە مەنتیقدا، بەڵام نەك بەشێوەی جاحظ. خـاوەنی ڕوحێکی دانـایی بـەهێز بـووە لـە وتاربێژیـدا و لـەلای ڕەشـیدیش شـوێن و پێگەیەکی باشـی بـووە لـە بـەیان و ڕونکردنەوەکانـدا و کەسـێك بـووە لـە کـاتی قـسەکردندا ترسـی ڕاونـاوە، پاشـتریش بـووە نوسـەری یـەحیای بەرمەکی . بەڵام بەهۆی هۆگری بە مەئمونەوە لە دەورانـی ئەمینـدا نیـە و پاشـتر لـە دەورەی مەئمونـدا دەبێتـە کەسـێکی زانـا و سەرپەرشـتیاری وەرگێڕانە (فارسی و ڕۆمانی و یۆنانیەکان).

٢. ئەصمەعی:

لە بواری چیرۆکە شیعرەکاندا و بـە زمـانێکی شـیرین دانیـشتنەکانی ڕەشیدی دەرازاندەوە لەگەڵ دۆستانی وەك(ئەبی عوبەیدە و ئـەبی زەیـد) بەڕادەیـەك دانیـشتنەکانیان جـوان ببـوو کـە شـافیعی بلێـت:(انـه بلبـل في روض).

لـە بەصـرە گـەورە بـوو پاشـان چـووە لادێ و لـەوێ ژیـا لـەلای دەشتەکی و زانایانی ئەوێ تاوەکو شارەزاییەکی باشی پەیداکرد لە (زمان

و شیعر و مێژوو)دا . بەصرە بۆ بەغداد بۆ ئەصمەعی زۆر دوور بوو بەڵام لە دوای دەرکەوتنی ناوبانگی لەلایەن ڕەشیدەوە بانگکرا بۆ بەغداد. یەکەم دانیشتنیشی لەگەڵ ڕەشیددا وەکو هەڵسەنگاندنێ بۆ زیرەکیەکەی لە (خزانە الادب ی بەغدادی) و (أمالي المرتضي)دا بە دوور و درێژی نوسراوەتەوە. لە دانیشتنەکاندا ململانێیەکی زۆر بەهێز لەنێوان شاعیر و ئەدەب دۆستاندا ڕوی دەدا وەك نمونەی ئەم ململانێیەی (ئەصمەعی و کەسائی):

ئەصمەعی دەڵێ: مانای ئەم وتەیە چیە:

قتلوا ابن عفان الخليفة محرما

و دعا ملم أر مثله مخذولا

کەسائیش وتی: ئەمە چیە؟ باس لە حەرامکراوی حەججە. ئەصمەعیش ئەمەی بە هەلزانی و وتی : ئەی حەرام لە کوێی ئەم وتەیەی شاعیردا هەیە:

قتلوا كسرى بليل محرما فتولى لم يمتع بكفن

ئایا ئەمەش مەبەست لە حەرامکراوی حەججە؟ کەسائیش دەمی تەتەڵەی کرد و هیچی پێنەوترا. .... ئینجا ئەصمەعی وتی: ئەمە لە من وەرگرە: وتەی شاعیری یەکەم : کوشتنی عوسمانی کوڕی عەففانە ، کە کوشتنەکەی حەرام بوو لە دیدی حەرامی ئیسلامدا ،وە ڕۆژانی حەجیش نەبوو. پاشان دەڵێ:

وتەی شاعیری دووەمیش: باس لە حەرامی کوشتنی کیسرا دەکات ، کاتێ کە بەڵێنی پاراستنی وەرگرت لێیان کە بیپارێزن بەلاّم کوشتیان، ئیتر کەسائی لە دوای ئەمە بێ دەنگ بوو.

٣. ڕەبیعە ڕەقی:

لە قەسیدەیەکدا ، لە وەسف و مەدحی عەباس کوڕی محمد کوڕی عەلیدا دەڵێ:

| | |
|---|---|
| لو قيل للعباس يــا بن محمد | قل: لا، وأنت مخلد ما قالها |
| ما ان أعد من المكارم خصله | الا وجدتك عـمها أو خالهـــا |
| واذا الملوك تسايرت في بلــدة | كانوا كواكبها وكنت هـلالهـا |
| ان المكارم لــم تزل معقــوله | حتى حللت براحيتك عقالهــا |

عەباسیش لە بەرامبەر ئەو قەسیدەیەدا ،دوو دیناری بۆ نارد . ئـەمیش بـە نێردراوەکەدا ئەمەی بۆ نوسی:

| | |
|---|---|
| مدحتك مدحه السيف المحلى | لتجري في الكرام كما حريت |
| فهبها مدحه ذهبت ضياعـــــا | كذبت عليك فيها وافـــــتريت |

کاتێ ئەم بەیتـە گەیشتەوە بـە عـەباس ، زۆر تـورە بـوو ، بەشـێوەیەکی خێرا فەرمانیدا بنێردرێت بۆ لای ڕەشید تاوەکو سزا بدرێت، بەڵام ڕەشـید بـەبێ ئـەوەی یەکسەر فـەرمانی کوشـتنی بـدات، وتـی: چـیت کـردووە؟ ئـەویش وتـی: قوربـان قەسـیدەیەکم لـە وەسـف بـۆ نـاردووە ، هـەروەکو شـاعیرەکانی تـر کـە بـۆ خەلیفـە و ئـەمیرەکانی دەنێـرن. پاشـان ڕەشـید قەسیدەکەی خوێندەوە و وتی: وەڵڵاهی شـیعرەکەت یەکێکـە لـە شـیعری شاعیرە باشەکان. پاش ئەمە ئیتر عەباس بێدەنگ بوو، ڕەشـیدیش وتـی: لەمەولا لەلای خۆم دەتهێڵمەوە، وتی: قوربان بە دوو دینار؟!. ڕەشیدیش زۆر تورە بوو و سەیری دەم و چاوی عەباسی کرد و پێی وت: لە بەرامبـەر ئــەم قەسـیدەیەدا دوو دینــارت بــۆ نــاردووە؟! پاشــان فەرمانیــدا بــە خزمەتکارەکەی کە (٣٠)هەزار درهەمی پێ بدەن و ڕێزی لێبگرن.

دکتۆر تەها حسین لە کتێبەکەیدا دژبەیەکیەك بەدی دەکرێت کاتێ لـە سـەرەتادا بـاس لـە هەریەکـە لـە (ئـەبونواس و بـشار)دەکـات و دەڵـێ:(ئەمانـە شـیعری لـەزەت بـەخش و سێکسیان نوسـیوە) ، ئەمـەش دەکاتـە پێـوەری ئـەوەی کـە بڵێـت (ئـەبونواس) ناوبـانگی هـەبووە و شیعرەکانی لە نێو خەڵکیدا جەماوەری زۆر بووە و خـەڵکی بـە دوایانـدا گەڕاوە، تەنانەت دەڵێ بەهۆی چێژوەرگرتن لـە شـیعرەکانی ،خـەڵکی لـە میسر و شامەوە دەهاتن بۆیان. واتە وێنای کۆمەڵگای ئیسلامی دەکات بە کۆمەڵگایەکی سێکسی. پاشتر هەربۆ خۆیشی دەڵێ :(ئەم جـۆرە شـیعرانە لەلایەن کۆمەڵگاوە نـەخوازراوبون و تەنانـەت کۆمـەڵێك لـە خەلیفـەکانیش دژی ئەمە بون ، بە تایبەتی هەریەکە لە ڕەشید و مەئمون).

مامۆستا دکتـۆر (محمـد حـسین عەبدولحـەلیم) کورتـەی تـەواوی ئـەو جیاوازیانەی هێنـاوە ، کـەوا لـەنێو خـودی ئـەو کەسـایەتیانەدا هەیـە، لـە کتێبی (بين التـدوين والمجـون في شـعر العباسـي ، چـاپی یەکـەم، ١٩٨٦). یەکـــەم نـــاکۆکیش کـــە دەیهێنێتەوەلـــە نێـــوان مێژونوســـی گـــەورە مامۆستا(ڕەفیق عەزم )و مامۆستای گەورە (دکتۆر تەها حسین)ە.

لە پاش نوسینی بابەتەکەی (تەها) ، ڕەفیقیش هەسـتا بـە وەڵامدانـەوەی لە رۆژنامەی (الـسياسة)دا ، بـۆ جـاری دووەمـیش مامۆسـتا تـەها وەڵامـی دایەوە ، پاشان رەفیقیش وەڵامی دایەوە. وەڵامدانەوەکەش بـەم شـێوازە بـوو، مامۆسـتا ڕەفیـق دەڵـێ:(کـاتێ تـۆ نمونـەی چـیرۆکی و شـیعری ئەبونواس دەکەیتە پێوەر بۆ ئەو سەردەمە کە خۆی یەکێکـە لـە شـاعیرە سەرخۆش و بێ هۆشەکان .لەگەڵ ئەوەشـدا ئـەم دەقانـە (موضـوع)یـن و

هـیچ کـات بـەهای مێـژویی و وێنەیـەکی ڕاسـتەقینەی ئـەو سـەردەمەمان پیشان نادەن).

پاشان مامۆسـتا (ڕەفیـق عـەزم) کتێبێکـی گـەورەی (٧٠٠)لاپـەرەیی نوسی بەناوی (أشهر مشاهير الاسلام في الحرب والسياسة) تيايـدا بـاس لـە کەسـە ناودارەکـانی ئیـسلام دەکـات لـە (هـاوەڵان و شـوێنکەوتوانیان) وەك:(ئەبوبـەکر و عومــەر و عوسمــان و عەبــدوڵڵای کــوڕی عومــەر و ........... پاشـانیش لـە پێـشەنگی شـوێنکەوتوانیان هـارون ڕەشـیدی داناوە....).

لـە پێـشەکی (شـعر الـدعوة الاسـلامية في العـصر العباسـي الأول: د. عەبـدولڕەحمان پاشـا)، لێکۆڵینـەوەی (مامۆسـتا عەبـدوڵڵا جـەعیـثن)دا ، نوسراوە:(هەریەکە لە بشار و حماد کوڕی عجرد و ئـیبن ضـحاك و ئـەبی نواس جێگایان نەبۆتەوە لە دەوڵەتی ئیسلامیدا ، بەهۆی کـارە ناپەسـەند و شـیعرەکانیانەوە . بـشار کـوڕی بـرد: لـەژێر زەبـردا مـرد بـەهۆی زەندیقیەوە، حماد کوڕی عجـرد: بـەفێڵ کـوژرا لـە ئـەهواز، حـسین کـوڕی ضـحاك: ژیـا بـە ئـاوارەی دوور لـە بەغـداد لـە ترسـی مـەئمون، بـەڵام بەنیسبەتی ئەبونواسەوە، لەلایەن ڕەشیدەوە چەند جارێك زیندانی کـراوە و هــەروەها لــەدەورەی ئــەمینی کوڕیـشیدا بەهــەمان شـێوە)، پاشــان وتەیـەکی تـەها حـسین دێنێتـەوە :(کـە ئـەبونواس چۆتە سـەر مینبـەری خوراسان و لە پاش ئـەوەی شیعرێکی خوێندۆتـەوە لـە بـارەی شـەراب و ڕابواردنەوە، خەڵکی دەیانوت: ئەوە شاعیرەکەی ئەمینە!).

پاشتر دکتۆر پاشا لە شیکاری مێژوییانـەی خۆیـدا دەڵـێ:(مێـژوی دەوڵەتی عەباسی لە دەورەی ڕەشـید و ئەمینـدا زۆر دوور نیـە لـە مێـژوی

وەلیـدی کـوڕی یەزیـد(١٢٥ك) و هـەردوکیان لـە سـەدەیەکدا بـون. وەلیـد لەسەر ئەوەی بینرابوو عـارەقی خواردۆتـەوە ، یـان وەکـو هەنـدێ دەڵـێن زینای کردووە، لەلایەن کەسوکارەکەی خۆیەوە کوژرا. کەچی پاش چـەند ساڵێك عارەق خواردنەوە و بەدئەخلاقی تەواوی کۆمـەڵگا بگرێتـەوە و بـێ پەردە باسی ئەو دیاردانە بکرێت! !).

عەبـدوڵلا عـەفیفی لـە بابەتێکـدا لـەژێرناوی (اخـر صـفحة مـن کتـاب العظائم[1]) دەڵێ:(ئەمین کوڕی هارون ڕەشید، کەسێکی لادەر و بەدڕەوشت و ئارەق خۆر و مەسرەفکەر و دەرچـوو لـە دیـن نیـە، بـەڵکو لەبەرئـەوەی هاشمیــە و عەرەبــە هەربۆیــە شــیعە و فارســەکان درۆ و بوختانیــان بــۆ دروستکردووە و شتی ناقابیلیان خستۆتە پـەنا کـە شـیاوی کەسـێتی ئـەو نین)، بۆ نمونە دەوترێ کەسێکی بەڕەڵا بووە (وەکو لە نوسـراوەکانی لای خۆماندا دەوترێ نێرباز بووە)، باشـە ئەگـەر وایـە خەلیفـە نێربـاز بـووە و کۆمەڵگاش بەجارێ توشی داروخـانی ئـەخلاقی هـاتووە یـان هـەر بەتـەنها خەلیفەی گرتۆتەوە ، چۆن یەکێ لە ئیمامەکان لە نوسەرەکان، باسـێکیان لـەو بارەیـەوە نەنوسـیوە ؟! بۆچـی خـەڵکیان لـەو داروخـانی ئەخلاقیـە ئاگادارنەکردۆتـەوە؟! ئەگـەر وەڵامـت ئـەوە بێـت کـە نـەیانوێراوە، ئـەوا منیش دەڵێم :(لەم بێ دەسەڵاتی ئیمـام و زانایانـەدا، لەسـەدەی بیـست و بیـست و یەکـدا، لەنمونـەی حەســەن بــەننا و ســەیدقوتب و مــەودودی و نەدەوی و شەعراوی و غەزالی و محمد ئەبوزەهرە و ... چۆن توانیـان دژی بەدئەخلاقی دەسەڵات و داروخانی ئەخلاقی کۆمەڵگا بوەستنەوە).

---

[1] عبدالله عفيفي: المرأة العربية ، ١٩٤/٢.

لێرە گەیشتینە ئەوەی کە هاوەڵانی ڕەشید بەپێی (ئەبو فەرەجی ئەصفهانی): بشار و موتیع و ئەبونواس و ئیبن زوحاك و ئیبن عجردە ! ! بەپێی سەرچاوە مێژووییەکانیش: مالیك و شافیعی و ئەبایوسف و ئەوزاعی و کەسائی و ئیبن موبارەك و محمد کوڕی حەسەنی شەیبانی هاودەم و هاوسەفەری بوون.

## دەستووری دەوڵەت لە دەورەی ڕەشیددا

شێخ محمد خزری بك لە کتێبی (محاضرات في تأريخ الأمم الاسلامية الدولة العباسية[1])دەڵێ:(هارون ڕەشید ، پێنجەم خەلیفەی موسڵمانان لە بەنی عەباس ، لەگەڵ قازی قازیان ئەبایوف ،هەوڵیاندا: دادپەروەری بچەسپێنن لە کۆمەڵگادا و کاروبارەکانی وڵات ڕێکبخەن لەسەر سوننەتی رەسولی خوا و خەلیفەکانی ڕاشدین ، هەروەها نابێت مافی ڕەعیەتەکان بخورێت و دەبێت سزای ئەوانە بدرێت کە سزای ڕەعیەتەکانیان دەدەن. لەگەڵ گرنگیدان بەلایەنی بیناسازی و دابەشکردنی بەیتولمالی موسڵمانان بۆ بەرژەوەندی گشتی و پاراستنی سنورەکان و ئەمینی و ئاسایشی ڕێگا و بانەکان).

بەپێی تەواوی سەرچاوەکان لەبارەی سیستمی وڵاتەوە لە دەورەی ڕەشیددا دەوترێت:(بەهۆی کاریگەری ئەبایوسف و محمدی کوڕی حەسەنی شەیبانیەوە لە تەواوی کاروبارە سیاسیەکانی وڵاتدا دەگەڕایەوە بۆ دەقی کتێبی خوا و فەرمودەی پێغەمبەر و کردەوەی سەلەفی ساڵح و خەلیفەکانی ڕاشدین).

---

[1] ص١٨٨.

دکتۆر ئەحمەد ئەمینیش دەڵێ:(عەباسیەکان توانیویانە نەك تەنها سیاسی بن بەڵکو توانیویانە سیاسی و دینیش بن، ئەمەش بەهۆی کاریگەری کەسانی وەك: مالك و ئەبی حەنیفە و سوفیانی سەوری ، کە خەڵکی توانیویەتی بە گشتی ڕاوبۆچونی تایبەتی خۆی هەبێت[1])، هەروەها لەبارەی ڕێکخستنی دەوڵەتیشەوە هەستا بە دانانی نیزامی زەریبە و هەڵکەندنی خەندەق بە چوارچێوەی دەروازەی شاری بەغدادداو قایمکردنی شارەکان و دابینکردنی ئاسایش بۆ شارەکان و ڕێك و پێککردنی چۆنیەتی وەرگرتن و کۆکردنەوەی باجەکان و ڕێکخستنی نیزامی دیوانەکان، تەواوی ئەمانەش لە کتێبی (خەراج)دا باسی لێوەکراوە و لە ڕوانگەی قورئان و سوننەتەوە چارەسەری بۆ دانراوە و ڕونکراوەتەوە.

لەبارەی باسکردنی چۆنیەتی نامەناردنی ئەم خەلیفەیە بۆ کاربەدەستان میرو ئەمیران و دەسەلأتدارانی ولأتانی دیکە ، بەم شێوازە لەو بارەیەوە نوسراوە:

(ئەبو هلال عەسکەری لە کتێبی الاوائل دا هاتووە : یەکەم کەس نوسی لە بارەی نوسراوەکانەوە لە نوسراوەکانی پێغەمبەر و سەلەف و هاوەلأن و شوێنکەوتوانیان قس کوڕی ساعدە ئیادی بوو ، کە دەڵێ: پێغەمبەر بەم شێوازەی دەنوسی : لە محمد رسول الله وە بۆ فلأن پاشان ئەبوبەکری صدیق لە خیلافەتەکەیدا دەینوسی : لە ئەبوبەکری جێنشینی رسول الله صلی الله علیه وسلم بۆ فلأن، پاشان عومەر دەینوسی: لە عومەر کوڕی خەتتابی خەلیفەی رسول الله صلی الله علیه وسلم بۆ فلأن، پاشان نازناوی

[1] أحمد أمين: ضحى الاسلام ، ١٦٣/٢.

ئەمیری باوەڕدارانی زیاد کرد لە وتنەکەیدا و هەروەها عەبدوڵلاّیەکیشی پێش عومەرەکە خست، بەم شێوازە: لە عەبدوڵلاّ عومەر ئەمیری باوەڕدارانەوە بۆ فلاّن، پاشان تاوەکو دەگاتە ڕەشید و دەڵێ: ڕەشید بە یەحیای کوڕی خالدی بەرمەکی وت: دەمەوێ لەسەرەتای نوسراوەکاندا بنوسرێ : لە هارون مەولای (لە زمانی عەرەبیدا بە واتای کوڕی مامیش دێت) محمد رسول الله وە بۆ فلاّن، یەحیاش وتی خوا جەزای خێرتان بداتەوە ئەی ئەمیری باوەڕداران[1]).

## پەیوەندیە دەرەکیەکانی

١. لەگەڵ ڕۆم:

ڕەشید لەدەورەی مەهدی باوکیدا کرایە سەرکردەی سوپای موسڵمانان و فەرمانی پێدرا کە هەستێت بە فەتحکردنی قوستەنتنیە لە ولاّتی ڕۆم. ماوەی شەڕ دوو مانگی خایاند کە زیاتر خۆی لە گەمارۆداندا دەبینیەوە ، تاوەکو ناچار بە ڕێکەوتن بون و ئەمەش لەساڵی ١٦١ك دابوو ، کە بەبەشداری یەکەم و سەرکەوتنی ڕەشید دەناسرێ لە مێژودا. بەلاّم پاشتر پاشگەزبونەوە و پابەندنەبون بە پەیمانەکەوە و بۆیە سوپا ڕێکخرایەوە بە سەرکردایەتی هارون. ئەوەبوو ئەمجارە تاوەکو کەناری قوستەنتنیە چون و بەمەش تەواوی ولاّتەکەی خستە مەترسیەوە ، بەتایبەتی وەك ئاشکرایە ئەم شارە پایتەختی دەوڵەتی بیزەنتی بوو، بۆیە دایکی پاشا(ئیرینی)کە ببووە وەلی عەهدی کوڕەکەی ، وەفدی ناردە لایان و پێی ڕاگەیاندن کە بەڕێکەوتن ڕازین و ساڵانەش فیدیە بدەن.

---

[1] صبح الأعشى: ٢/ ٤٩٨.

پــاش مردنـــی مەهــدی لــە قوســتنتنیەش مەلیکــە(نقفــور:نیــوەی ڕۆژئاوا)هاتە سەرتەختی دەسەڵات. ئەم مەلیکەیە ، ئیرینـی بـە کەسـێکی لاواز و بێ دەسەڵات دەبینی کە بەوەها ڕێکەوتنێك قایـل بـووە، بۆیـە لـەو پەیمانــە پاشــگەزبۆوە و دەســتی بــە دروســتکردنی قەڵایــەکیش کــرد لــە تەنیـــشتی دەســـەڵاتی شـــارلمان پـــشای فرنجـــە(نیوەکـــەی تـــری ڕۆژئـاوا).پاشـانیش نامەیـەکی تونـد و زبـری ئاراسـتەی ڕەشـیدکرد:(ئـەو شاژنەی پـێش مـن تـۆی وەك (روخ: دالّ) و خۆیـشی وەکـو(بیـدق:مـراوی) دانابوو، پارە و سامانەکانی خۆی دەدایـە تـۆ ، کـە تـۆ قـابیلی نیوەیـشی نــەبوی. ئەمــەش لەبــەرلاوازی ئافرەتانــەی. جــا کــاتێ ئــەم نامەیــەت خوێندەوە هەرچیت پێشتر لە ماڵ و سامان وەرگرتـووە بیگێـرەوە ئەگـەر نا شمشێر لە نێوانمانـدا دەبێـت). ڕەشـید کـاتێ نامەکـەی پێگەیـشتەوە، ڕەنگـی دەموچـاوی سورداگیرسـا و بـەجۆرێ تـوڕەیی دایگـرت کەکـەس نەیـدەتوانی ســەیری دەموچــاوی بکــات. پــاش ئــەوەی توڕەییەکــەی دامرکایــەوە داوای پێویـستیەکانی نوسـینی کـردو لـە پـشتی نامەکـەوە نوسـی:(بـسم الله الـرحمن الـرحیم، لـە هـارونی ئـەمیری باوەڕدارانـەوە بـۆ نقفوری سەگی ڕۆم، نامەکەتم خوێندەوە ، وەڵامەکەشی لە جیاتی ئـەوەی بیبیستی ، دەیبینیت).

پاشان سوپایەکی بەهێزی ئامادەکرد لە ژمارەیەکی زۆر سەرباز بۆ گرتنـی (هرقلە) کەوتنە ڕێ، لەم شەرەدا موسڵمانەکان مەنجـەنیقیان بـەکارهێنا و نقفوریان ناچار کرد کە بەمەرجی مەلیکەی پێشوو ڕازیی بێت.

مێژونوسان دەڵێن کاتێ سوپای موسڵمانان گەیشتەوە (رقـە) نقفـور لە بەڵێنەکەی خۆی پەشـیمان بـۆوە و ئەمـەش گەیەنرایـەوە لای وەزیـری

رەشید بەڵام نەیویست بەو شێوەیە ڕاستەوخۆ پێی ڕابگەیەنێت، بۆیە (ئەبو عەبدوڵڵا کوڕی ترفە)ی نارد تاوەکو هەواڵەکەی لە شێوەی قەسیدەیەکدا بۆ بخوێنێتەوە:

| | |
|---|---|
| نقض الذي أعطيته نقفور | فعليه دائرة البوار تدور |
| أبشر أمير المؤمنين فإنه | فتح أتاك به الاله كبير |
| فلقد تباشرت الرعية أن أتى | بالنقض منه وافد وبشير |
| أعطاك جزيته وطأطأ حده | حذر الصوارم والردى محذور |
| فأجرته من هولها ،وكأنها | بأكفنا شعل الضرام تطير |

لە شیعرەکەدا شاعیر سەرزەنشتی (نقفور) و مەدحی(ڕەشید) دەکات بۆ ئازایەتی و جوامێری، لە پاش ئەوە ڕەشید فەرمانیدا بە گەڕانەوەی سوپاکە و فەتحکردنی (هرقلە) و بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن تا کەناری نزیکی قەڵای قوستەنتنیە بەسەرکردایەتی(عقبە کوڕی جەعفەر)تاوەکو ناچار بەپێدانی سەرانەی ساڵانەی کردن.

٢. لە نێوان ڕەشید و شارلمان:

محمد عبدالله عنان دەڵێ:

(ئەوەی ڕەشید ئەنجامی داوە ، بیدعەیەکی گەورە و بەتەواوەتی پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامیە)[1] ڕێکەوتنەکەش سەرەتا بەم سێ خاڵە دەستی پێکرد و گوایە دواترلە دەورەی ئەمینی کوڕیدا لەساڵی ١٩٧ك دوو سەفیر بەنێوی (سنجسمند و لنشفرد)لەگەڵ وەرگێڕێکی یەهودیدا هاتونەتە لای ئەمین ، تاوەکو بڕیاری کۆتایی لەو بارەیەوە بدەن.

---

[1] مواقف حاسمة في تأريخ الاسلام ، ط٢، ص١٣٦.

خاڵەکانیش ئەمانەن:

١. شارلمان، بەڵێنی دەدات پارێزگاری لەو هێزە بکات کە بۆ بەرژەوەندی دەوڵـەتی عەباسـی لـە دەوڵـەتی ئەندەلوسـدا هەڵدەسـتێ بـۆ بانگـەوازی عەباسیەکان.

٢. بـەڵێنی دەدرێـت لـەنێوان هـەردوو بنەماڵـەدا ، نوێنـەری هەریەکـەیان هـەبێت، واتـە: لـە دەوڵـەتی عەباسـیدا نوێنـەری شـارلمان هـەبێت و لـە دەوڵەتی فرنجە نوێنەری هارون هەبێت.

٣. ڕەشید ئاسانکاری بکات لە ڕێگەدان بە حاجیانی فرنجـە و دەوروبـەری سەر کەنیسەی کاسۆلیکی کە سەردانیماڵی پیرۆز (بیت المقدس) بکەن و ڕێگـە بـە غـەیرە موسـڵمانەکانی وڵاتەکـەی خۆیـشی بـدات کـە سـەردانی (کەنیسەی بیزەنتیە)بکەن. [1]

بـــــــــەڵام:

ئەنـدەلوس ، دەوڵـەتێکی ئەوەنـدە سـادە و سـاکارنەبوو کـەوا شارلمان بەرگری لە عەباسیەکان بکات تاوەکو بانگەواز بـۆ دەوڵەتەکـەیان بکەن، چونکە لـە دەورانـی مەنـصوردا لەلایـەن(ئـیبن مغیـث)ەوە هێرشـی کرایە سەر بەڵام سوپاکە هیچی پێنەکرا و ئەمەش وای لە مەنصورکرد کـە نازنـاوی (صـقرالقریش: لـە عەبـدولرەحمان داخـل) سـوڵتانی دەوڵـەتی ئومەوی لە ئەندەلوس بنێت، پاشانیش (شارلمان) خـۆی گـیری خواردبـوو بە ئاژاوەی نێوخۆییەوە و ئیتر چۆن ئەتوانێ بەرگری لە هێزێکی گـەورەی ئاوابکات.

---

[1] عبدالحمید العبادي: مجلة الهلال ، العدد الخاص بالرشید، ص١١٠٥

کۆتایی بەم قسەیە دێنم :(شارلمان چۆن درکێك دەڕوێنێت کە پـێش ئەوەی قورگی عەبدولڕەحمان داخل بگرێت، قورگی خۆی دەگرێت).

پەیوەندی دووەمیشیان بریتی بووە لـە ئـاڵوگۆری (خـەڵات) کـە ڕای جیاوازیش هەیە لەسەر ڕاستی و دروستی ئەویش ، بەڵام لەبـەر ئـەوەی چ بـە بـەڵێ وە چ بەنـەخێر هـیچ کـەلێنێك دروسـت ناکـات ، هەربۆیـە وازم لێهێنـا. پاشـان پەیوەنـدی سـێهەمە کـە بـۆ دەورانـی ئـەمینی کـوڕی دەگەڕێتەوە ، کە گوایە ڕێککەوتون لەسـەر ئـەوەی کـە موسـڵمانەکان لـە ئەندەلوس دەربکەن، ئەمەش بـۆ خـۆی جگـە لـە خـەیاڵ و ئەفـسانە هـیچ ڕاستیەکی مێژویی لە پشتەوە نیە.

## خـەبات و تێکـۆشـانی عەلەوییـەکان

خـەباتی هاوشـانی نێـوان عەلـەوی و عەباسـیەکان لـە کۆتاییـەکانی دەوڵـەتی ئومەویـدا بـە ئاشـکرا دەبینـرێ وەکـو حـەقێکی ڕاسـتەقینەی خۆیان بـۆ دەسـەڵات، بۆیـە زەجـر(نارەحـەتی) کێـشانی زۆری ئـالی عـەلی لەدەورەی ئومەوییەکاندا پانتاییەکی بەرفراوانی هەیە.

خـاوەنی فـەخری دەڵـێ:(بـەنی هاشـم لـە تـالیبی و عەباسـیەکان کۆبونـەوە بـۆ کۆتـایی هێنـان بـە دەوڵـەتی ئومـەوی ، لەئـەنجامی ئـەو چەوساندنەوانەی بەنی ئومەییە لە بەنی هاشم). پاشان دەڵـێ:(ڕێککـەوتن لەسەر بەیعەتدان بـە محمـد کـوڕی عەبـدوڵڵا کـوڕی حەسـەن کـوڕی عـەلی کوڕی ئەبی تالیب کـە لـە گـەورانی بـەنی هاشـم بـوو، هـەروەها لـە پیـاوە گەورە و پایـەدار و زانـستخواز و عالمـەکان بـوو، ئەمـەش بـە ئامـادەبونی گەورانی تالیبین، جەعفەرصادق و عەبدوڵڵا حەسەن و کوڕانی (محمد نفس

زەکیــە و ئیــبراهیم)، لــە گــەورانی بــەنی عەباســیش(ســەفاح و ئــەبو جەعفەر،...)، رێککەوتن لەسەر بەیعەتدان بە نەفس زەکیە[1]).

لــە دوای ئــەم ڕوداوەوە دەســەڵاتی عەباسـیەکان زیـاتر تەشـەنەی سـەند و (محمـد نفـس زەکیـە)ش لـە دوای مردنـی بـاوکی بەیعـەتی دایـە (سەفاح) و وازی لە دەسەڵات هێنا بۆ سـەفاح، بـەڵام سـەفاح و مەنـصور پاشــتر نەیانهێــشت کــەوەلی عەهــدی بگێردرێتــەوە بــۆ کــوڕانی نفــس زەکیــە(محمــد و ئیــبراهیم). ئەمــەش بەســەرەتای نــاکۆکی و کۆتــایی دۆســتایەتی دادەنرێـت لـەنێوان ئامۆزاکانـدا. ئـەوەبوو مەنـصور هەسـتا بـەدانانی (ربـاح کـوڕی عوسمـان) لـە مەدینـە و بەشـێوەیەکی زۆر تونـد ڕوبەڕوی عەلەوییەکان وەستایەوە و هەستا بـە زینـدانی کردنـی (عەبـدوڵلاّ کـوڕی حەســەن) بۆیـە هەریەکـە لـە (محمـدنفس زەکیـە: لـە مەدینـە و ئیبراهیمی برای: لـە بەصـرە)لـە دژی دەسـەڵاتەکەی مەنـصور شۆرشـیان بەرپاکرد ومەنصوریش زۆر بەتوندی سەرکوتی کردن و لە کۆتایشدا محمد وازی لە سیاسەت و دەسەڵات هێنا و ئیبراهیمیش لەو پێناوەدا مرد.

لە دەورەی مەهدیدا هیچ لێدانێکی عەلەوییەکان نیـە، تـەنها گیرانـی (ئیمام موسا کازم)ەو پاشتر بەردانی. بەڵام لە دەورەی هـادی کوڕیـدا لـە پاش گرتنی (حسین کوڕی عەلی کوڕی حەسـەن) دەستیـشی دایـە لێـدانی هەواداران و شـوێنکەوتوانی، دواتـریش ئـەوەبوو لـە زینداندا بـە فـەرمانی خەلیفـە سـەری لـە لاشـەی جیاکرایـەوە. کەسێکی وەکـو (الـبحتري) لـەم بارەیەوە دەڵێ:

شــــواجر أرماح تــقطع بــــينهم

---

[1] ابن الطقطفي: الفخري في الاداب السلطانية، ص١٤٦.

شواجر أرحام ملوم قطوعهـا

اذا احتربت يوما ففاضت دماؤها

تذكرة القربى ففاضت دموعها

بـە نـەمانی هـادی و هـاتنی ڕەشـید بارەکـە ئـارام بـۆوە، ئـەوەبوو فەرمانیدا بە دەرکردنیان لە زیندانەکانی بەغداد و لەگەڵ داوای لێبـوردن و بەخشین .

لە دوای شەری (فەخ) لـە مەدینـە هەریەکـە لـە (یـەحیا و ئیـدریس) کوڕانی (عەبدوڵلا کوڕی حەسەن) دەرچون بۆ دەرەوەی دەسەلاًت، یەحیا چووە دیلم و ئیدریس چووە (مەغریبی دوور)کە لەوێ کەسانی بەربـەری و بێ دین هەبون و لە دیلەمیش شوێنکەوتوانی فاتیمە و ئالی عەلی زۆر بـون، بەمـەش دەسـەلاًتیان بـەزوویی بـلاًو بـۆوە: هـارونیش لـە پـاش وتوێـژ بـە (یەحیا کوڕی خالیدی بەرمەکی و فەزڵی کوڕی ڕەبیع) بڕیاریدا کە وەفدێك بنێرێت بۆ هێنانەوەی یەحیا ، وەفدەکەش لە چەند زانای گـەورە بـەرێوە چوو کە بە کۆمەڵێك دیاریەوە چونە ولاًتی دیلەم و (یەحیا)یان ڕازی کرد و هێنایانەوە بەغـداد* . بـۆ ئیدریـسیش (سـلێمانی کـوڕی جریـر)ی بـۆ نـارد تاوەکو خـۆی کـردە هـاورێی و دۆسـتی و پاشـان لـە دەرفەتێکـدا زەهـری کـردە نێـو شـەرابەوە و فەوتانـدی * کـە پاشـتر لـە نەوەکـەی (دەوڵـەتی ئەدارسە)دروست بوو.

---

* دەوترێت لەلایەن ڕەشیدەوە کوژراوە ، بـەلاًم ئەگـەر وایـە ئـەی ڕۆڵـی یـەحیای بەرمـەکی وەکـو وەزیر چیە کە دەوترێت بۆ هەموو کاروبارێك پرسی بە بەرمەکیەکان کردووە؟

* دوو ڕای جیاواز هەیە :

١. ئیدریس بۆتە کەسێکی ئارەق خۆر و شەراب خۆر ، هەربۆیە توانراوە هەلی وا بقۆزرێتەوە.

بە نیسبەتی ئیمام (موسا کازم)یش دوبارە لە دەورانی ڕەشیددا بە تۆمەتی بەشداری کردن دژی دەسەڵات دەستگیرکرا ، بەلاّم لە پاش ماوەیەکی کەم بەردرا و داوای لێبوردنی لێکرا لەلایەن ڕەشیدەوە.

بەهەمان شێوە چەندین دەقی دژ بەیەك هەست پێدەکەین ، کە پێم وایە لەلایەن مێژونوسە شیعی و نوسەرە شیعیەکانەوە زاق کراونەتەوە و دروستیەکی تەواویان تێدانیە، لەبەرئەوەی وەکو ئاماژەمان پێداوە ڕاکان جیاوازن ، بۆیە ئەنجام بەدەستهێنانیش لە دەقی دژبەیەکدا ئەنجامی لێك جیاواز دەخاتەوە، ئەمە جگە لەوەی ئەوەشمان بۆ ڕون بۆوە کە سیستمی دەسەڵاتداریتیش لەنێو عەلەوی و شیعەکانی لایەنگریاندا بەهەمان شێوازی پشتاوپشتی و وەلی عەهدی بووە و گەڕانەوە نەبووە بۆ خەلیفەکانی ڕاشدین و بەتایبەتی ئیمام عەلی. هەربۆیە دەگەینە ئەوەی بلێین زیاتر ململانێکە ئەچێتە قالبی مەزهەبی و بنەماڵەیی و دەسەڵات قۆرخکردن و شەرعیەتدان بە ئالوبەیت و لایەنگرانی و پێکهێنانی سیستمی جیاوازی چینایەتی و دروستبونی پیاوانی ئاینی کە ئەمەش بۆ خۆی دەبووە کوشتنی شارستانیەتی ئیسلامی لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە ئەگەر لە ڕوی بنەماڵەییەوە بێت ، بە وتەکەی دکتۆر عەلی وەردی:(عەباسیەکان نزیکترن بە خیلافەت چونکە دەچنەوە سەر ئیمام عەباس، بەلاّم عەلەوییەکان دەچنەوە سەر ئیمام عەلی کە کوڕە مامی پێغەمبەرە).

---

٢. دەڵێن هیچ کەسێك بەو ناوەوە نیە کە لەلایەن هارونەوە نێردرابێت، سەبارەت بە کوشتنەکەشی دەڵێن بە مردنی ئاسایی مردووە.

# خـــــــەوارجــەکان*

* خەوارجەکان چەند ناوێکیان هەیە:

١. الحروريە: دەگەڕێتەوە بۆ (حـروراء) کـە گوندێکـە لـە کوفـەوە دیـارە .... لەوێـدا بۆیەکـەمجار بڕیاریاندا لە دژی ئیمامی عەلی بوەستنەوە ، کاتێ لە دوای شەڕی (صفين) پەیمانی (تـەحکیم)یـان بەست لەگەڵ موعاویەدا.

٢. المحکمـە: کـاتێ پەیمانەکـە بەسـترا ، ئەشـعەس لـە بـەنی (القـیس) دەگـەڕا و پەیمانەکـەی دەخوێندەوە، بەناوی (پەیمانی ناوبژیوانی نێوان عەلی و موعاویە)، تاوەکو گەیشتە (بـەنی تمـیم) لەناو ئەواندا (عروە کوڕی ئەدیە) لە بەنی تمیم دەرکەوتوو ، وتی: لاحکم الا الله.

٣. شراة: ئەم ناوە خۆیان لە خۆیان ناوە ، بە پێی دەقی ئەم دوو ئایەتە:

أ. ان الله اشترى من المؤمنين أنفسهم وأموالهم بإن لهم الجنة. ( توبة : ١١١).

ب. ومن الناس من يشري نفسه ابتغاء مرضاة الله. (البقرة : ٢٠٧).

٤. خوارج: شەهرستانی دەڵێ:(خـەوارج بەسـەر ئـەو کەسـەدا ئەسـەپێ ، کـە دەرچـێ لـە ئیمـامی ڕاسـت). دەرچـون لـە ڕۆژەکـانی هاوەڵانـدا ، خەلیفـەکانی ڕاشـدین ، تـابعين،..... بـەلاًم لەدیـدی خۆیانەوە بەواتای دەرچون لە پێناوی خوادا ، بەپێی ئەم ئایەتە:(ومن يهـاجر الى الله ورسـوله يجـد في الارض مراغما كثيرا وسعه ومن يخرج من بيته مهاجرا الى الله ورسوله ثم يدركـه المـوت فقد وقـع اجـره علـى الله غفـورا رحيمـا). بڕوانـە / شهرسـتانی: الملـل والنحـل، ج١/ ١١٠. الأشـعري: مقـالات الاسلامين، ج١/ ١٥٦. البغدادي: الفرق بين الفرق، ص٥٤.

مێژووەکەیان:

١. دەورەی پێغەمبەر: کاتێ پێغەمبەر خەریکی دابەشکردنی دەسـکەوتی خەیبـەر بـوو ، پیـاوێکی چاوبەقوڵدا چوو و دەم و چاو قۆقز هەستا و وتی: ئەمڕۆ دادوەر نەبویت ! پێغەمبەریش سوربۆوە و هاوەڵانیش هەستانەوە بیکوژن ، پێغەمبەر فەرموی: لە پشتی ئەمەوە کەسانێك پەیدا ئەبن چۆن تیرێك لە کەوان دەرئەچێ ، ئەمانیش وا دەرئەچن.

٢. دەرچونیان لە دژی پەیمانی (التحکیم)ی (عەلی و معاویە).

لە گروپەکانیان:

١. المحکمة(عروة بـن أديـة). ٢. الأزارقـة(نـافع بـن الأزرق الحنفـي). ٣. المنجـدات(نجـده بـن عـامر الحنفي). ٤. الصفدية(زياد بن الأصفر).

٥. العجاردة(عبدالكرم بن عجرد). ٦. الصلية(صلت بن عثمان). ٧. الحمزيـة(حمـزه بـن أكـرن). ٨. الثعالبه(ثعلبه بـن عـامر). ٩. المعبديـة(معبـد بـن أكـرن). ١٠. الأخنـسية(الأخـنس بـن قـيس). ١١. الشيباني(شيبان بن سلمة الخارجي). ١٢. الرشدية(رشيد الطوسي). ١٣. المكرمية(مكرم بـن عبـدالله

سەردەمی ڕەشید ، لەو سەردەمانەیە کە بزوتنەوەی خەوارجەکان پەرەی سەندبوو ، شۆرشەکانیان زۆر بوو گەلێ لای جۆربەجۆری خیلافەتی عەباسی گرتبۆوە. مەحصەمی شورات لە موسڵ ساڵی ١٧١ك و فەزڵی شوراتی ساڵی ١٧٦ك و وەلیدی کوڕی تەریفی لە شاری سجستان ساڵی ١٧٩ك و خراشەی شیبانی لە جزیرەی سەر فورات ساڵی ١٨٠ك و عەبدولسەلامی شوراتی لە ئامەد ساڵی ١٨٧ك شۆرشیان لە دژی خەلیفە ڕاگەیاند. ئەوەشمان لەیاد نەچێت، شەڕی خەوارج و خەلیفە شەڕ بووە لەسەر فیکر و جیاوازی فیکری.

بەلاَم ئێمە لێرەدا باس لە نامەیەکی ڕەشید دەکەین کە بۆ (حەمزەی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەزرەقی) ناردووە کە بەناودارترین بزوتنەوەی خەوارجی دادەنرێت لەم دەورەیەدا. هەرچەندە گومانم هەیە لە نوسراوەی نامەکە لە ڕوی مێژوییەوە بەلاَم لەبەر نەبونی دەرفەت بەدواداچونم بۆ نەکردووە و بەڵکو لە کتێبی (شوراتەکان : مصلح جەلالیەوە)وەرم گرتووە کە ئەویش لە ( دکتۆر عومەر فەوزی )ەوە وەریگرتووە، بەلاَم تەنها وەکو نمونەیەك بۆ تەوازوعی ئەم خەلیفەیە کە تاڕادەیەك هەستی پێدەکرێت چونکە نوسەر (عومەر فەوزی ) کەسێکی بیرتەسك و حیزبیە و نەیتوانیوە لایەنی جوانی ئەو خەلیفەیە نیشانبدات،

---

العجلي). ١٤. الاباضية(عبدالله بن اباض التميمث). ١٥. الحفصية(حفص بن ابي المقدام). ١٦. الحارثية(حارث بن يزيد الاباض). ١٧. الشبية(شبيب بن يزيد الشيباني). بروانة/شهرستاني: الملل والنحل، ج١/ ١١٨-١٣٦. الأشعري: مقالات الاسلاميين ، ج١/ ١٦٥-١٧٩. الدكتور شوقي أبو خليل: أطلس الفروق والمذاهب الاسلامية، ط١.

نامەکەش بەم شێوازەیە:(بەناوی خوای گەورە و میهرەبان ، لە هارون ڕەشیدی میری باوەڕدارانەوە بۆ حەمزەی کوڕی عەبدوڵلا – سلاوتان لێ بێت– من سوپاسی ئەو خودایە ئەکەم کە لەو زیاتر هیچ خودایەکی دیکە نیە ، کە سلاوی بۆ محمد پێغەمبەر و کۆیلەی نارد... خوای گەورە محمدی بە پێغەمبەر نارد بۆ هەموو کەسێ ، ڕێگەی داوە بەناوی خۆیەوە خەڵك بانگ بکات و ڕێگەیەکی ڕوناکە مژدەی بەهەشت دەدات بۆ ئەوەی گوێ ڕایەڵی دەبێ و ئەوەشی لێی یاخی دەبێت دەیسوتێنێ .... میری باوەڕداران بۆ قورئانی خودا و ڕێبازی پێغەمبەرەکەی بانگت دەکات و هانت دەدات بۆ ئەوەی گوێ ڕایەڵی بیت و هەروەها ئەوەی لە نێوان تۆ و کارگێڕەکانی لە خوراسان و سجستان و فارس و کرمان زانی ناکۆکی و خوێن ڕشتن بووە چاکەی تۆ و لایەنگیرەکانت و یەکخستنی قسەتان و دورخستنەوەی خراپەتان و خۆشی و ئارام و دڵنیای ئێوە و تێکەلاوبونتانی ویست لەگەڵ برا موسڵمانەکانتاندا و باج و زەوی خێر و مافی داونێ و خوێن ڕشتن و دەستدرێژی کردنتانی بەخشیوە ..... پاشتر دەڵێ: هەرتاوانێك و هەرخوێنێ تۆ کردبێت و ڕژاندبێتت ، یاخود لایەنگیرەکانت هەرشتێ کەلەو جەنگەدا کردبێتیان لەوانە هەموی خۆش بووە.... ئەوەی کە لەنێوان ئێوە و کارگێری میری باوەڕداراندا ڕوی داوە ؟ وەفاتان وەدی بهێنن و مەگۆڕێن و بێ گوێی مەکەن و تێك مەچن).[1]

بەڵام حەمزە بەهیچ شێوەیەك دانی بە دەسەڵاتی هاروندا نەنا و بەڵکو لەو نامەیەدا کە بۆی ناردووە ، خۆی وەك(ئەمیری باوەڕداران)دانا، ئەمەش

[1] ل ٥٤٦–٥٥٠.

بەڵگەی ئەوەیە کەبە هیچ شێوەیەك مەرجەکانی خەلیفەی قبوڵ نیە و بەدانوستان ڕازی نیە.

## کارەساتی بەرامەکەکان

ڕەچەڵەکی بەرامکە دەگەڕێتەوە بۆ (بەرمەك) ، کە پیاوێکی مەجوسی بوو لە شاری (بەلخ)لە طخارستان لای ڕوباری جەیحون. پەیمانگایەکی گەورەی ئاگرپەرستی تێدابوو کە بە (کۆیلەی ئاگر)دەناسرێ ، بەم شێوەیەش بەرامکەکان لەو دەورەیەدا بەو شێوازە ناسران. لە پاش ئەوەی بانگەوازی عەباسی لە خوراسان دەستی پێکرد (خالد کوڕی بەرمەك) بووە یەکێ لە گەورەترین بانگەوازکارانی دەوڵەتی عەباسی و سەرخستنی (ئەبو عەباس سەفاح) بەیەکەم خەلیفە. پاشان لە دەورەی خیلافەتی (ئەبوجەعفەری مەنصور) یشدا کرایە والی فارس و پاشان موصڵ تاوەکو وەفاتی کردلە سەرەتاکانی خیلافەتی مەهدی لەساڵی (١٦٣/ ٧٧٩ز). هەروەها ئەبوجەعفەری مەنصور یەحیای کوڕی خالیدی کردە والی ئازەربیجان ساڵی (١٥٨ك/ ٧٧٥ز) پاشانیش مەهدی ساڵی (١٦٢ك/ ٧٧٨ز)کردیە نوسەر و وەزیری کوڕەکەی هارون ڕەشید. ئەویش لەگەڵ ڕەشیددا بووە هاوڕێ و هاودەم و ساڵی (١٦٣ك/ ٧٧٩ز) دەرچون بۆ غەزوەی (صائفە). پاشان مەهدی کوڕەکەی (هارون ڕەشید) ی کردە والی لە مەغریب ساڵی (١٦٤ك/ ٧٨٠ز) و یەحیای کوڕی خالدیشی کردە ڕێنیشاندەری و یارمەتیدەری . لە دەورەی هادیشدا بووە کەسێکی ناوبژیوان تاوەکو دۆخەکە بە باشی بەڕێوە بچێت. پاشان ئەوەبوو هادی لە دۆخێکی نادیاردا وەفاتی کرد و هارون ڕەشیدیش بووە خەلیفە[1].

---

[1] د. ابراهيم أيوب : التأريخ العباسي السياسي والحضاري ، ص٦٣-٦٤.

یەحیا چوار کوڕی بوو (فەزڵ و جەعفەر و محمد و موسا) ، بەهۆی ئەو باوەڕەی ڕەشیدیش هەیبوو پێیان ، دەسەڵاتیان بەرادەیەکی بەرفراوان تەشەنەی سەند، بەڵام بەڕێژەیەکی زیاتر (فەزڵ و جەعفەر ).
ئەوەبوو فەزڵ بووە والی لە وڵاتی دیلەم ساڵی (١٧٨ك/ ٧٩٤ز) و خوراسان و سنورەکانی ، پاشان ناردنیشی بۆ غەزای وڵاتانی پشت ڕوبار .
بەناوبانگی جەعفەریش لە ڕەوانبێژی و ناتیقی و بوو کە ڕەشید پێی سەرسام بوو ، ئەوەبوو ساڵی (١٧٦ك/ ٧٩٢ز) کردیە والی بەسەر میسر و ئەفریقیا و جزیرەی فوراتیە لە گەڵ کارەکانی لە بەغدادداا[1] .

دکتۆر ئیبراهیم ئەیوب ، دەسەڵاتی بەرامکەکان لە دەورەی ڕەشیددا دابەش دەکات بۆ سێ قۆناغ:

١. قۆناغی یەکەم: ١٧٠- ١٧٤ك/ ٧٨٦-٧٩١ز.

ئەم دەورەیەش ناودەبرێت بە حوکم و دەسەڵاتی خەیزەران و بەرامکەکان.

٢. قۆناغی دووەم: ١٧٤- ١٨٧ك/ ٧٩١- ٨٠٣ز.

لە دوای وەفاتی خەیزەرانەوە دەست پێدەکات و لەگەڵ هاتنە سەرکاری کوڕەکەی هارون ڕەشید ، کە پۆستی نزیك و گەورەی لە دەربار و دەسەڵاتی خۆیدا پێدان، ئەمەش درێژەی کێشا تاوەکو ساڵی (١٨٧ك/ ٨٠٣ز).

٣. قۆناغی سێهەم(١٨٧- ١٩٣ك/ ٨٠٣- ٨٠٩ز)

---

[1] المسعودي: مروج الذهب ، ج٣/ ٣٦٨. [1] د. ابراهيم أيوب : التأريخ العباسي السياسي والحضاري ، ص٦٦-٦٧.

بـە کارەسـاتی بەرامکەکانـەوە دەسـت پێـدەکات و درێـژە دەکێـشێ بـە دەورەی ڕەشید و وەزیرەکەی (فەزڵی کوڕی ڕەبیع) تـاوەکو وەفـاتکردنی کۆتایی دێت[1].

تەواوی نوسەران لە شیکردنەوەی کارەسـاتی بەرامکەکانـدا ، ئەمانـە بە نمونەی ئەو تێکچونە دەزانن:

١. عەباسە خوشکی ڕەشید ، کاتێ ئامادەبوو لە دانیـشتنەکانی ڕەشـیددا ، پەیوەندی دروست دەکات لەگەڵ جەعفەری بەرمەکی و بە نهێنی دەبێتە هاوسەری ناشەرعی و پاشتریش سکی پڕدەبێت و منـداڵی دەبێـت ، کـاتێ ڕەشید ئەمە دەبیستێ لە خێزانیەوە (زوبێدە) زۆر تورە دەبێت و فـەرمان دەدا بە مسروری سەربڕ سەری لەلاشەی جیابکاتەوە.

٢. بەرامکەکان لە ڕواڵەتدا موسڵمان بون و لـە ناخـدا ئینکـاری ئیـسلامیان کردووە و باوەڕیان پێی نەبووە.

٣. بەرامکەکان وەکو جاسوسی ناوکۆشـك بـون و نهێنـی ناوکۆشـکیان بـۆ دەرەوە گواسـتۆتەوە و خـەڵکیان لـە دەوری خیلافـەت دورخـستۆتەوە و بەرەو لای خۆیـان ڕاکێـشاون ، تـاوەکو لـە دەرفەتێکـدا دەسـەڵات بگرنـە دەست.

٤. بەرامکەکان عەلەوی بون و بۆ ئەوە چونەتە ناو خیلافەتـەوە ، تـاوەکو بە نهێنی کاری سیاسی خۆیان پەرەپێبدەن.

بـەڵام کـاتێ هەرنوسـەرێك یـەکێك لـەو خاڵانـە دەکاتـە پێـوەر و باسەکەی خۆی درێژە پێدەدات ، دەبێت وەڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە:

– ئەگەر بەرامکەکان موسڵمان نەبون و تەنها لە ڕواڵەتدا خۆیان وا نیشانداوە ، بۆچی فەسادیان جارێ دەرنەکەوت لە دەورەی سەفاح ، یا لە دەورەی دوروو و درێژی مەنصور یا پەیوەندیەکانیان لە دەورەی مەهدی و سەرەتاکانی ڕەشیددا؟

– هاوڕێیەتی و پێکەوەبونی هەریەك لە ڕەشید و یەحیای کوڕی خالدی بەرمەکی درێژدەبێتەوە بۆ (٤٠)ساڵ ، ئایا دەکرێ نەزانێ لەسەر چ دین و باوەڕێکە؟

– کاتێ هادی براکەی ڕەشیدی زیندانی کرد ، لە جیاتی ئەوەی هەوڵی ئارامکردنەوەی بارودۆخەکەیان دەدا، بۆچی بارەکەیان بەلای خۆیاندا نەشکاندەوە و دەسەڵات بگرنە دەست؟

هەربۆیە دەبێت بزانین ، کە هیچ ڕایەك ساغ نابێتەوە بۆ هیچ لێکۆلەرێك و ئەوەی دەیڵێ تەنها بریتیە لە ڕای خۆی ، چونکە تۆمەتەکان بەتەواوی لە یەك جیاوازن:

– تۆمەتی بێ دینی.

– تۆمەتی زەواجی ناشەرعی لە نێوان جەعفەر و عەباسە.

– تۆمەتی عەلەوی بون.

– تۆمەتی جاسوسی کردن.

لەم کتێبانەدا باسەکە بەم شێوازەیە:

خزری:(ڕەشید کەسێکی خراپکار بووە لە بەرامبەر بەرامکەکان و زوڵمی لێکردوون،[1] .....).

---

[1] شیخ محمد الخضري بك: الدولة العباسية.

محمد ئەحمەد :(بەرامکەکان هەوادارانی عەلی کوڕی تالیب بون و لەگەڵ ئەوەشدا هیچ جۆرە تورەیی و دژایەتیەکیان نەبووە لەگەڵ خەلیفەکان و خەلیفەکانیش بەهیچ شێوەیەك دژیان نەبون و خوێن ڕێژیان نەبووە)[1].

لێرەدا دەبێت دوو شت لەیەك جیابکەینەوە: بەرامکەکان هەواداری عەلی بن، یان بانگەوازیان بۆ عەلەوییەت و نەمان و ڕوخانی دەوڵەتی عەباسی کردبێت.

مستەفا جەوادیش دەڵێ:(کەسانی فارس پەرست و زەردەشت و مەزدەکی بون و هەوڵیانداوە لەو ڕێگایەوە جارێکی تر شارستانیەتی فارسی زاڵ بکەن بەسەر شارستانیەتی عەرەبی و ئیسلامیدا[2]).

خزری بك:(ئەمە بەپلانی فەزڵی کوڕی ڕەبیع دادەنرێت بۆ کۆمەڵانی بەرامکە، تاوەکو دەور و دەسەڵاتی خۆی زیاتر بێت).

مامۆستا محمد ئەحمەدیش دەڵێ:(بەرامکەکان شیعە و لایەنگری عەلەوییەکان بون، بەڵام ئەم لایەنگیریەیان هیچ پەیوەندیەکی بەوەوە نیە کە هەوڵی کوشتار بدەن لەنێو کۆشکدا و دەسەڵات بگرنە دەست).

فەخری زوبێدیش بەم پرسیارە دەست پێدەکات:

هل ندم الرشید علی نكبتهم؟

ئایا ڕەشید پەشیمان بۆتەوە لەسەر سزادانیان؟

لە درێژەی قسەکانیدا ئەیەوێ ئەوە بسەلمێنێ، کە نەخێر پەشیمان نەبۆتەوە، بەم بەڵگانەی لای خوارەوە:

١. سەرەتا کوشتنی جەعفەر بەرمەکی لەلایەن (ئیبراهیم)ەوە.

---

[1] محمد أحمد : البرامكة في ظلال الخلفاء ، ص١٩٨.

[2] مصطفی جواد: نكبة البرامكة ، مجلة الرسالة ، العدد (٢٧) ، ٨/١/ ١٩٣٤.

٢. پاشان لەبەین بردنی نەوەی دووەمی بەرمەکیەکان.
٣. هەروەها زیندانی کردنی (یەحیا) بەرمەکی تائەوەی لەساڵی (١٩٠ك)لە زیندان‌دا وەفات بكات.

ئەگەر پەشیمان ببوایەتەوە ، ئەوا بێگومان لە دوای کوشتنی جەعفەرەوە پەشیمان دەبۆوە. پاشتر دەڵێ:(ئەمە ململانێی نێوان عەرەبی موسڵمان و فارسی زەردەشتی مەزدەكین كە دەیانویست جارێكی تر دەسەڵات بۆ فارسە مەجوسیە ئاگر پەرستەكان بگێڕنەوە[1]).

پاشان نوسراوێكی (مستەفا جواد)مان لەبەردەستدایە، كە لە گۆڤاری (الرسالة)دا نوسیویەتی بەناوی (نكبة البرامكة)، باس لەوە دەكات كە ئەمانە ڕوپۆشكراوی عەلەوین و لەناخدا كەسانی ئاگرپەرستی مەجوسی فارسی بون و بۆیە كاتێ ئەم هەواڵە گەیشتەوە ڕەشید بەخێرایی فەرمانی كوشتنی جەعفەری مەجوسیدا ، نوسەر ئەم كاردانەوەی ڕەشید بە كارێكی باش دادەنێ چونكە سەركەوتنی عەرەبە بەسەر فارسدا. باشە ئەگەر جیاوازی كردبێت لە نێوان نەتەوە جیاوازەكانی وەك (تورك و عەرەب و فارس ) بۆچی ژنی لە هەرسێكیان خواست؟ بێگومان بۆ بیرتیژی كەسێتی خۆی دەگەڕێتەوە تاوەكو هاوكاری بن و دژی نەوەستنەوە. پاشان نوسەر باس لە چیرۆكێك دەكات وەك نمونەیەك دەیهێنێتەوە بۆ ئەوەی كە ڕەشید بەهیچ شێوەیەك پەشیمان نەبۆتەوە لەو كارەی وا لەبەرامبەر بەرامكەكاندا كردی و دەڵێ:(جارێكیان ڕەشید بە كۆڵانەكانی بەغدادا دەڕۆیشت ، لە تاریكایی

---

[1] فخري الزبيدي: الموجز المنتخب من حوادث وأخبار الخليفة هارون الرشيد و دولة و جند العرب في خلافة بني العباس.

شەودا بینی کەوا لەسەر دیوارەکان شیعری لاواندنەوە بۆ جەعفەری کوڕی یەحیای بەرمەکی نوسراوە، ئـەویش فـەرمانی بـە پاسـەوانانی شـەودا کـە هەرکەسێکیان بینی شتی نوسی لەسەر دیوارەکان بیگرن و بیکوژن و هەر شوێنێکیش کۆڕی لاواندنەوەی تێدابوو بۆ جەعفەری بەرمـەکی بـسوتێنرێ ، لـە نمونـەی لاواندنـەوەکانیش ، لاواندنەوەکـەی (سـلێمانە کـوێرە)، کـە دەڵێ:

أما والله لولا خـــوف واش          وعين للخليفة لاتـــــــــنام

لطفنا حول قبرك واستلمنا          كما للناس بالحجر اســـتلام

هۆی ئەم کاردانـەوەیش بـۆ ئـەوە دەگەڕێنێتـەوە کـە ڕەشـید ترسـا بێـت لەوەی لە ڕێگای ئەو لاواندنەوەیەوە جۆش و خرۆشـی خـەڵکی زیادبێـت و لە دژی بوەستنەوە.

بـە نیـسبەتی تۆمـەتی ئـەوەی کـە بەرمەکیـەکان لەسـەرەگەورانی پاسەوانی (مـاڵی ئـاگربون) لـە سـەردەمی (کیـسرا)دا، ئـەی پاشـتر کـاتێ فـارس بـەنوری ئیـسلام رۆشـن کرایـەوە، هـەروەکو چـۆن باوبـاپیرانی پێغەمبەر کە هـاوەڵ پەیداکـەر بـون و پاشـتر لـە تاریکییـەوە بـۆ ڕونـاکی هاتن. ئایا دەکرێت پاشتر هەرکارێکیان کردبێت یەکسەر بڵێین کـەوا ئەمـە هەرباوەڕیان نەبووە و بەڵکو هەر لەسەر دینەکەی پێـشوی خۆیـان بـون و بە ناچاری و بە ڕوکەشی دینی ئیسلامیان وەرگرتووە. وەکو ئەم شـاعیرە ستەمکارە لە بارەی ئاگرپەرستی بەرمەکیەکانەوە دەڵێ:

اذا ذكر الشرك في مجلس          أضاءت وجوه بني برمك

ولو تليت فيهم ايــــــــة          أتوا بالأحاديث عن مزدك

ئەگـەر ئـەم شـیعرە تـەعبیر لـە ڕاسـتی ئـەوان بکـات ، لـە کـاتی دانیــشتنەکاندا کــاتیَ ئایــەتێك خوێنراوەتــەوە ، ئــەوانیش وتەیــەکی مـەزدەکیان هێناوەتـەوە، لـە کاتێکـدا لـە دانیـشتنەکانی بەرمەکیەکانـدا کەسانی وەك(کەسـائی ، ئـەبو یوسـف، محمـد کـوڕی حەسـەن، سـەوری، ئیبن موبارەك) ئامادەبون.

لە کۆتایدا دەگەین بەوەی : لەبـەر ئـەوەی هـیچ کـام لـە ڕوداوەکـان پشت ڕاست ناکرێنەوە ، ئەوا هەر بەو شێوەیەی کە ڕوداوەکان هەن باسـم لێکردن و حەقی ئەمیان نادەم بەسەر ئەویاندا چونکە لەلایەك تۆمەتـەکان زۆر و دژبەیـەکن لەلایـەکی تریـشەوە مێژووەکـە شـێوێنراوە بـەهۆی ئـەو جیاوازی ئایدیا و بۆچونانەی مێژووەکەیان نوسیوەتەوە .

## ئافرەت لە کـۆشکی ڕەشیــددا

دەوترێـت:(لـە پـشتی هـەموو کەسـێکی گـەورەوە ئافرەتێـك هەیـە). ئەوەی لە مێژویی ڕەشیددا بەرچاومان دەکەوێت و دەیخوێنینەوە، دەوری چوار ئافرەت کە باسیان هەبێت و کاریگەریان بوبێت لـە ژیـانی ڕەشـیددا، ئەوانیش: دایکی: خەیزەران، خێزانـی: زوبێـدە، خوشـکەکانی: عەباسـە و علیە.

١. خەیزەران[1]:

---

[1] ڕەچـەڵەکی زۆر ڕون نیـە ، مێژونوسـان ڕای جیاوازیـان لەسـەر هەیـە، هەنـدێك پێیـان وایـە کـە (بەربەری یەمەنیە)، هەندێکی دیکە دەڵێن(زنجیە) یـان (بەربـەری مەغریبیـە). هەنـدێکیش دەڵێن (دەشـتەکی)بـووە و لـە مەککـە فرۆشـراوە و خەلیفـە مەنـصور کڕیویـەتی ، دوای بەخـشیویەتیە کوڕەکـەی (مەهـدی). مەهـدیش خواسـتویەتی و دوو منـداڵیان بـووە (ادی : کـوڕە گەورەکـەیان ، هارون ڕەشید: کوڕە بچوکەکەیان). بڕوانە/ سمیرة تحـسین الفیلـی: نـساء في حیـاة الخلیفـه هـارون الرشید. واسط.

جاریەکی یەمانیە، لە بەناوبانگترین ئافرەتەکان بووە لە بەغداد لە دەورەی مێردەکەی خەلیفە(مەهدی). یەکەم ئافرەتی گەورەیە کە لەولاتدا ئەوەندە دەسەلات و جەماوەری بوبێت. یەکەم ئافرەتە کە لەگەلّ گەورە وەزیرانی دەولەتدا کۆبوبێتەوە و خەلکی بۆ سکالا چوبێتنە لای و بەشێوەیەکی بەرفراوان ڕوی کراوە بوبێت لە بەرامبەر کۆبونەوەی بەرفراوانی داواکاری خەلکدا و گوێی لێگرتبن و بەدەم داوایانەوە چوبێت. خەلیفەی باوەڕدارانیش (مەهدی) بەم کارە زۆر دلخۆش بووە و هەمیشە دەست خۆشی لێکردووە. بەلام کاتێ لە دوای (مەهدی / هادی) کوڕی هات، کارەکانی ئەوی کۆت و بەندکرد و خەیزەرانی لەو پۆست و دەسەلاتە دارنی و لەولاشەوە ئەوەبوو (هارون ڕەشید)ی کوڕی زیندانی کردو هەڕەشەی کوشتنی لێکرد ئەگەر بێت و بەیعەت بە کوڕەکەی نەدات کە ئەو کاتە تەمەنی (٢)سالێ بوو. لە یەکێ لە دانیشتنەکانیاندا دەبێتە مشتومڕ لە نێوان (هادی و خەیزەران) و هادی دەلێ: تەنها ئەوەی لەسەر تۆیە نوێژ و تەزبیحاتی خۆت بکەیت و تەواو. ئەمەش خەیزەرانی بەتەواوی تورە کرد کاتێ بینی کوڕەکەی ئەوی لە هەموو دەستێوەردانێکی دەسەلات دورخستۆتەوە و کارە نەشیاوەکانیشی لە کۆشکدا ئەنجامی ئەدان، کە خەلّکی بەتەواوی بێزارکردبوو، تاوەکو ئەوەی لە دۆخێکی نادیاردا کوژرا (پێشتر ڕونکراوەتەوە) ، کە بە شەوی خەلیفە دەناسرێ:

- خەلیفەیەك دەمرێ (هادی).
- خەلیفەیەك دێتە سەر کار(ڕەشید).
- خەلیفەیەك لە دایك دەبێت(مەئمون).

خـەیزەرانیش هـەمان دەسـەڵاتی خـۆی کەلەسـەردەمی مێردەکەیـدا هەیبوو وەرگرتـەوە ، بـەڵام ئەمـە زۆری نەخایانـد و دوای دوو سـاڵ و نیـو نەخۆش کەوت و وەفاتی کرد.ئەمەش ڕەشیدی زۆر نارەحەتکرد، ئەوەبوو لەگەڵ خەڵکیدا بەڕێکەوت بـۆ ناشـتنی و بـۆ خـۆی چـووە نێـو گۆڕەکـە و دایکی ناشت و پاشان نوێژی لەسەر کرد.

٢. زوبێدە کچی جەعفەر* :

زوبێـدە یەکێکـە لـە باشـترین ژنـە بـەڕێز و گـەورەکان ، خـاوەنی ئەقڵێکی فـراوان و کـراوە و کەسـێکی رۆشـنبیر و دوربـین و خێزانێکـی بـە ئەمەك و شارەزابوو. زوبێدە کچی ئەبوجەعفەری مەنصور مـامی ڕەشـیدە ، لـەدەورەی مەهدیـدا بـووە خێزانـی و خـودا منـداڵێکی پێـدان ناویاننـا (محمـد) کـە پاشـتر نازنـاوی (ئـەمین)ی وەرگـرت. ئـەم کوڕەیـان لەگـەڵ فێرکردنەکانی دایکی شـارەزای قـسەکردن و ڕەوانبێـژی عـەرەبی بـوو کـە پاشتر بووە خاوەنی زمانێکی ڕەوانی عـەرەبی و لەلایـەن زانایـانی گـەورە فێری :(دەسەڵات و قودرەتی ئەمیر ، نابێت کەسێکی قسە تاڵ و زۆر بلـێ بێت ، لە بارەی بەرێوەبردنی دەسـەڵات و یاسـا سیاسـیەکان و چۆنیەتی

---

* ناوی زوبێدە کـچی جەعفـەری کـوڕی مەنـصوری هـاشمی عەباسـیە. کونیـەی (ئـوم جەعفـەر)ە، خێزانی هارون ڕەشیدە کە کوڕی مامیـەتی و دایکـی کوڕەکـەی ئەمینـە. لـە دایك بـووە لـە سـاڵی (١٤٥ك) ، لە کۆشکەکەی باوکیدا ئەبوجەعفەر بـووە. کەسـێکی زۆر بـەرێز و خۆشەویـست بـووە . جەعفەری باوکی زۆری خۆشدەویست کە ناوی نابوو (أمه العزیز) یان (أم العزیز) ، هەروەها دەڵێن زوبێـــدە نازناوێکـــە بـــاپیری (مەنـــصور) لێـــی نـــاوە، بـــەهۆی گـــەورەیی و زیرەکـــی زۆریـــی لەڕادەبەدەریەوە. شوی بە هارون ڕەشید کرد لەساڵی (١٦٥ك) دا لە دەورانی خیلافەتی (مەهـدی) لە بەغداد. وەفاتی کردووە لە بەغداد لە جـەمادی یەکـەمی سـاڵی(٢١٦ك/ ٨٣١ز). بڕوانـة/ سمـيرة تحسين الفيلي: نساء في الخليفة هارون الرشيد، واسط.

ڕەفتارکردن لەگەڵ گەورە و سەرداراندا و چۆن بتوانیت خـەڵکی لـە خـۆت ڕازی بکەیت)کرا.

زوبێدە خاوەنی ڕوحیەتێکی زۆر باش و پاك بوو، هەمیشە ماڵەکـەی کراوەبوو بۆ کەسانی دامـاو و لاواز و پەککـەوتوو کـە هاوکـاری و یارمـەتی پێشکەش دەکردن و دەستی یارمەتی خـۆی بـۆ ڕادەکێـشان، بۆیـە لـەنێو خەڵکیدا بە (السيدة العظيمة) نـاودەبرا. ئـیبن تـەعزی بـردی لـە وەصـفیدا دەڵێ:(أعظـم نـساء عـصرها دينـا أصـلا وجمـالا وحياتـه ومعروفـا). ئـیبن جوبەیریش لە ڕێگای مەککەدا دەیگوت:(هەموو شـوێنەکان لـە بەغـدادەوە تاوەکو مەککە جێ دەستی زوبێدە خاتونی پێوەیە و ڕێگاکـە شـوێنەواری میهرەبانی ئەوی پێوە دیارە).

زوبێـدە خـاتونێکی گـەورە و بەخـشندەبوو، گـەورەیی دیـارە لـە شارستانیەت و بوژانەوەی وڵات و سۆزی لەبەرامبەر ئـەدیب و پزیـشکان و شاعیراندا. بـڕی(٥٠٠٠) دیناریـدا بـە جبرائیـل بـۆ ئـەوەی چارەسـەری ئـەو نەخۆشە هەژارانە بکات کە توانای پێدانی پارەی دکتۆریان نیە.

زوبێدە دەستگیرۆیی حاجیـانی دەکـرد، بـەدابین کردنـی ئاوبۆیـان و یارمـەتی هـەژارانی دەدا بـە دابـین کردنـی پێویـستیەکانیان. هەسـتا بـە هەڵکەندنێك بۆ ئەهلی مەککە ئەمەش لە شـێوەی روبـارێکی رۆیـشتودا لـە (بیت الحرام)ەوە کاتێ باران نەبوایە. بۆ ئەم کـارەش پێویـستی بەبـەردی گـەورە و کرێکـاری زۆر و ئەنـدازیاری شـارەزا و بـەتوانا هـەبوو لەگـەڵ دابینکردنـی پێداویـستیەکانی جێبـەجێکردنی پرۆژەکـە و پێـدانی پـارەش تاوەکو کارەکەیان بە جـوانی جێبـەجێ بکـەن. ڕاکێـشانی ئاوەکـەش بـەم شێوازە بوو :(لە کارێزەکـانی حونـەین لەشـاخی تـاو بـۆ بـاکوری عەرەفـە

بەدرێژایی(٣٥کم)لـە مەککـە. ئـەوی دیکەشـیان لـە دۆڵـی (نعمـان)ەوە لـە خواروی شاخی (کیسرا)وە بۆ رۆژهەلاٌت و رۆژئاوایی عەرەفات بە درێـژایی (١٠کم) ، درێژایی ئەم راڕەوەش بەبەرد ڕوپۆشکرابوو ، ئاوەکەش دەبـووە دوو بەش ، یەکێکیان بۆ عەرەفات و ئەوی دیکەشیان بۆ مزگەوتی نمـرە). هەروەها چەندین خانوی لەڕێگای مەککەدا دروسـتکرد بـۆ ئـەو هەژارانـەی کە توانایی کڕین و دروستکردنیماڵیان نەبوو.

زوبێـدە لـەماوەی ژیانیـدا چـەندین مزگـەوتی بنیاتنـاوە ، لەوانـە: مزگـــەوتێکی لـــە دەوروبـــەری بەغـــداد دروســـتکرد لەلایـــەن ئیمـــامی (دارالخلافە)وە نـاونرا (مزگـەوتی زوبێـدە) هـەروەها چـەندین مزگەوتیـشی لەنێوان (دەرگای خوراسان و دارالرقیـق) دروسـتکرد، لـە کۆشکیـشدا ئـەو جاریانەی لای بون فێـری قورئـان لەبـەرکردنی کردبـون و رۆژانـە قورئـانی پێدەخوێندن.

زوبێدە لەبەرامبەر ناڕەحـەتی کوشـتنی کوڕەتاقانەکـەی (ئـەمین)دا ئافرەتێکی بە سەبر و ئارام بوو، وە نەبوە کەسـێکی گێرەشـێوێن و داوای کوشـتنەوەی ئەوانـە بکـات کـە کوڕەکـەیان لـیٚ سـەند، بـەڵکو لەگـەڵ خیلافەتی مەئمونیشدا ڕێك بـوو ، تەنانـەت مـەئمون بـۆ خـۆی چـەند جـار سەردانی دەکرد و ئەویش پێشوازی لێدەکرد.

زوبێدە بەم شیعرە کوڕەکەی دەلاواندەوە:

أودى بألفين من لم يترك الناسا فامنح فؤادك عن مقتولك الباسا

لما رأيت المنايا قد قصدن له أحبن منه سواد القلب والراسا

فبت متكنا أرعى النجوم له أخال سنته في الليل قـــرطـــــاسا

والموت كان به والهم قارنه حتى سقاه التي أودي بها الكاسـا

رزئته حين باهيت الرجال به وقد بنيت به الدهر أســــــاسا

فليس من مات مردودا لنا أبدا حتى يرد علينا قبله نـــــاسا

٣. عەباسە[*] :

یەکێکـە لـەو کەسـایەتیانەی کـە بۆتـە فیتنـەی پێکـدادانی نێـوان (ڕەشـید و بەرامکـە)، لـە کاتێکـدا مێـژوو بـۆ خـۆی سـاغی نەکردۆتـەوە تەنانەت ناوی چیە؟! ئایا ناوی عەباسە یا مەیمونە یا علیە یە؟!.

عەباسە یەکێکە لەو کەسایەتیانەی نـاو مێـژوو کـە زۆرتـرین چـیرۆکی خەیاڵی و وتـەی ئەفـسانەیی و ڕوداوی هەڵبەسـتراوی نـاڕون و نـاڕێکی بـۆ دروستکراوە. یەکێکە لەو کەسـایەتیانەی کـە بۆتـە کارەکتـەری سـەرەکی زۆرێك لە نوسەرانی چیرۆکە درامایییـەکان و مێژوونوسـەکانی ئێـستاش کـە هەمووی بریتیە لە ئەفسانەوخەیالآتەکانی مەسعودی لە (مـروج الـذهب)دا، کارەکتەرە سەرەکیەکانی ئەم دەورەیەش :

عەباسە + جەعفەر × زوبێدە + ڕەشید = لێك هەڵوەشان.

عەباسە و جەعفەر دوو کەسـە عاشـقەکەن ، کـە لەزۆربـەی دانیـشتنەکاندا بەشیعر یەکتریان لاواندۆتەوە و بە چاویش تێکەڵاوی یەکتر بون. زوبێدە و هارونیش دوو دڕکەکەی هەموو داستانێکن ، زوبێدە هـەواڵ هێنەرەکەیـە و هارونیش پیاوە گونـدە و بـێ دڵ و هەسـتەکەیە کـە ناهێڵێـت دوو عاشـقە سەرشـێتەکە بەیـەکتری بگـەن. مەسـعودی باسـەکەی بـەم شـێوازە داڕشـتوە:(عەباسـە پەیوەنـدی نهێنـی و ژوانـی یـەکتربینینیان هـەبووە، تەنانەت لەگـەڵ دایکـی جەعفەریـشدا. دایکـی جەعفـەر لـە ڕێگـای پێـدانی

[*] عەباسە یاخود علیەی کچی مەهدی کوڕی مەنصور ، لەبەنی عەباس ، خوشکی هـارون ڕەشـید ، ئەدیب و شاعیر و ئاوازدانەر بووە و خاوەنی جوانیەکی بێ وێنە بووە لـە کۆشـکدا و زمـان پـاراو و خاوەنی عەقلێکی سەلیم بووە . بڕوانە/ www. Mesopotamia.com

دیـاری بەنرخــەوە ، عەباســەی بــەلای خۆیـدا ڕاکێـشاوە و بــە جەعفــەری دەوت: ئەم جاریە جوانە سەرنجی منی ڕاکێشاوە) واتە دایکی جەعفەر لـە چیرۆکەکەدا دەبێتە دەلاڵی گەیاندنی ئەم دوو عاشقە بەیـەکتر ، تائـەوەی شـەوێکیان جەعفـەر لـە چـاوەڕوانی ئـەودا ئەوەنـدە شـەراب دەخواتــەوە تاوەکو بەتەواوی سەرخۆش ئەبێت، بۆیە هەرئەو شەوە کاتێ دێتە دیداری جەعفەر کاری خۆی ئـەنجام ئـەدات و عەباسـەش پـاش ماوەیـەك منـداڵێك دێنێتـە دنیـاوە. ئەمـەش ناشـارێتەوە و لـە دوای ئـەوەی خێزانـی ڕەشـید (زوبێدە) دەزانێ ، دەیگەیەنێتەوە لای مێردەکـەی (ڕەشـید). ڕەشـیدیش ئەبێتە بورکان و ئەتەقێتەوە و تەواوی بەرامکەکان ئەسوتێنێ! !

سەمیرە تەحسین ڕەتی وەها کارێك ئەداتەوە کە باس لە پەیوەندی جینسی ئەم خاتونـە بکـات لەگـەڵ جەعفـەردا و هۆکـاری تەشەنەسـەندنی ئـەم ڕوداوەش لـەنێو خـەڵکی و چـینی ڕۆشـنبیراندا بەتایبـەتی بـۆ (قـصة العباسة)ی جۆرجی زیـدان و شـانۆی (العباسـة)ی شـاعیری میـسری (عزیـز أباضة) و هەندێ لە ڕۆژهەڵاتناسەکان دەگێڕێتەوە کە گرنگیان بـەوە داوە ..... ئەگەر نا کەسانێکی وەکو (تەبەری و ئیبن خەلدون) بەهیچ شێوازێك باسـیان لـەوەها پەیوەندیـەك نـەکردووە و ئەمـەش بەسـەرابێك دەبینـێ کەلەپێش چاوی خەڵکیدا دروستیان کردووە[1].

بەڵام ئەگەر ڕوداوێك ئەوەندە گرنگە ، کە لە مێژوی ئیسلامیدا ڕەنگـە دوبارە نەبێتەوە:

بۆچی تـاوەکو ئێـستا نـازانرێ ئایـا عەباسـە بـووە یـان نـا ؟ ئایـا ڕەشـید خوشکی بووە بەو ناوەوە؟ ئایا ئـەم دوو عاشـقە کـە وێنـەیان نـەبووە لـە

---

[1] www. Mesopotamia.com

زیرەکیدا ، چۆن کارێك دەکەن کە نە شەرع نە کۆمەڵگا نە کۆشکیش نەیگرێتە خۆی؟ لە کاتێکدا باسی عەباسە دەکرێت و دەوترێت:(زۆربەی کات لەسەر بەرماڵ بووە و نوێژی کردووە و موناجاتی لەگەڵ خوادا کردووە) ئیتر چۆن فریوی جەعفەرێکی شەراب خۆر دەکەوێ؟ چۆن ئەسڵەن تەماشای نێو چاو ترشاوێکی وا دەکات؟، تاوەکو فریوی شەیتانیانەی خۆی و دایکی بخوات. لەبەرامبەریشدا کە باسی جەعفەر دەکرێت ، دەوترێت ڕەشید بۆیە سەرکەوتوو بوو لە خەلیفەیدا چونکە هاوڕێکەی جەعفەر بوو . دەوترێت جەعفەر خاوەنی گیرفانی خۆی نەبووە و هەمیشە دەستی کراوە بووە بەڕوی هەژاراندا . کەسێکی ئەوەندە و ئەوەندە ئیماندار بووە ، ئەی چۆن ئاوا هەڵەیەکی گەورەی کرد، کە خۆی و بنەماڵەکەی تیابرد؟ نەبیری لەکارەکەی کردەوە: چ لەم دنیا و چ لەو دنیا؟! چۆن قبوڵی کرد بێتە ماڵەکەی و فریوی بخوات ، کاتێ ئەم سەرگەرمی عیبادەت بوو؟

لێکۆڵەری گەورە مامۆستا(محمد فەرید وجدی)لەژێر ناوی (جەعفەری کوڕی یەحیای بەرمەکی لەبەرچی ڕەشید کوشتی!) لە پاش هاتنە سەر ئەم زەواجە ناڕێك و ناشەرعیە ، دەڵێ:(ڕەشید بۆ خۆی هیچ کات ڕێگرنەبووە لە هاتوچۆکانی مەیمونەی خوشکی بۆ دانیشتنە ئارەزوییەکان و مۆسیقاییەکان، ئەمەش ئەم کارەساتەی دروستکرد کە هەواڵەکەی تا ماوەیەکی بەرفراوان لەنێو خەڵکیدا بڵاوبۆوە[1]).

نوسەری سەرکەوتوش (عەبدولواحد باش أعیان)دەڵێ:(ئەم جیاوازیە لە ناوی ئەم پاڵەوانە کە دەوڵەتی عەباسی لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا

[1] مجلة الهلال الخاصة بالرشيد، ص١١٧٧، أغسطس ، سنة ١٩٤٠.

هەژاند. بەڵگەیە لەسەر ناڕاستی ڕوداوەکە..... چونکە لە کتێبە مێژوییەکاندا هیچ لایەنێکی شاراوەی عەباسیەکانی باس نەکردووە باسکردن بێت لە دڵداری و خۆشەویستی و ئارەزووبازی،[1]....). بەڵکو پلەی ئەویان بەرزکردۆتەوە بەسەر ئافرەتەکانی نێوکۆشکی بنەماڵەی پاشایەتی لە زیرەکیدا. پرسیار ئەمەیە ئەگەر عەباسە لەسەر ئەوە کوژراوە کە بەشداری لە دانیشتنە شیعریەکاندا کردووە و شیعری خوێندۆتەوە. ئەی بۆچی ڕەشید لە بەرامبەر خێزانەکەی (زوبێدە) و خوشکەکەی (علیە)دا هیچ ڕێگریەکی نەکردووە کە زیاتر لە هونەرێکدا بەشداریان کردووە (شیعر و ئەدەب و .....).

٤. علیەی کچی مەهدی:

خوشکی ڕەشیدە ، لەدەورەی مەنصوردا لەدایك بووە و باوکی مەهدیە و دایکیشی (مەکنونە)یە کە جاریەکی تێگەیشتوو و پێگەیشتوو بوو لە شیعر و ئەدەب و مۆسیقادا. علیە لە ماڵێکی ئەدەبیانەدا نەشونمای کرد و شیعرەکانی لەبەر دەکرد کە پاشتربووە شاعیرێکی باش، ڕەشیدیش هەستی بەم گەورەییەی کردبوو، بۆیە زۆر جار دەچووە سەردانی و گوێی لە شیعرەکانی و ئاوازەکانی دەگرت، لەبەرامبەریشدا زوبێدە خاتونیش پەیوەندیەکی باشی لەگەڵدابووە و زۆرجار کارەکانیان بەیەکەوە ئەنجام ئەدا لە بواری ئاوازدانان و ئەدەبدا چونکە زوبێدە لە هەڵسوکەوت و خوڕەوشتی علیە زۆر ڕازی بوو و زۆریشی خۆشدەویست.

لە پاشاندا علیە شوی کردە یەکێ لە ئەمیرەکانی بنەماڵەی عەباسی(موسا کوڕی عیسای هاشمی) و لە پاش ئەمەوە هەموو سەروەت

---

[1] لە گۆڤاری الرسالة ، العدد ٩٧٣. ١٨/ ٢/ ١٩٥٢.

و سامانەکەی لە (میسر و عێراق و شام)ەوە هێنایەوە و لە (بەغداد)دا خستیە گەڕ و لەوێ کۆشکێکی گەورەیان دروستکرد لەسەر کەناری ڕوباری دیجلە نزیك بە کۆشکی زوبێدە (دارالقرار)و کۆشکی ڕەشید (دارالخلد).

باس لەوە دەکرێت کە شەوانە (ڕەشید یان علیە )چونەتە سەردانی یەکتر و ئەوشەوەیان بە شیعر خوێندنەوە تەواوکردووە . جارێکیان ڕەشید گوێی لە دوو بەیتە شیعری تازە بوو بە ئاواز و دەنگێکی بەرزەوە:

بنى الحب على الجور فلو أنصف العاشق فيه لسمج

ليس يستحسن في شرع الهوى عاشق يحسن تأليف الحجج

ئەویش پرسیاری کرد، لەو کەسەی کە بەیتە شیعرەکەی دەوت و وتی: خاوەنی ئەو بەیتە شیعرە کێیە؟ ئەویش وتی: دەڵێن شیعری ئەمیر علیە. پاشان ڕەشید هەستاو وتی : ئەتوانم داوات لێبکەم تەنها لە خۆتەوە بیبیستم؟ ئەویش بێدەنگ بوو. ڕەشیدیش دەرکی بەوە کرد کە خوشکەکەی حەزناکات براکەی گوێی لە دەنگی بێت بەتایبەتی کە شیعرەکەی لاواندنەوە بێت و براکەشی ئەمیری باوەڕداران بێت!

هەروەها دەوترێت :(ڕەشید هیچ کات نەیدەتوانی لە دوری خوشکەکەی بژێت ، بۆیە لە کاتی دەرچونەکانی بۆ دەرەوەی بەغداد لەگەڵ خۆیدا ئەیبرد. ئەوەبوو ڕۆژێك چونە (رەی) لە ڕێگادا ڕەشید فەرمانیدا کە ئامادە بن لێرەدا پشویەك بدەن ، لەوێ خوشك و برا وەکو کاری هەمیشەییان دانیشتن و دەستیان بەخواردنەوە و شیعر وتن کرد، پاشان ڕەشید پرسیاری لێکرد، گەشتەکەت بەلاوە چۆنە؟ ئەویش وتی:

ومغترب بالمرج يبكي لـــشجوه

وقد غاب عنه المسعدون على الحب

إذا ما أتاه الركب من نحو أرضه

تنشق يستشفي برائحة الركـــــــب

لێکۆلەری گەورەی ئەدەبی(دکتۆرە عاتکە خـەزرەجی) دەڵـێ:(ئـەم بەیتە شیعرەی لە دوری عەباسی کوڕی ئەحنەفدا وتووە).

لە (گۆڤاری الرسـالە ، ژمـارە ١٠٣٦، ٢١/ ١١/ ١٩٦٣) هـاتووە:(ئـەو کیژۆڵەیە کامەیە ، کە عەباسـی کـوڕی ئەحنـەف لـە شـیعرەکانیدا بـەناوی فوز ناوی بردووە؟ ئەمیرە علیە کـچی خەلیفـە مەهـدی و خوشـکی هـارون ڕەشـیدە لـە دیوانەکانیانـدا دەردەکـەوێ کـە پەیوەندیـەکی عاشـقانە لـە نێوانیاندا هەبووە و ئاڵوگۆڕی بەیتی شیعریان هەیە لە کتێبە ئەدەبیەکاندا ، وتراویــشە کــە علیــە دینێکــی باشــی هــەبووە نــەگۆرانی وتــووە و نەشەرابیشی خواردۆتەوە جگە لەو کاتانەی کە توشـی بـێ نوێـژی بـووە ، کاتێکیش پاکبۆتەوە دوبارە پێشوازی لە نوێژکردووە و دەستی کردۆتەوە بــە خوێندنــەوەی قورئــان و کتێبــە دینیــەکان . عەباســیش زیــاد لــە چەندجارێك لە شیعرەکانیدا دەڵێ: فوز کاتێ پاکبوایە لـە خـوا دەترسـا و پارێزگاری لە پیرۆزییەکانی دین و شەعائیرەکانی ئیسلام دەکرد).

ئەم لێکچون و تێکچونەی دکتۆرە عاتکە لەنێوان کەسایەتی (علیە و فوزدا) تەنها لێکدانەوەیەکی خۆیەتی . دکتۆر (یوسف حسین بکار)یش لـە کتێبی (اتجاهات الغزل في القرن الثاني الهجري) وەڵامـی ئـەوی داوەتـەوە و دەڵێ:(عەباس لە ڕوی کۆمەڵایەتیەوە بەهیچ شێوەیەك لە پلـەی ئـەمیرەدا نــەبووە و بەشــێوەیەکی ڕاســتەوخۆ نــەیتوانیوە بــچێتە کۆشــکی ئەمیرەوە(علیە). یاخود لە ڕێگای نامەناردنەوە بەشـێوازێکی ناڕاسـتەوخۆ

، پاشـان دەڵـێ: ئـەو علیـە لـە چوارچـێوەی پەیوەنـدی کۆمەڵایەتیـدا ، پەیوەندی لەگەڵ هەردوو کەسایەتی (طل و رشا) و بەهیچ شێوەیەك نـاوی (عـەباس)نەهاتۆتـە سـەر زمـانی، لـە دیوانەکـەی عەباسیـشدا چـەند دەربڕینێکی زبر و وشك و تۆڵەسێنانە هەیە کە ناگونجێت ئاراسـتەی کـچی مەهدی و خوشکی هارونی کردبێت!

لەم چـەند دەربڕینانـەوە لەمـەڕ کەسـایەتی (علیـە) تێدەگـەین کـە چەندین رای پێچەوانە و دژبەیەك هەن، بۆیە لەمەڕ بابەتێکی ئاوا نهێنیەوە ناتوانین بگەینە ئەنجامێکی یەکانگیر کـە بـۆ خـۆی بـەهیچ شـێوەیەك ڕون نیە و بەڵکو ڕاستەفینە ئەوەیە کە لەسەرەتاوە ئاماژەمـان پێـدا لـە نـاو و کەسایەتی.

## ئایا ئەبو نەواس شاعیری ڕەشید بووە؟

لە کتێبی هەزار و یەکشەوە و کتێبـە ئەدەبیەکانـدا چـەندین هـەواڵت بەرچاو دەکەوێت لەمەڕ پەیوەندی(ڕەشـید و ئـەبو نـەواس) کـەباس لـەوە دەکـرێ چـۆن بەسەرخۆشـی چـۆتە دانیـشتنەکانی ڕەشـیدەوە و شـیعری وتووە و شەرابی خواردۆتەوە ! ئەمەش بۆ خۆی تەواو پێـچەوانە ئەسـوڕێ لەگەڵ ویقاری ڕەشید و گەورەی ئەمیری باوەڕداران .....

بونی ئەبونەواس و پەیوەندی لەگـەڵ ڕەشـیددا ، بەهـەمان شـێوەی کەسایەتی (بـارول یـان بـەهلول یـان جحـا یـان هەیاسـی ژیـر)ە کەلەگـەڵ هەریـــەکێك لـــە دەســـەڵاتدار و کاربەدەســـتەکان بـــووە لەســـەردەمە جیاوازەکاندا. ئەبونـەواس لەگـەڵ ئـەوەی لـە دەورانـی ڕەشـیددا ژیـاوە ، بەڵام بەهیچ شێوەیەك نەچۆتە کۆشکی ڕەشیدەوە و بەڵکو ئەوە خـەون و خەیاڵاتی ئەو ئەدەب دۆستانە بووە کە لەسـەر ژیـان و بەرهەمـەکانی ئـەم

کەسایەتیەیان نوسیوە. کەسێکی وەك(ئیبن مەنزور)خاوەنی کتێبی(معجم لسان العرب) بۆ یەکەم جار وتە و شیعرەکانی ئەبونەواس کۆدەکاتەوە و زۆربەی چیرۆکەکانیشی پەیوەست بەپەیوەندی (ئەبونەواس و ڕەشید)ەوە تۆمارکردووە، بەلاّم بۆ خۆی لە پێشەکی کتێبەکەدا دەڵێ:(هیچ بەڵگەیەك نیە لەبەردەستدا ، کە باس لە پەیوەندی ئەبونەواس و ڕەشید بکات ، منیش تەنها کۆمکردونەتەوە).

مامۆستای گەورە ( عەبدولحەمید عەبادی) لە بەشێکی سەربەخۆدا باس لە پەیوەندی ڕەشید و ئەبونەواس دەکات لە گۆڤاری (الهلال) لە ژمارەی (تایبەت بە ئەبی نەواس) لە (أغسطس ، ١٩٣٦، ص١١٩٧) لەژێرناوی :(الرشيد وأبونواس ..... هل كان النواسي نديما للرشيد):
بەکورتی ئەبونواس نەچۆتە بەغداد جگە لە ساڵی (١٧٩ك) ، بەهۆی ڕێگری بەرامکەکان، بەلاّم لە دوای کارەساتی بەرامکەکان کەبەسەریاندا هات لە ساڵی (١٨٧ك) ، تا ئەوکاتەش هیچ بەیتێکی نیە لەبارەی ڕەشیدەوە ، تەنها ئەم بەیتە شیعرە نەبێت کە لە وەصفی (فەزڵی کوڕی ڕەبیع)دادەڵێ:

قولا لهارون امام الهدى      عند احتفال المجلس الحاشد
أنت على مابك من قدرة      فلست مثل الفضل بالواحد
ليس على الله بمستنكر      أن يجمع العالم واحد

مامۆستا عبادی ، تەنها سێ بەیتە شیعر دێنێتەوە کە ئەبونەواس بۆ پیرۆزبایکردن نوسیویەتی:

خلق الشباب وشرتي لم تخلق      ورميت في غرض الزمان بأفوق

ئەمەی بە موناسەبەتی سەرکەوتنی ڕەشید وتووە بەسەر نقفوردا ، لە ساڵی ١٨٧ك.

هەروەها:

لقد طال في رسم الديار بكائي          وقد طال ترداديي بها وعنائي

دەوترێ ئەمەشی لە ساڵی ١٨٩ك دا نوسیوە، کاتێ ڕەشید کوڕەکەی (قاسم) نازناوی (المؤتمن)ی لێناوە. ئەوی دیکەشیان :

حي الزمان إذا الزمان زمان          وإذ الشباك لنا حرى ومعان

دەوترێ ئەمەشیان لەساڵی ١٩٠ك نوسیوە، کە ڕەشید کڵاوێکی قوچی لەسەرکردبوو(مێزەری لەسەر نابوو).

عبادی پاشان دەڵێ:(کاتێ شیعرەکانی تەشەنەیان سەند لەنێو خەڵکیدا و شیعرەکانی ئارەزووی بون و لەگەڵ جیهانی ئیسلامیدا نەیاندەخوارد، بۆیە لە دەستیاندا و دەستیان بڕی و پاشان بە تۆمەتی زەندیقی و وتنی بەیتە شیعری جنێوفرۆشی و جینسی زیندانی کرا). ئەمەش بۆ خۆی جێگای تێرامانە شاعیرێك لە کۆشکی خەلیفەدا بێت کەچی لەدوای ئەوەی خەڵکی لە دژی ڕاپەڕن و بڵێن ئەو شاعیرە (فاسیقە و زەندیقە) ، ئینجا بیگرن و لە زینداندا توندی بکەن.

لە بارەی ئەبو نەواسەوە دەوترێ:(ئەمانە گشتی چیرۆکی باوەڕپێنەکراو (موضوع)ین لەنێوان ڕەشید و ئەبونەواس. ئەبونەواس بەهیچ شێوەیەك نەچۆتە لای ڕەشید و نەشی بینیوە[1]).

---

[1] ابن المنظور أخبار أبي نواس/ مقال الهلال ، ص ١٢٠٣. نقلا عن كتاب ابن منظور ، ص٢١٧.

ڕەشــيد هــيچ كــات حــەزى لــە شــاعيرانى (غــەزەل) نــەبووە و نەيهێشتووە لـە دەورى بـن ، جگـە لـە (عـەباس كـوڕى ئەحنـەف)، وەكـو دەڵێ:

ملك الثلاث الانسات عناني وحلك من قلبي بكل مـكان

مالي تطاوعني البرية كـلها وعطيعهن وهن في عصيانـي

ما ذلك الا أن سلطان الهوى وبه قوين أعز من سلطانـي[١]

هەروەها لە كاتى شادومانى ڕەشيددا دەڵێ:

إذا ماشئت أن تصنع شيئا يعجب الناسا

فصورها ها فـــوزا وصور ثم عــباسا

وقس بينهما شـــبرا فإن زدت فلا باسـا

فإن لم يدنوا حـــتى ترى رأسيهما راسا

فكذبها بما قاســت وكذبه بما قاســى[٢]

لە دانيشتنێكى شيعرى ڕەشيددا، ئەصمەعى دەيويست كە گاڵتـە و تەحەروش بكات بە عەباس و دەيويست ئەو بەيتە شيعريەى بشێوێنێ كـە لــەبارەى دوو عاشــق ، يــەكێكيان (دور: كيژۆڵــە) و دووەميــشيان(فلــق: لاوەكە)لە كۆشكى ڕەشيددا، بەم شێوازە بۆ ڕەشيد خوێنرايەوە:

إذا أحببت أن تصنع شيئا يعجب الخلقا

فصورها هــا ها دورا وصورها هنا فـلقا

فإن لم يدنوا حـــتى ترى خلقيهما خلقا

فكذبه بما لاقـــت وكذبه بما يـــلقى

---

[1] ديوان العباس بن الأحنف ، ص٣١٣.

[2] هـ.س ، ص١٨٨.

ئەمەش شێوازێکی (هوی)ی ڕێگە پێدراوە، کە بۆ ڕەشید خوێنرایەوە ، عەباسیش دەڵێ: ئەصمەعی دوایی ڕەزامەندی لەسەر نیشاندا.

هەروەها لە گەشتێکیشدا بۆ خوراسان، لە کاتی دەرچونیان لە بەغداد ، ئەم بەیتە شیعرەی وت:

قالوا خراسان أقصى مايرادبنـا       ذم القفول فقد جئنا خراسـانا

نأى الذي كنت أرجوه وامـله       أما الذي كنت أخشاه فقد حـانا

ما أقدر الله أن يدني على شحط       جيران دجلة من جيران جيحـانا

عين الزمان أصابتنا فلا نظـرت       وعذبت بفنون الهـجر ألـوانا

ياليت من نتمنى عند خلـوتنا       إذا فلا خلوة يـوما تمنـانا[١]

ئەم بەیتانە گەیشتەوە ڕەشید ، ڕەشیدیش فەرمانیدا (٣٠)هەزار درهەمی پێ بدەن. گومانی تێدانیە کە هیچ شاعیرێکی ڕەوشت نزم و سەرخۆش لەگەڵ ڕەشیددا دانەنیشتووە ، نە ئەبونەواس نە ئەبو عتاهیە نە موسلم کوڕی وەلید نە مەنصور نمێری نە مەڕوان کوڕی حەفصە. هیچ کاتیش ڕەشید گوێی لە وەصفەکانیان نەگرتووە جگە لە عەباس کوڕی ئەحنەف ، ئەویش کەسێکی سەرخۆش نەبووە و تەنها ئەم سێ وەصفەشی لە بارەی ڕەشیدەوە هەیە چونکە ڕەشد یەکێك بووە لەوانەی زۆر ڕەخنەی لە شیعری (مەدح)کردن گرتووە.

بێینەوە سەر مەسەلەی (ئەبونەواس) ، کتێبە ئەدەبیەکان گشتیان لەسەر ئەفسانەی کتێبی (هەزار و یەکشەوە) ڕۆیشتون و هیچ کات نەیانتوایوە شتێکی واقیعی و مێژویی و عەقڵی لە مەڕ کەسایەتی ڕەشید و هاوەڵانیەوە بڵێین بەڵکو هەرکەسە و بە ئارەزووی و هەوا و نەفسی خۆی

---

[1] ديوان العباس ، ص٣١٢.

قسەی دارِشتووە و بە بێ ڕەچاوکردنی سەردەم و کات و واقیعی خەڵکی ئەوکاتە. لێکۆڵەر دکتۆر(محمد کوری عەلی هەرفی) لە کتێبەکەیدا لەژێرناوی (هارون الرشید بین السیرة الواقعیة والسیرة الشعبیة) باس لەوە دەکات ئەم چیرۆکانەی لە بارەی ڕەشید و ئەبونەواسەوە نوسراون بریتین لە فەرهەنگی (کلتوری) گەلی و ئەگەر بمانەوێت شتەکان لەگەڵ واقیعدا بەراوردبکەین، ئەوا توشی ڕەخنە و پێکدادانی دژبەیەك دەبین. یاخود لە نمونەی کتێبی (ئەغانی ) جگە لەوەی هیچ مەنتیقێکی تێدانیە بەڵکو نوسەر هاتووە لە نمونەی چیرۆکەکانی هەزار و یەکشەوەوە چەندین چیرۆکی نوسیوە کە تەنها لە کەسێکی گێل و هیچ نەزان ئەوەشێتەوە کە تەنها مەبەستی بێت درۆ بکات و درۆ بخاتە مێژووەوە، وە هیچ ئامانجێکی لەوەدانیە بیەوێت سەردێکی مێژویی بە واقیعی و دوور لە هیچ درۆیەك بگێرێتەوە.

وەرگێڕانی کتێبی (هەزار و یەکشەوە) لەلایەن ئەوروپیەکانەوە، دەرگای درۆ و ساختەکاری بەڕوی هەرکەسێکدا زیاتر والأکرد کە بیەوێ بەشێوازێکی ناحەزانە لەسەر ئەم دەورە و خودی کەسایەتی ڕەشید بنوسێ ، وەکو ئاشکرایە خۆرئاوا ڕقێکی توندیان لە مەڕ ڕەشید هەیە ، بەهۆی ئەو دەسەلأتداریەتە بەرفراوانە و ئەو پەستانە گەورەیەی لەسەر ئەوروپا داینابوو..... کەسێکی وەکو (جیمس موير)مان هەیە کە نوسەرێکی ئینگلیزیە لە کتێبی (حاجی بابا أصفهانی) دا کە باس لە بارودۆخی ئێران دەکات لە سەدەی (١٨)هەمدا بە گێرانەوەیەکی باش !!، لەوێدا باس لە چیرۆکێکی دوروو و درێژی نێوان (ڕەشید و سەرتاشێکی بەغدادی) دەکات بەنێوی (علی سەقا) ، دەبینین ئەم ڕوداوە

دەبەستێتەوە بە ڕوداوێکی سەدەی (١٨)ەوە ! ! لەگەڵ ئەوەی چیرۆکەکە چیرۆکێکی فارسیە نەك عەرەبی.

## جەباری بەنی عەباس

لە نوسراوەیەکی مێژونوسی گەورە (محمد كرد علی)لەژێر ناوی(جبار بني العباس ليس بالمستهتر الماجن[١]) دەڵێ:(جەباری بەنی عەباس لەبەرامبەر ڕۆمەکاندا بێ وێنە بوو، ئەوەبوو کوڕەکەی قاسم هێرشی کردەسەریان و پەنجا هەزاری لێکوشتن و چەندین کەشتی بارهەڵگر و جەنگیش پڕکرا لە ئاڵتون و ئاژەڵ و هێنایانەوە لەگەڵ خۆیان. ئەمە جەباری بەنی عەباسە، کە پێچەوانە هەڵدەسورێ لەگەڵ کتێبە ئەدەبی و موحازراتەکاندا) وەلامێکیشە بۆ کتێبەکەی (سترستین)کە دەڵێ:(دەورەی ڕەشید سەرەتای لێك هەڵوەشان و داڕوخانی دەوڵەتی عەباسیە). پاشان دێینەوە سەر نوسینەکەی (محمد كرد علی)دەڵێ:(دەورەی ڕەشید و مەئمون ، دەورەی درەوشاندنەوەی بەنی عەباسە و خۆشبەختی خەڵکیە و مێژونوسە ئیفرنجیەکان بە دەورەی ئاڵتونی ناوی دەبەن. بەلام سترستین باس لەوە دەکات ئیبراهیمی کوڕی ئەغلەب کاتێ بووە بەڕێوەبەری ئەغالبە لە ئەفریقیا دەبوایە ساڵانە چل هەزار دیناری ناردبووایەتەوە بۆ پایتەخت، بۆیە ئیبراهیم ڕق ئەستور بوو لەبەرامبەر ئەو باجی سالانەیە و لەدوای ئەوەی بڕی سەدهەزاری لە میسر برد سەربەخۆیی ڕاگەیاند. بەلام لەڕاستیدا ئەغالبە بەدرێژایی دەسەلاتی ڕەشید نەڕق ئەستوربون و نەسەربەخۆش بون ، بەڵکو بەشێك بون لە خیلافەتی عەباسی لە دەورەی ڕەشیدا و توشی جەنگی ناوخۆیی

---

[١] مجلة الهلال ، أغسطس ١٩٤٠. العدد الخاص بالرشيد ، ص١١٠١.

نەبونەتەوە، وە هێمنی هەبووە لەگەڵ دەوڵەتی ئومەوی لە ئەندەلوس و ئباضیەی خەوارج و هاوەڵانی دەوڵەتی ڕستمیە لە جەزائیر و هەروەها کوڕی ئیدریسی کوڕی عەبدوڵڵای پاشای طنجە لە وڵاتی مەغریبی دوور. هیچ کات بیری لە فەتحی صقلیە و مالتە و جەزائیر نەکردۆتەوە. هەمیشە کارەکانی هێمنانە بەرێوەبردووە، دوور لە کێشە و دوبەرەکی و ئاژاوەنەناوە).

هەروەهای خاڵێکی گرنگ لەبارەی (جەباری بەنی عەباس)ەوە لەم دەورەیەدا ئەوەیە : لە کۆندا وتویانە شوێنەکانی دونیا چوارن : (هرقلە ، دمشق ، رەی ، سەمەرقەند)، ڕەشید هەرچوار شوێنەکەی دونیای لە ژێر دەستدابوو.

مامۆستا (محمد کرد علی) بەراوردێك دەکات لەنێوان (ڕەشید و مەنصور)دا دەڵێ:(مەنصور لە ماوەی دەسەڵاتیدا گومانی خراپی بە خەڵکی دەبرد و حەزی بەوە دەکرد هەمیشە قسەی سواربێت و فیکرەی بسەپێنێ و نەخشەکانی خۆی جێبەجێ بکات. هەموو دەسەڵاتەکان لەژێر دەستی خۆیدابن و ئەگەر نەنگیەك یان کێشەیەك ڕوی بدایە خێرا لە ڕێگای هێزەوە چارەسەری دەکرد. بڕواکردنی بەخەڵکی زۆر کورت بوو ، زۆر لە خیانەتکردن و سەربزێوی کردن سڵی دەکردەوە و سەرکوتی دەکردن. هیچ کات فرسەتی دووەمی بەکەس نەدەدا و بۆیە هەمیشە خەڵکی لە دورترین شوێنەوە وا هەستی دەکرد مەنصور چاوی لەکارەکانیەتی ، ترسی خەڵکی لە مەنصور هەموو ویلایەتەکانی گرتبۆوە ، هەربۆیە هیچ کات حاکمەکان نەیاندەتوانی خیانەت و سەرپێچی بکەن). بەلام:

(ڕەشید خاوەنی بونیادێکی گەورەی کەسێتی بوو ، لە تەمەنی ٢٢ساڵیدا بووە خەلیفە و لە تەمەنی ٤٥ساڵیدا وەفاتی کرد. بەلاّم مەنصور لە تەمەنی ٤٠ساڵیدا بووە خەلیفە و خیلافەتەکەشی لە ٢٠ساڵ زیاتری خایاند). سەردەمی ڕەشید خەڵکی لە ڕەفاهیەت و خۆشیدا دەژیان. هەموو کاروبارەکان لەژێر ئیدارات و کاروپیشەدا بون. ڕەشید بۆ خۆیشی پرسی بەگەورە و بچوك دەکرد لە کارو کردەوەکانیدا و لە مەڕکێشەکانی ولاّتەوە، ئیشراف هەبوو بۆ پێداچونەوە و چارەسەرکردن و هەڵسەنگاندنی، هەروەها سیاسەتی گشتی دەوڵەت هەبوو سەرەرای ئەمەش بونی بەرامکەکان کە یارمەتی دەرێکی باشی ڕەشید بون لە کاروباری ولاّتدا.

مامۆستا (عەلی ئەدهەم) لە (الهلال ، ص١١٣٦)دا دەڵێ:(ئەخلاقی مەنصور ، لە ئەخلاقێکی ناسراو دەچێ کە بونیادی دەوڵەتەکەی دەنێ و گەشە بە دەوڵەتەکەی دەدات. ڕەشیدیش ئەو کەسەیە شارستانیەت دروست دەکات. یەکەمیان نمونەی کەسێکی توند و ڕەقە و دووەمیشیان نمونەی کەسێکی بەخشندە و میهرەبانە).

مامۆستا (عەبدولعەزیز بەشری)لەژێر ناوی (شوێنی ڕەشید بەشێوەیەکی گشتی و تایبەتی) باس لەو چیرۆکانە دەکات کە ئەمیری باوەڕداران بە کەسێکی شەهوانی و سەرخۆش دەزانن و ، لە پاشاندا دەڵێ:

(ڕەشید کەسێکی خوداپەرست بووە. فەرمانی بە چاکە و ڕێگری لە خراپە کردووە . گوێی لە گۆرانی نەگرتووە. ئەو خواردنەوەیشی کە خواردویەتیەوە سەرخۆشکەر نەبووە و لەلایەن فەقیە و ئیمامەکانەوە

فەتوای حەڵاڵی دراوە. بەڵام دەبینین کە چیرۆکەکان زیادەڕەویزۆریان تێداکراوە و لە سنوری عەقڵی تێپەریان کردووە...... لە کۆتایشدا دەڵێ:(رشيد، رجلا عالما فقيها أديبا شاعرا محاضرا كاتبا خطيبا[١]).

کۆتایی دێنین بە وتەکەی (د. ئەحمەد ئەمین)کە دەڵێ:(باشە و خراپە دەبێت بەپێوەری ئەو سەردەمە بپێورێت کە تیایدااین). نمونەی رەشید دێنێتەوە و پاشان دەڵێ:(ناگونجێت ڕەشید بۆ خۆی کارێکی ئەنجام دابێت کە لەگەڵ کۆمەڵگا و ئەو یاسایانەی کە وڵاتەکەی پێ بەرێوەبردووە پێچەوانەبێت، بۆنمونە ناکرێ خەڵکی لەسەر دزی بگریت کە نەتوانی وڵاتەکەت لە ئەزمەی ئابوری ڕزگار بکەیت. یان خەڵکی لە لەشفرۆشی بپارێزیت کە وڵاتەکەت لە ئەزمەی ئەخلاقیدا بێت)[٢].

## وەفاتی ڕەشید

لە کۆتاییەکانی دەسەڵاتی خیلافەتی ڕەشیددا لە خوراسان (رافع کوڕی لەیس) لە دژی ڕاپەری و ئیعلانی دەسەڵاتی خۆی کرد، ڕەشیدیش بەرەو ڕەی کەوتە ڕێ ولەوێ نەخۆش کەوت[*]، سەرکردایەتی سوپاکەی

---

[1] الهلال ، ص١١٤٦.

[2] مجلة الثقافة ، العدد ٦٢٢، ١٩٥١/٩/٣.

[*] لە کتێبی (فرج المهموم في تأريخ علماء النجوم: ١/ ٧٦) دوو ڕوداو باس دەکات لە ژیانی ڕەشیددا کە گوایە پێش ئەوەی ڕوبدەن ئەستێرەناسان ئاماژەیان پێداوە ، ئەوانیش ئەمانەن:

١. لە ساڵی ١٧٠ك لەیەکێ لەشەوەکاندا ، مەلیکێك دەمرێ ، مەلیکێکی بەخشندەش دەبێ بە جێنشینی ، مەلیکێکی حەکیمیش لە دایك دەبێت : هادی ، ڕەشید ، مەئمون.

٢. ئەستێرەناسەکان ئەو ڕۆژەی دەرچووە لە بەغداد پێیان وتووە نەچێتە توس چونکە لەوێ وەفات دەکات، ئەویش لە وەڵامدا وتویەتی: فەرمانی خوا دراوە و براوەتەوە و سەرکێشی تێدا نیە.

دایە دەست مەئمونی کوڕی. مێژونوسان کۆتاییەکانی ژیانی ڕەشید بەم جۆرە باس دەکەن:

(بەیانیەکیان کاتێ جبرائیل کوڕی بختیشوع ی پزیشکی هات بۆ لای بزانێ حاڵی چۆنە ، وتی: دکتۆر ئەمشەو خەوێکم بینی، لە خەونەکەمدا بینیم دەستێك درێژبوو بۆ لای چاوم تاوەکو بووە باڵێك ، پاشان دەستەکە کرایەوە و پڕبوو لە خۆڵی سور ، من دەستەکە و خاوەنەکەیشم دەناسی . پاشان خاوەنی دەستەکە وتی: تۆ هەروەکو ئەم دەستە و بەقەد ئەم باڵە دائەپۆشرێی . ئینجا دەنگەکە نەما و دەستەکەش دیارنەما.... ئیتر منیش بەخەبەر هاتم و خەوم لێنەکەوتەوە.

جبرائیلیش پێکەنی و وتی: ئەمە تەنها خەیاڵێکە و هیچی تر ، خەتای ئەو نەخۆشیەی لاشەتە ، تۆ حاڵت باشە و رۆژ بە رۆژ باشتر دەبی.

گێرەرەوەکە دەڵێ: ڕەشید ئەم خەوەی لە ڕەی بینی و لە توس مرد.

کاتێ گەیشتنە توس نەخۆشیەکەی زۆری بۆ هێنا ، تاوەکو بۆیە لەبێستانێك لەوێ لایاندا ، ڕەشید دەستی لە خۆڵی سوری ئەوێدا و مشتێکی لێهەڵگرت و نزیکی کردەوە لە چاوی و پاشان وتی: ئەمە وەڵلاهی هەر ئەو دەستەیە کە لەخەوەکەدا بینیم! بەڵێ ئێستا کاتیەتی!

پاشان فەرمانیدا دەست بە هەڵکەندن بکەن. داواشی لە کەسێك کرد قورئان بخوێنێ، تاوەکو قەبرەکەیان هەڵکەند. یەکێ بە چاوی گریاناویەوە وتی : ماأغنى عني ماليه ، هلك عني سلطانية. پاش سێ رۆژ مانەوەیان لەوێ ، وەفاتی کرد و نێژرا.



مزگەوتی جامع عتیق لە قەزوین ، ساڵی ١٩٢ك/ ٨٠٧ز لەلایەن هارون ڕەشیدەوە دروستکراوە.



پارێزگای حەزرەموت ،کە یەکێکە لە پارێزگاکانی یەمەن دابەش دەبێت بۆ دوو بەش : دۆڵ و کەنار. ماوەی نێوانمیشیان ٣٥٠کم . لەو ناوەندەدا شارێکی مێژویی دۆزرایەوە ،لەلایەن یونسکۆوە کە چەندین ماڵ و مزگەوتی مێژویی تێدابوو ، گرنگترینیان مزگەوتێکە بەنێوی (مزگەوتی هارون ڕەشید) کە لەلایەن والی حەزرەموتەوە بنیاتنراوە بە فەرمانی هارون ڕەشید. بڕوانە/

http://images.google.com/imgres?imgurl=http://farm1.static.flickr.com/67/165547058_df253ce2e7.jpg&imgrefurl=http://www.mazameer.com/vb/t82590-3.html&usg

# باسی یەکەم
# زانست لەدەورەی مەئموندا

پاش کۆتایی هاتنی ململانێکەیان هەردوو برا ( ئـەمین * و مـەئمون ** ) لـە سـاڵی (١٩٨ك) کـە دەڵـێن (٢ سـاڵ و پێـنج مـانگی ) خایانـدووە[١] ، مەئمون بەیعەتی پێدراو بویە خەلیفەی موسڵمانان ، سەبارەت بە زانـای و زیرەکی مەئمون سەرچاوەکان بە گشتی باس لە زیرەکـی ئـەم خەلیفەیـە دەکەن وەك

---

* محمد لە ڕۆژی پێنج شەمە ، شەوی (١١) هەمی جمـادی یەکـەمی سـاڵی ( ١٩٣ك /٨٠٨م ) بـووە خەلیفە ، کوژرا لە (١)ی مانگی موحـەرەمی سـاڵی ( ١٩٨ك / ٨١٣م ) ، کونیـەی (ئـەبو موسـایە ) دەڵێن : ئەبو عەبدوڵلا ، کوڕی ڕشید هـارون کـوڕی ئـەبی عەبـدوڵلا مەهـدی کـوڕی ئـەبی جەعفـەر مەنصور ، دایکی زبێدە کچی جەعفەر مەنصور ماوەی خیلافەتەکەی ( ٤ ساڵ و ٨ مانگ ٥ ڕۆژ ) ٠ هەروەها دەڵێن تەمەنی ( ٢٧) ساڵ بووە ٠ بڕوانە : الطبری : تأریخ الطبری ،ج ٧ / ص٩٣ ٠ ابن الأثیر : الکامل فی التأریخ ، ج ٥ / ص١٦٧٠ .

** ناوی عەبدوڵلا مەئمون کوڕی هارونە ڕەشـید کـوڕی محمـد مەهـدی ، دایکـی مراجـل ، کونیـەی (ئەبوجەعفەر ) کاتێ بەیعەتی پێ درا (٢٨) سـاڵ و (٢) مـانگ بـوو ، لـە(طـرسـوس) وەفـاتی کـرد ساڵی (٢١٨ك/ ٨٣٢م) کە تـەمەنی (٤٩) سـاڵ بـوو ٠ مـاوەی خیلافەتەکـەی (٢٠) سـاڵ (٥)مـانگ و (٢٣) ڕۆژ ٠ بڕوانە ابن الاثیر الکامل ،ج ٥ / ص٢٢٧ ٠
الطبری : التأریخ الطبری ،ج ٧ / ص٢١٠-٢١١ . مسعودی : مروج الذهب ، مجلد الرابع / ص٤ ٠

[1] مسعودی ، مروج الزهب ، مجلد الرابع / ص٤ ٠

ئیبن جەوزی دەڵێ : ( مەئمون هەموو قورئانی لەبەر بوو ، گوێی لە فەرمودە ئەگرت لەمالك كوڕی ئەنەس و حماد كوڕی زید و هشیم ······ هەروەها زانینی ئەسنادی فەرمودەكاندا زۆر شارەزابوو) ٠

قاسم كوڕی محمد كوڕی عباد دەڵێ : ( بیستومە لە باوكمەوە دەیگوت : هیچ كام لە خەلیفەكان قورئانیان لەبەر نەبووەجگە لە عوسمان و مەئمون) ، هەروەها دەیگوت:(مەئمون قورئانی زۆر دەخوێند) [1].

جورجی زیدانیش دەڵێ : ( كەسێكی عاقلێ ، دانا، بەخشندە و نەرمونیان بوو، حەزی زۆر لە زانست و كۆكردنەوەی زانایان و گفتوگۆو لێكۆلینەوە و بە دەستهێنانی زانستە پێشینەكان بەتایبەتی فەلسەفە بوو) [2] .

## أ. زانستە نەقلّیەكان:

### ١. خوێندنەوە:

داڕێژەرانی خوێندنەوەی قورئان بە (٧) جۆری جیاواز كۆتای هات لە دەورەی ڕەشیددا ، بەڵام لەم سەردەمەدا كۆمەڵێك لە پەیڕەوكارانی ئەوان دەركەوتن لە چەن ناوچەیەكی جیاجیا ، كە ئەوانیش بەم شێوەیە بوون [3]:

---

[1] ابن الجوزى ، المنتظم فى التأريخ الملوك والأمم ، ج١٠ / ص٤٩–٥٢ ٠

[2] الامين و المامون ، ص ١٩٧

[3] محمد على الصابونى : التبـاين في علوم القرآن ، ص ٢٣٠ – ٢٣١ ٠ شيخ محمد الخضرى بك : تأريخ التشريع الاسلامى ، ص١١٥–١١٦ ٠ د ٠ حسن ابراهيم حسن : تأريخ الاسلام ، ج ٢/ ص ٢٦٦ ٠

– مەدینە : عیسا کوڕی مینا ( مردووە لە ٢٠٥ك / ٨٢٠م ) ، کە پێڕەوی ( ئەبو رویم نافیع کوڕی عبدولرەحمان کوڕی ئەبی نعیم ئەللەیسی ، ئەسڵی ئەسفەهانیە ، مردووە لە ( ١٦٩ك / ٧٨٥م ) ٠

– مەککە : ئەبو حەسەن ئەحمەد کوڕی عەبدوڵلا ئەلبزی، مردووە لە ( ٢٠٥ك / ٨٢٠م) پێڕەوی

( ئەبو محمد عەبدوللا کوڕی کەثیر ٠ [*] ئیمامی خەڵکی مەککە بووە لە زانستی خوێدنەوە )دا ٠

– بەصرە : هەریەك لە یەحیا ئەبو عەمر، مردووە لە ( ٢٤٦ ك / ٨٦٠م) هەروەها( ئەبوشوعەیب صالح کوڕی زیاد سوسی ) ، مردووە لە(٢٦١ك /٨٧٥م ) کە پێڕەوی (ئەبو عەمر زبان کوڕی علا کوڕی عەممار بەصری ، مردووەلە کوفە لە ساڵی ( ١٥٤ك/ ٨٠٠م)٠

– دیمەشق : ئەبو وەلید هیشام کوڕی عەممار دیمەشقی مردووە لە (٢٤٥ك / ٨٥٩م) هەروەها ئەبوعەمر عەبدوڵلا کوڕی ئەحمەد کوڕی بەشیر کوڕی زکوان مردووە لە (٢٤٢ك/٨٥٦م) پێڕەوی (عەبدوڵلا کوڕی عامر)بون ٠ [**]

---

[*] ناوی ئەبو محمد عەبوللا کوڕی کەثیر داری مەکی ، ئیمامی خەڵکی بووە ، تابعینە ، ئەم زانستەی وەرگرتووە لە عەبدوڵلای کوڕی زوبێر ، ئەبا ئەیوب ئەنصاری ، ئەنەس کوڕی مالك ٠ ئەم زانا گەورەیە مردووە لە ساڵی ( ١٢٠ك / ٧٣٦م ) ٠بڕوانە محمد علی الصابونی : التباین ، ص٢٢٠ ٠ ابن الندیم : الفهرست ، ص٤٨ ٠

[**] ناوی عەبدوڵلا کوڕی عامرە ، قازی دیمەشق ، لە خەلافەتی وەلید کوڕی عەبدلمەلیك ، کونیەی (ابا عمران ) ، تابعینە ، خوێندنەوە فێربووە لە لای (مغیر کوری ئەبی شهاب مەخزومی ) ئەویش لە عوسمان کوڕی عەفان ئەویش لە پێغەمبەر ، مردووە لە دیمەشق لە ساڵی (١١٨ك/ ٧٣٤م) ٠بروانە : ابن الندیم : الفهرست ، ص٢٢٨ ٠

– كوفه : خەلف كوڕی هیشام بزاز ، مردووه لە ساڵی ( ٢٢٩ك/ ٨٤٣م) هەروەها (عیسا كوڕی خالید) مردووه لە ساڵی (٢٢٠ك/ ٨٣٥م) كە پێڕەوی حەمزە كوڕی حەبیب زیات بووه · هەروەها( ئەبو حەرث لیث كوڕی خالید ) مردووه لە (٢٤٠ك/٨٦٤م) پێڕەوی (ئەبوحەسەن عەلی كوڕی حەمزە كسائی ) خوێندویەتی لەلای ( حەمزە كوڕی حەبیب ) مردووه لە ساڵی (١٧٩ك/ ٧٩٥م) ·

٢. تەفسیر:

دووجۆر لە تەفسیرمان هەیە لە مێژووی ئەم سەردەمەدا :-

یەكەمیان : بریتین لەو تەفسیرانەی كە بەجێماون لە (محمدﷺ) و یارانی بەشێوەی پشتاو پشت ·

دووەمیان : بریتییە لە تەفسیری (رەئی )، كە پەیوەست بونە لە سەر عەقڵ زیاتر لە پەیوەست بون بە نەقڵ لە نمونەشیان (موعتەزیلی و باطنیە كان )[1].

سەبارەت بە جۆری یەكەم (ئیبن نەدیم ) ڕوداوێكمان بۆ دەگێرێتەوە و دەڵێ : ( عومەر كوڕی بەكیر نوسی بۆ فەراء [*] ، كە ئەمیرحسن كوڕی سهل هەندێ جار پرسیارم لێ دەكات لەبارەی قورئانەوە بەلاّم ئامادە نیم وەلاّمی بدەمەوە (مەبەستی لە تەفسیركردنی قورئان بووه )، فەرائیش ڕۆژێك بۆ ئەمە چووە مزگەوت پیاوێك بانگی ئەدا بۆ نوێژ ، ئەویش پێیوت

---

[1] د· حسن ابراهیم حسن : تاریخ الاسلام ، ج٢/ص٢٦٧ ·

[*] ناوی ئەبو زكریا یەحیا كوڕی زیاد لەدایك بووه لە كوفە مردووه لە ڕێگای ( مەككە ) لە ساڵی (٢٠٧ك/ ٨٢٣م) لە كتێبەكانی كەلەم بوارەدا نوسیویەتی (معاني القرآن ) و (مصادر في القرآن ) و(الجمع والتثنية في القرآن) و···· بڕوانە / ابن النديم : الفهرست ، ص١٠٠ ·

بخوێنه ، دەستیپێکرد له سورەتی (الفاتحـة)وه ، پیاوەکـه دەیخوێنـدەوە فەرائیش تەفسیری دەکرد ٠ ئەبوعەباس لـەبارەی ئەمـەوە ئـەڵێ یـەکێکی ترم نەبینیوە پێش لەم ئەم کارە بکات )، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئـەوەی کە بۆ یەکەم جار تەفسیری قورئان کرابێت بەشـێوەی دەربـڕین و پاشـان نوسـینەوەی لـە چـوار بەرگـدا لەلایـەن عومـەر کـوڕی بـەکیرەوە بـەناوی (معاني القرآن)له لایەن فرائەوە بووە .[1] ٠

لەبارەی شێوازی تەفسیرکردنەکەیەوە دەڵێن بەهۆی کاریگەریی فەلـسەفە و زانستی کەلام لەسەری، لـەدەربڕینی تەفـسیرکردنی ئایەتەکانـدا ڕەنگـی داوەتەوە، ئەمە بێجگە لەوەی کە فراء بۆ خۆشی کەسێکی ( نەحو ) یـە و چـەندین دانـراوی هەیـە لـەو بـوارەدا بـۆ نمونـە : ( حـدالنونین الـشديدة و الخفيفـة ، حـد الاسـتفهام ،٠٠٠٠٠٠ ) کـە زۆربـەی ئـەم کتێبانەشـی لەلایـەن قوتـابی خۆیـەوە (ابـا محمـد سـلمه کـوڕی عاسـم )ەوە هێڵراونەتـەوە کـە یەکێکە لە زانا گەورەکانی کوفە[2] ٠

سـەبارەت بـە جـۆری دووەم ، وەك ئاشـکرایە موعتەزیلـەکان لـە دەورەی مەئموندا دەورێکی گەورەیان گێـڕا و چـەندین کتێبـی تەفـسیریان بەرهـەم هێنـا ، کـە تیایـدا عـەقڵیان بـەکاردەهێنا بـۆ پێوانـە لەگـەڵ حەقیقەتـە دینیەکانــدا و ڕەتکردنــەوەی خورافــات و بینــشە پێــچەوانەکان لەگــەڵ سروشت و دەوروبەردا، لە بەناوبانگترینیشیان لەم دەورەدا تەفـسیرەکەی ( ئەبو بەکر ئەصم )ە[3] ، لەگەڵ چەند زانایەکی گەورەی سوننە ،لەوانە:

أ. روح کوڕی عبادەی بەصری(مردووە لە ٢٠٥ك).

---

[1] فهرست :ص١٠١ ٠

[2] هـ٠س ،ص١٠٢

[3] د٠ حسن ابراهيم حسن : تأريخ الاسلام ، ج٢ / ص٢٦٩ ٠

ب. عەبدولڕەزاق کوڕی همام ( مردووە لە ٢١١ك).

ج. ئادەم کوڕی ئەبی ئیاس (مردووە لە ٢٢٠ك)[١].

**٣. فەرمودە:**

فەرمودەش وەك ئاشکرایە سەرچاوەیەکی تری سـەرەکی شـەریعەتی ئیسلامە ، کە بـەجێ مـاوە لـە پێغەمبـەرەوە ولـەدوای قورئـان بـەدووەم سەرچاوە دادەنرێت[٢] ٠

لە گرنگترین ئەو کەسانەی بەدەرکـەوتن لـەم سـەردەمەدا بـۆ دۆزینـەوەی ئەم زانستە :

ـ ئەحمەدی کوڕی حەنبەل : [*]

زیرەکـی و بـەتوانای ئـەم ئیمامـە بـە ڕونـی دیـارە لـەبواری زانـستە دینیەکاندا ، چ لە بواری (فەرمودە) یاخود (فیقه) یان هەر زانستێکی تری ئیسلامیدا ٠ وەك ئبن عساکر دەڵێ : (شێخەکەی ئێمە کەسێکی شـەوکێف بووە ، زۆر نەرمونیان بـووە لـە قـسەکردندا ، چـارەکێکی قورئـانی لەبـەر بـووە لـە (٧) سـاڵیدا. لـە حـەوت سـاڵیەوە فـەرمودەی نوسـیوەتەوە، هەزارەها فەرمودەشی لەبەر بووە و نوسیویەنیەتەوە لە (١٢) بەرگـدا )[٣] ٠ لە بەغـدادەوە گـەراوە بـەدوای زانـستدا و پاشـان سـەفەرێکی دورودرێـژی

---

[1] د. عبدالمجید محمود مطلوب: مباحث في علوم القران والحدیث، ص١٩٢

[2] د٠ حسن ابراهیم حسن : تأریخ الاسلام ، ج٢/ ص٢٦٩

[*] ئەبو عەبدوللا ئەحمەد کوری محمد کوڕی حەنبـەل ئـیبن هـیلال کـوڕی ئەسـەد کـوڕی ئیـدریس شیبانی ، دایکی لە (مرو) سکی پڕ ئەبێ و لە بەغداد مناڵەکەی لەدایك ئەبێ لـە (١٦٤)ك/ ٧٨٠م ) لـەدایك بـووە لـە (٢٤١ك/ ٨٥٥م) وەفـاتی کـردووە ، هـەر لـە بەغـداد خوێندوویـەتی لـەلای ئیمـام شافیعی لە (حیجاز) ٠ بڕوانە / ابن الجوزی : مختصر صفه الصفوه ،ص ٣٦٦ ٠ خیرالـدین الزرکلـی : الأعلام ، ج٢/ ص١٢٠

[3] لە ابن الجوزی : مختصر صفهالصفوه ، ص٣٦٧ ٠ وەرگیراوە

دەستپێکردووە لە کوفەوە بۆ بەصرەو مەککە و مەدینەو یەمەن شام و ثغورومەغریب جەزائیرو فارس و خۆراسان و هەرێمی چیا ۰۰۰۰ ئینجا مەسنەدەکەی دانا لەسەر (۳۰) هەزار فەرمودە بەدوبارە بۆوە[۱] ۰

ـ دارمی :[**]

یەکێکی ترە لە لە فەرمودە ناسان لەو سەردەمەدا، گەشتێکی دورودرێژی کردووە بۆ کۆکردنەوەی فەرمودە صەحیحەکان ، ئەویش لە ( حیجاز ، شام ، میصر ، عێراق ، خۆراسان ) لە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی فەرمودەی کۆکردۆتەوە. فەقیه و موفەسیریش بووە ، لە کتێبەکانی لەم بوارەدا (المسند) ، (الجامع الصحیح ) کە پێی دەوترێت (سنن الدارمی) لەگەڵ (ثلاثیات)[۲] .

ـ بوخاری [***] (زانای ئیسلام ):

گەشتە دورودرێژەکەی دەستپێکردووە لەساڵی (۲۱۰ك/ ۸۲٦م) بۆ گەڕان بەدوای فەرمودەدا ناوچەکانی ( خۆراسان ، عێراق ، میصر، شام ) گەڕاوە پاشتریش گەڕاوەتەوە بۆ سەمەرقەند لە گەڕانەکانیدا نزیکەی

---

[1] ابن كثير: البداية والنهاية ،ج١٠ /ص٣٢٥–٣٤٣ ٠

[**] ناوی محمد عەبدوللاکوڕی عەبدولرەحمان کوڕی فەضل کوڕی بەهرام تەمیمی دارمی سەمەرقەندی ، لە سەمەرقەند لەدایك بووە ، لەساڵی (۱۸۱ك/۸٦۹م ) هەروەها کونیەشی بریتیە لە (ابو محمد)۰ بڕوانە، الدارمی، سنن الدارمی ، ص٧–١١

[2] د۰ شوقی ابوخلیل : اطلس السیرةالنبویة ۰ص٢٣٨

[***] ناوی ئەبو عەبدوللا محمد کوڕی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم کوڕی مغیرە بخاری ۰ لە ساڵی (۱۹٤گ / ۸۱۰م) لەدایك بووە لە بوخارا ، وەفاتی کردووە لە ساڵی (۲۵٦ك/۸۷۰م) لە (خرتنك) کە گوندێکی سەمەرقەندە ۰ لە گرنگترین دانراوەکانی : ( التاريخ الكبير ،التاريخ الصغير ، الاسماء والكنى ، الضعفا ، الصحيح ، السنن فى الفقه ، التاريخ الاوسط ، خلقه افعال العباد ، ....) ۰بڕوانە : ابن النديم ، الفهرست ، ص٣١٥ ۰ هەروەها ۰ د ۰ شوقی ابو خليل ، اطلس السيره النبويه ، ص٢٣٦ ۰

(١٠٠٠) شێخی بینیوەو (٦٠٠) هەزار فەرمودەی کۆکردووەتەوە پاشتر (٧٢٧٥) فەرمودەی لێ دەرهێناون کە صحیح و جێی گومان نەبوون، بەڵام دوبارەیان تیا بووە ئەوانیشی لێ دەرکردون (٤) هەزار ماونەتەوە، کۆیکردونەتەوە لەچەند بەرگێکدا بە ناوی (الجامع الصحیح) کە ناسراوە بە (صحیح البخاري)، ئەمەش بە یەکەم کتێب دائەنرێت لە مێژووی ئیسلامدا کە لەم بوارەدا نوسرابێت[1] .

شێخ محمد خضری بك ئەڵێ : ( ئەم دەورەیە پێکدەهاتن لە (٢٠٠) کەس لە ناسراوترین مەسانیدەکان وەك مەسنەدی ( عەبدوڵڵا کوڕی موسا کوفی ، مسدد کوڕی مسرهد بەصری ، ئەسەد کوڕی موسا مصری ، نەعیم کوڕی حمد خزاعی ، ئیسحاق کوڕی راهویە ، عوسمان کوڕی ئەبی شەیبە ، ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبل) کە جێگیریان دەکرد بە پێی مەسانیدی ڕیوایەتەکان و مەسنەدیان وەردەگرت لەئەبی بەکر صدیق و جێگیرکردنی لە هەموو ڕیوایەتەکاندا پاشتر لە هاوەڵە یەك لە دوای یەك ، بەڵام ئەوەی ئێمە لەم قۆناغەدا پێمان گەیشتبێت ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەلە)[2] ٠

**٤. فیقه:**

<u>ئەحمەدی کوڕی حەنبەل</u>

رەبیعی کوڕی سلێمان لە ئیمامی شافیعیەوە ئەڵێ ( ئەحمەد ئیمام بووە لە (٨) شتدا : فەرمودە ، فیقه ، زمان ، قورئان ، هەژاری ، زوهد ، لە خواترس ، سوننەت )[3].

---

[1] د. شوقی أبو خلیل : أطلس السیرة النبویة ، ص٢٣٦ ٠

[2] شیخ محمد الخضری بك : تأریخ التشریع الاسلامي ، ص١١٧

[3] ابن الجوزی : مختصر صفه الصفوه ، ص٣٦٨

ئیبراهیمی کوڕی حەرب دەڵێ : (هـاوەڵی ئیمـام ئەحمـەدم کـرد ٢٠سـاڵ ، هاوین و زستان ، گەرماو سەرما ، شەو ڕۆژ ، نەگەیشتوە بـە ڕۆژ ێـك کـە زیاتر نەبوبێ لە دوێنێی)[١]، ئیمـام ئەحمـەد و مەزهەبەکـەی خـۆی لەسـەر ئەم شەش خاڵ ڕێك خست، وە حوکمی بەم شەش خاڵە دەکرد:

یەکەم: دەقەکانی قورئان و سوننەت، ئەگەر تێیدا دۆزیەوە ئاوڕ بۆ هیـچی تر ناداتەوە.

دووەم: ئەگەر بۆ مەسەلەیەك دەقێکی نەدۆزیبایـەوە، بـۆ فتـوای هـاوەڵان دەگەڕایـەوە، ئەگـەر یـەکێکیانی پێگەیـشتبا، زانیبـای هـاوەڵێکی تـر پێچەوانەی نی یە، بۆ غەیری ئەو نەدەگەڕایەوە و هـیچ کـردەوەو ڕەئـی و قیاسێکی پێش ئەو نەدەخست.

سێیەم: ئەگەر هاوەڵان ئیختلافیان هەبێ کامە ڕایان لە قورئان و سـوننەت نـزیکتر بێـت ئـەوەیانی هەڵدەبـژارد، ئەگـەر بـۆی ڕون نەبوایـەوە کامیـان نزیکترە خیلافەکەیان باس دەکات و بە هیچ یەك لە ڕایەکان نایبڕێتەوە.

چوارەم: بە فەرمودەی مرسل و لاواز لە ناچاری حوکم دەکـات ئەگـەر لـەو دەورەدا لەو زیاتر نەبێت، لەکاتێکدا لاوازییەکەی پاڵپشتێکی هەبێت، هـیچ ئەسەرێ یان گوتەی هاوەڵێك یان کۆڕایەکی پێچەوانەی نـەبێت، لای نـاداو پێش قیاسیشی دەخات.

پێنجەم: قیاس لای بەڵگەیەکە بۆ پێویستی، کاتێك هیچ یەك لەو بەڵگانەی پێشتر نادۆزێتەوە پەنای بۆ دەبات.

شەشەم: بە (سدّالذرائع) واتە: لەزاراوەدا:گەیەنەرە بـۆ شـتێکی قەدەغـەی پێکهاتوو لە مەفسەدەدا. وەك سەیرکردنی ئافرەتی بێگانە، هۆکارێکـە بـۆ

---

[١] د. طه جابر العلوانی ئەدەبی ئیخلاف لە ئیسلامدا ، د. سەلاح و ئەندازیار عوسمان ، ص٩٨ -٩٩

زیناو ، حەرامکردنی ئەو سـەیرکردنە بـە (سـد الـذریع)ە دادەنرێـت حـوکم دەکات[1] .

هەروەها ئیمامی ( ظاهری) مردووە لە (٢٧٠ك ) کە بنەمای مەزهەبەکـەی : ( دەستگرتنە بە ڕواڵەتی ئایەتەکانی قورئان و سوننەت و پێشخستنیانە لە سەر رەچاو کردنی ماناو حوکم و بەرژەوەندییەك کەوا گومان دەبرێ لە پێناویدا ئەو شەریعە دانرابێت لای ئەوان کار بە قیاس ناکرێت ئەگەر هـۆی قیاس لەسەر کراو دەقی لەسەر نەبێ و قەتع نەبێ بە بـونی قیاسـکراو بـە شـێوەیەك حوکمەکـە بگاتـە ئاسـتی بەدەستخـستنی مەبـەس ( تحقیـق المناط) *[2]

## ب. گروپە فیکریەکان:

### ١. شیـعە:

مەئمون دەورێکی باشی هەبوو لە گەڵ ئـەهلی بەیتـدا و ئەمـەش لـە چەند شتێکدا بەرجەستە بوو ، لە وانە: بڕیاری دا رەنگـی رەش لاببرێـت و ڕنگی سەوز بەکاربهێنرێت کە نیشانەی ئەهلی بەیت و دروشمی ڕەسمییان بـوو. پـەیمانی دایـە (ئیمـام عـەلی ڕەزا) * و کردیـە وەلی عەهـدی خـۆی، ئەمەشی کرد دوای ئەوەی لە ساڵی ( ٢٠١ك / ٨١٦م) براکـەی( مـؤتمـن)ی

---

[1] هـ . س ، ص٩٨-٩٩ ٠

* ئەوەیە کە کرۆکی وەسفێك لەوەسفەکانی هۆی حوکمێك بزانێت ، وەك دەڵێن ( هۆی بڕینی دەستی دز دزیکردنە ) کارە مجتەهیدیش ئەوەیە هەوڵ دەدات بۆ زانینی کارێك کە هۆی تێدا بێت ٠

[2] هـ . س ، ص٩٩ —١٠٠ ٠

* ناوی عەلی کوڕی موسا کوڕی جەعفەر صادق ، کونیەی ( ئەبو حەسەن) ە دایکی ناوی (تکـتم) ، بەڵام لە سەرچاوەی تردا دەڵێن ( سمـان) ەی نـاوە ٠ مـاوەی ئیمامەتەکـەی (٢٠) سـاڵ بـووە. لـە ساڵی (١١) ی ذوالقعدة ی (١٤٨ك / ٧٦٥م) لەدایك بووە ٠ لە ساڵی ( ٢٠٨ ك/ ٨٢٢م) مرد ٠ بڕوانە / مؤسسة البلاغ : النفحات من السیرة ، ص١٩٨ ٠

لادا هەتاوەکو دەڵێن ( خۆی لابچێت و ئەولە جێگاکەی خۆی دابنێت ) پێدانی نازناوی (ڕەزا). لێدانی درهەم بەناویەوە[١] . پێدانی کچەکەی ( ام الفضل ) به (عەلی ڕەزا) هەندێك پێیان وایە دراوە بە کوڕەکەی ( محمد جواد) ** ئەمەش زیاتر لای شیعەکان هەیە لە ساڵی (٢٠١ك/ ٨١٦م)[٢].

شیعەکان کە ژمارەیان (٣٣) کەس بوو لە (ئەهلی بەیت) ڕایانگەیاند کە عەلی ڕەزا شایانترە بۆ خیلافەت ، بۆیە عەباسیەکان مەئمونیان بە گەورەترین مەترسی زانی بۆ ئاوابونی خیلافەت لە بنەماڵەکەیان و ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی کە مەئمون لابەرن و ئامۆزاکەی مهدی) دابنێن ، مەئمونیش کە هەستی بەم مەترسیە کرد فەرمانیدا بە ژەهرکردنە ناو ترێوە بۆی، بەپێی دانیشتنێك لە طوس ئیمام لێی خواردو کوژرا ، بەمەش مەئمون لە پشتگیری کردنی شیعەکان پاشگەزبویەوە فەرمانیدا بە ڕەفزکردنی ڕەنگی سەوز و لەبەرکردنەوەی رەنگی ڕەش[٣] . بەلاّم ئەوەشمان لە یاد نەچێ کە زیاتر مەسەلەی ژەهر خواردن و ڕوو وەرگێڕان و پەشیمان بونەوەی مەئمون زیاتر لە سەرچاوە شیعەییەکاندا بەرچاو دەکەوێ، ئەگەر نا لەسەرچاوەکانی دیدا واباسکراوە کە ئیمام بە مردنی ئاسایی مردووە.

---

[1] السیوطی : تأریخ الخلفاء ، ص٢٢٦ .

** محمد جواد کوڕی ئیمامی علی رەزا لە رە مەزانی ساڵی (١٩٥ك) لە مەدینەی منەوەرە لەدایك بووە . لە ساڵی (٢٢٥ك/ ٨٣٩م) مردووە ، دایکی خیزران ، کونیەی ( ابو جەعفەر ) .

بڕوانە : مؤسسةالمعارف الاسلامیة الثقافیة : الحیات السیاسة لأئمة اهل البیت ، ص٢٦٠ –٢٦١ . المعارف الاسلامیه ، ص٣٢٦ .

[2] مؤسسة البلاغ ، نفحات من السیرة ، ص١٩٨ . مؤسسةالمعارف الاسلامیة الثقافیة ، ، الحیاة السیاسةلأئمة اهل البیت ، ص ٢١٣ .

[3] محمد امین غالب الطویل : تأریخ العلوین ، ص١٧٣ .

**٢. سۆفیگەری:**

بەهۆی ئەو ئەقڵگەراییەی لە دەورەی مەئموندا هاتە گۆڕێ و جێی خۆی گرت لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە ، لە بەرامبەریشدا کۆمەڵێکی زۆر لە زاهیدان دەرکەوتن کە بە هەمووشێوازێك هەوڵیان دەدا ئەو بەدەمەوەچوونی دونیاییەی کەوا خەڵکی تێیکەوتون بگەڕێنەوە ، لەوانەش ئەبونەصربشیر کوڕی حارث حافی ( مردووە لە ٢٢٧ك/٨٤١م) کە لە بەغداد جێگیر بوو ، بەڵام ئەصڵی (مرو)یە لە بەغدادا دەورێکی باشی گێڕاوە لە هۆشیارکردنەوەی خەڵکی بۆ دوبارە گەڕانەوە بۆ پاکژکردنەوەی نەفسیان ، وەك دەڵێ: (من مەشغوڵم بە فەرزی سوننەتەوە ، واتە کۆشش لەگەڵ نەفس و پاکژکردنەوەی لە ڕەوشتە خراپەکان دەکەم) ٠ یاخود دەیگوت : ( دوو خەسڵەت هەن بۆ زیندو نەمانی دڵ : زۆرخواردن و خەو ) ٠ هەروەها دەیگوت : ( زانایانی پاك سێ کرداریان هەیە : زمانێکی ڕاستگۆ ، خواردنێکی باش ، زۆری زوهد لە دنیادا ). ئەم زانایە لە (١٠ی موحەرەمی ٢٢٧ك/٨٤١م) وەفاتی کردو لە بەغداد نێژرا[1] ٠

ئەبو حەسەنی سری کوڕی موخلس سقطی ( مردووە لە ٢٥١ك / ٨٦٥م) مامۆستا و خاڵی (جونەیدی بەغدادی )ومامۆستا لە سوننەت و زانستی یەکتاپەرستی[2] ٠

ئەم زانایە هەوڵی داوە دوبارە پاکی و بێگەردی بۆ کەسەکان بگەڕێنێتەوە ، وەك دەڵێ : (نەکەی نزیکی گۆرانیبێژان و میوانداری دوکاندار و ئەمیران

---

[1] جمیل ابراهیم حبیب : تأریخ متصوفه ، بغداد ، ص٧-١٢ ٠

[2] ابن کثیر : البدایه والنهایه ، ج١١/ ص١٣

بکەی چونکە دانیشتن لەگەڵیاندا خەسارۆمەندبوونە ) هەروەها دەیگوت : ( سێ شت خوای گەورە توڕە دەکات بەرامبەر بەندەکەی : زۆری یاریکردن ، گاڵتەو گەپ ، غەیبەت )[1] ٠

(هناد کوڕی سری ) [*]یش یەکێکی ترە لە و زاهیدانەی کەلەم سەردەمەدا دەورێکی باشی گێراوە ، لە مامۆستاکانی (فەضیل کوڕی عیاض ، هشیم کوڕی بشیر ) قوتەیبەی کوڕی بعید دەڵێ : ( نەمبینیوە تۆکمەترو گەورەتر لە هناد )[2].

لە باشترین و بەرچاوترین دانراوەکانی کتێبی( الزهد ) کەدابەشی کردووە بۆ چەن بەشی جیا جیا لە وانە (قیامەت ، شەهیدی ، قەبر ، زوهد لە خواردندا، لە جل و بەرگدا ، ٠٠٠، شەرم ، ئابروو، بێدەنگی ، ٠٠٠) ٠ تاوەکو دوبارە خەڵکی پەروەردە بکاتەوە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر فەرمویەتی .

حارث کوڕی ئەسەد ، ژمێریاری بەغدادی و زاهیدو ئامۆژگاریکەر و فەقیە و موتەکەلیم و سەرکەوتو ، لەگەل ئەمەشدا کەسێکی فەرمودەناس بووەو فەرمودەی نوسیوەتەوە ، ئیبن نەدیم باسی دەکات و دەڵێ : ( کتێبێکی زۆری هەبووە لە سەر زوهد ). لەهەمان کاتیشدا بەگژ فیکرەی موعتەزیلەدا چوەتەوە وەك فیکرەیەکی عەقڵانی کە بە یەکێك لە

---

[1] جمیل ابراهیم حبیب : تاریخ متصوفه بغداد ، ص١٤-١٥

[*] هناد کوڕی سری کوڕی موصعەب کوڕی ئەبی بکر ، ئەبو سری کوفی ، لەدایك بووە لە ساڵی (١٥٢ك/٧٦٩م) مردووە لە کۆتایی مانگی ڕەبیعی یەکەم ساڵی (٢٤٣ك/٨٥٧م) ٠ بڕوانە حاجی خلیفە : کشف الظنون (١٤٢٢/٢) ٠

[2] جمیل ابراهیم حبیب : تاریخ متصوفه بغداد ، ص١٤-١٥

دانراوەکانی دادەنرێت ( الـرد علـی المعتزلـه )، لـه بەغـداد مـردووه سـاڵی (٢٤٣ك/٨٥٧م) ٠

ئەبو عەبدوڵلاً حارث کوڕی ئەسید شارەزا بووه له زانستەکانی (ئـصوڵ و موعامه لاتیشدا ) له یەکێك له شـیعرەکانیدا کـه بـاس لـه غوربـەتی خۆی دەکات ، بەڵام راستی بـۆم نەدۆزرایـەوه کـه بـه ئەصـڵ ئـەم کەسـایەتییه خەڵکی کوێیه ، ئەڵێ :

| | |
|---|---|
| انا فی الغربة ابکــي | مابکت عین غریب |
| لم اکره یوم خروجي | عین مکانی بمصیب |
| عجب لي ولترکــي | وطنا فـیه حـــبیبي [1] |

٣. موعتەزیله:

له سـەردەمی عەباسـی زێڕینـدا دوو ڕوی جیـاواز پەیـدابو ، یـەکیان بریتی بو له دەستگرتن به پاشماوه و گەڕانەوه بـۆ دەقـی فـەرموده و واز هێنان لەسەر پێوانەو قیاس تەنها له ناچاریدا نەبێت ، دووەمیشیان بریتی بو له خستنه گـەڕی عـەقڵ و کردنـی بـه پێوانـه بـۆ لێکدانـەوەی مەسـەله ئاڵۆزەکان .

نمونەی یەکـەم ، فـەرموده ناسـان و لەپـشتیانەوه خـەڵکیش ، بـەڵام دووەم موعتەزیلـه بـون کـه هـەڵگری کردنـەوەی زانـسته تازەکـان بـون، ململانێ و ناکۆکی فیکری لەنێوان ئەم دو لایـەدا ڕویـدا لـه مزگەوتـەکان و حەلقه دەرسیەکاندا و چەکیشیان بریتی بو له بەڵگه و نمونه [2] .

[1] جمیل ابراهیم حبیب : تاریخ متصوفه بغداد ، ص١٧-١٨ ٠

[2] علي الطنطاوي : رجال من التأریخ ، ص ٩٩ .

مەئمونیش ، نزیکبۆوە لە دووەمیان و ملکەچ بوو بۆ جێبەجێ کردنی داواکاریەکانیان ، ئەمەش بەهۆی ئەو تێکەڵیەی وا دروست ببو لە لەنێوان موعتەزیلە و دەسەلاتی خیلافەتدا ، وەك لە بەشەکانی پێشودا باسمان لێوەی کرد کە چۆن موعتەزیلە لە ماڵەکانی بەنی عەباسدا خۆیان چەسپاند . ئیبن جوزی دەڵێ : ( مەئمون خۆشەویستی بۆ جۆرەها زانست هەبوو ، لە دانیشتنەکانیدا جۆرەها موتەکلمین دادەنیشتن و هەوڵیشیان لە تەنها بۆ سەرخستنی عەقلانیەکان بوو )، پاشتر دەڵێ : ( ئەمەش بۆسەرکەوتنی کۆمەڵانی جەهمیش ( مەبەست پێی موعتەزیلەیە )بوو لە نێو خەڵکیدا و پاشان بانگەواز بۆ کردنی[١] )، لە نزیکانیش لەم دەورەیەدا لە خەلیفەوە : (یەحیا کوڕی مبارك ، ئەبو بەشر کوڕی ثمامة ، ئەبو هذیل کوڕی عەلاف )بون[٢] . ئەمەش بویە هۆی گەشەسەندنێکی گەورەی فەلسەفە لە جیهانی ئیسلامیدا کەمێژونوسان هۆکاری ئەم گەشەندنەش جگە لەو هۆکارانەی وا باسمان لێوە کردن ، دەگەڕێننەوە بۆ دانانی ( ئەحمەد کوڕی ئەبی دؤاد ئیادی [*] ) بە قازی، کە پاشتر بووە هۆی دروستبونی پەیوەندی لەنێوان ئەو و خەلیفەدا ، لە ساڵی ( ٢٠٤ك / ٨٢٨م ) وە خەلیفە بە هەمان شێوە کەوتە ژێر کاریگەری ئەویش تاوەکو لە ژێر کاریگەری ئەودا بووە هۆی دەرکەوتنی مەینەتەکە ، کە لە مێژوی

---

[1] ابن الجوزي : الصواعق المرسلة ، ج١ / ص ٢٣١ .

[2] زهدى حسن جار اللة : المعتزلة ، ص١٦٢ .

[*] ئەبو عەبدوللا ئەحمەد کوڕی ئەبی دؤاد ، لەدایك بوە لە بەصرە ، لەساڵی ( ١٦٠ك / ٧٧٦م ) ، مردوە لە ( ٢٤٠ك / ٨٥٤م ) لە خەلافەتی خەلیفە متوکلدا . بڕوانە / ابن النديم : الفهرست ، ص٢٣٩ .

ئیسلامیدا ناسراوە بە ( المحنة) کە هەمو سەرچاوەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە ئیبن دؤاد بەرپرسیاری سەرەکیە لەو کارە .

کۆمەڵێکی زۆر لە گروپی موعتەزیلی پەیدا بون لەم سەردەمەدا لە ناودارترینیان :

یەکەم / الهذیلیە : هاوەڵانی ئەبی هذیل حمدان[**] ، کە ڕێبازی موعتەزیلی وەرگرتوە لەلای ( عوثمان کوڕی خالد طویل ) . کەسایەتیەکی گەورە بوە لە قوتابخانەی بەصرە ، بەناوبانگ بوە بە موناقەشەکردن و قەناعەت پێکردن . ئەبو هذیل خاوەنی ڕەوانبێژیەکی فراوان بوە لە دەربڕیندا و بەڵگەی دەهێنایەوە لە کاتی گفتوگۆیدا بە بەیتە شیعر و هەمو تەمەنی تەرخان کرد بوو بۆ موناقەشەکردن لەگەڵ زنادقەو مەجوسەکان و بتپەرستەکاندا ، هەتاوەکو لەبارەیەوە دەوترێت کە ( ٣٠٠٠) کەس لەسەر دەستی موسڵمان بون[١] . صالح لەبەیتێکیدا ئاماژەی پێدەدات و دەڵێ :

ابا الهذیل جزاك الله من رجل

فأنت حقا لعمري معضیل جدل [٢].

دووەم / الحفصیە : هاوەڵانی ئەبو عەمر حفص فرد ، نازناوی ئەبو یەحیایە و خەڵکی وڵاتی میصر بووە و ژیاوە لە کۆتاییەکانی سەدەی

---

[**] ئەبو هذیل محمد کوڕی هذیل کوڕی عوبیدوڵلا کوڕی مەکحول ، سەبارەت بەکاتی لەدایك بونی ڕای جیاواز هەیە ، هەندێ بۆ ساڵی ( ١٣٤ ك / ٧٧٥م ) دەگەڕێننەوە ، هەندێکی دیکە پێیان وایە ( ١٣٥ك / ٧٧٦م) لە بەصرە لەدایك بوە و لەوێ ماوەتەوە تا ساڵی ( ٢٠٤ك ) کاتێ مەئمون داوای کرد بێتە بەغداد . بەپێی سەرچاوەکان قوتابی واصل بوە ، بەڵام واصل ( ١٣١ك/ ٧٧٢م) ، مردوە ، یاخود عەمر کوڕی عوبێد ( ١٤٤ك / ٧٨٥م ) مردوە، کە بەپێی مردنیان قوتابی هیچ کام لەوانە نەبوە . بڕوانە / علي مصطفى الغرابي : تأريخ الفرق الاسلامیە ، ص١٤٨_ ١٤٩ .

[1] علي مصطفى الغرابي : تأريخ الفرق الاسلامية ، ص١٤٨ و ١٥٤

[2] . د. حسن ابراهيم حسن : تأريخ الاسلام ، ج٢ / ص ٢٧٦.

دووەم و سـەرەتای سـەدەی سـێیەم. لەسـەرەتاوە موعتـەزیلی بـووە و پاشتر گۆڕاوە بۆ جەبری ، وەك ئەم وتەیەی دەڵـێ : ( کردەوەکـانی مـرۆڤ خوا دروست کەریانە ، دواتر مرۆڤ ) ، سەفەری کرد بـۆ بەصـرە کەلانکـەی موناقەشەی موعتەزیلەکان بوو ، لەوێ گەیشت بە ئـەبی هـذیل ، بـەڵام لـە موناقەشـەکەیدا سـەرنەکەوت . لـە کتێبـەکانی سـەردەمی جەبریـدا : ( الاستطاعة ، الرد علی المعتزله ، التوحید ، الرد علی النصاری )[1] .

سێیەم / الجاحظیه [2]: هاوەڵانی ( ئەبو عثمان کوڕی بەحر کوڕی مـەحبوب ) بەهۆی خوێندنەوەی زۆری کتێبە فەلسەفیەکان و تێکەڵ بون لەگەڵیانـدا ، بـوە یـەکێ لـەپێڕەوانی گروپـی موعتەزیلـە ، ئەمـەش لـە مەقالـە ڕەوانبیژیەکانیدا دیـارە . ئەحمـەد کـوڕی مرتـضی ( مـردوە لـە ١٣٢٥ك / ٩٣٤م) لە بارەیەوە دەڵێ : ( نـەمبینیوە زمـان پـاراوتر لـە ئـەبی هـذیل و جاحظ ) .

جاحظ ( ١٦٣_ ٢٥٥ك / ٧٨٠_ ٨٦٩م ) ، لە بەصرە لەدایك بووە و گـەورە بـووە و مـردووە . لەبـەر ئـەوە کاریگـەری ئـەو سروشـت و ئاووهەوایەی لەسەر بووە کە لە ژیانیـدا کەسـێکی تونـد دەربـچێت، بـەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا کەسـێکی گـەورە لـەڕوی تێـڕوانین و وردبینـی و باسـی و بەهێزی لە دەربڕیندا . گۆج بوە لە کۆتایی تـەمەنیـدا و مـرد کـاتێ کەوتـە ژێر کتێبەکانیەوە .

چـوارەم / الراوندیـە : دامەزرێنـەری ئـەم گروپـە ( ئـەبی حـسین کـوڕی یەحیا کوڕی ئیـسحاق راوەنـدی ) ، ناسـراوە بـە ( ئـیبن ڕاوەنـدی ) ، لـە

---

[1] محمد عمارة : المعتزلة ومشكلة الحرية الانسانية ، ص٣١ .

[2] شهرستاني : الملل والنحل ، ج١ / ص ٥٣_ ٥٤. د. طة الحاجري : الجـاحظ حياتـة واثـارة ، ص ١٥ و ١٧٦ . ابن خلكان : وفيات الاعيان ، ج١ / ص٣٨٨ .

نێـوان سـالآنی ( ٢٠٥ _ ٢١٥ك / ٨٢٠ _ ٨٣٠م) موعتـەزیلی بـوە و دواتـر بووە دوژمنیان و ژمارەیەکی زۆر لەکتێبی دژ نوسین ، لـە ناودارترینیـان ( فصیحة المعتزلة ) ، ئەم کتێبەی ڕەد کرایەوە لە لایەن جاحظـەوە لـە ژێـر ناوی ( فضیلة المعتزلة )، دواهەمین کتێبیشی ڕەدکرایەوە لە لایەن ( ئەبی حسین خیاط )ەوە کە ناوی ڕاوەندی بردبو بە ( ابن الراوندی الملحد )[١] .

پێنجـەم / الثمامیـە : هـاوەلآنی ثمامـە کـوڕی ئەشـرس نمـیری ، لـە بیرباوەرەکانیانـدا لاوازی نـەفس نزمـی کۆبۆتـەوە، دەیـانگوت : ( فاسـق ئەگەر بە فسقەکەیەوە بمرێ و توبە نەکات ، ئەوا لە دۆزەخدا ئەمێنێتـەوە بۆ هەتا هەتایی ) . [٢]

شەشەم / النجاریە : دامەزرێنەری حسین کوڕی محمد ( مردوە لـە ٢٣٠ك / ٨٤٥م )لەگـەڵ موعتەزیلەکانـدا لـە چـەند خـاڵێکی پەیوەنـد بـە یەکتاپەرستیوە هاوڕان ، وەك ڕەدکرنـەوەی ئـەو سـیفەتانەی لـە کـەس و خوادایە ، قورئان مەخلوقە ، ئینکاریکردنی بینینی خوا لە ڕۆژی دوایدا[٣] .

بەهۆی ئەو گەشەسەندنە گەورەیەی موعتەزیلە بەخۆیـەوە بینـی لـە دەورەی مەئموندا ، لە کۆتایی فەرمانڕەواییەکەیدا ( ٢١٨ك / ٨٣٢م) بویە هۆی دەرکەوتنی مەسەلەیەکی وروژێنەر کە لە مێژوی ئیسلامیدا دەناسرێ بە ( میحنە ) ، دەرکەوتنەکەشی بۆ سێ خاڵی سەرەکی دەگەڕێتەوە[٤] :

---

[1] محمد عمارة : المعتزلة ومشكلة الحريـة الانـسانية ، ص ٣١_ ٣٢ . [1] شهرسـتاني : الملـل والنحـل ،ج١ / ص ٦٠ _٦١ .

[3] محمد عمارة : المعتزلة ومشكلة الحرية الانسانية ، ص ٣٢ _٣٣ .

[4] علي الطنطاوي : رجال من التأريخ ، ص ١٠٠ .

یەکـەم / گەشەسـەندنی زمـان پـاراوی و ڕەوانبیـژی و زانسـت فراوانـی و زۆربـونی هـاوەلآنی مەزهـەبی عـەقڵی ( راسیۆنالیـست ) کـە لەبـەردەمی ئەمانەشدا ئیبن ئەبی دۆاد بوو .

دوەم / بونی مەئمون و حەزکردنی لە فیکر و فەلـسەفە و فراوانـی و قـوڵی فیکری و کەوتنە ژێر کاریگەری زانستی وەرگێراو و وەرگێڕاو .

سێیەم / بەگـەر خستنی مەسـەلەیەك (مـەخلوقی قورئـان)، کـە پێویـست ناکات ئەوەندە گرنگـی پێبـدرێت ، چـونکە نەئـەرکانی دینـە و نـە خـوای گەورەش لە ڕۆژی دوایدا پرسیارمان لەبارەیەوە لێدەکات.

میحنەتەکە لە مێژوی ئیسلامیدا بەم شێوازە باسی لێوەکراوە [١]

﴿ ساڵی ٢١٨ك / ٨٣٢م و باسکردنی میحنەتی قورئانی مەجید ﴾

لـەم سـاڵەدا مـەئمون نوسـی بـۆ ئیـسحاق کـوڕی ئیـبراهیم لـە بەغـداد کەدادوەران و شایەتان و موتەکەلمین تـاقی بکەنەوەبـە قورئـان و بڕیـاری لەسەربدەن کە قورئان دروستکراو و نوێیـە و فەرمانبـدەن ببێتـە بڕیـار و کاری پێبکەن ، پاشانیش کتێبێك لەو بارەیەوە بنوسـرێت، وە ببنـە ڕێگـر لەبەردەم ئەوانەی ڕەفزی ئەوە دەکەن. کتێبەکە لە ڕەبیعی یەکـەمی ئـەو ساڵەدا لەلایەن حەوت کەسەوە قبوڵ کرا، ئـەوانیش: ( محمـد کـوڕی سـعد نوسەری واقدی ، ئەبو مسلم مستملی یەزید کـوڕی هـارون ، یـەحیا کـوڕی مـوعین ، ئـەبو خیثمـە زهـیر کـوڕی حـەرب ، ئیـسماعیل کـوڕی داود ، ئیسماعیل کوڕی ئەبی مەسعود ، ئەحمەدی کوڕی دورقـی ) ئەمانـە کـاتێ پرسیاریان لێکرا لەبارەی قورئانەوە، وەلآمی گشتیان ئـەوەبو کـە قورئـان

---

[1] ابن الاثير : كامل في التأريخ ، ج٥/ ص ٢٢ _ ٢٢٥ . الطبري : تأريخ الطبري ، ص ١٩٥ — ٢٠٧ . سيوطي : تأريخ الخلفاء ، ص ٢٢٧ — ٢٣٠ . ابن الجوزي : المنتظم ، ج ١١ / ص١٨ — ١٩ .

مەخلوقە . پاشتر ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم نوسراوی مـەئمونی پێگەیـشت کە فەقیه و دادوەران تاقیبکاتەوە بە ئامادەبونی ئیسحاق کوڕی ئیـبراهیم ، ئەوانیش : ( بشر کوڕی وەلید کندی ، عەلی کـوڕی ئـەبی مقاتـل ، ذیـال کوڕی هیثم سجادە ، قەواریری ، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ، ... ) .

پاش ئەوەی دوو جار کتێبەکەی مەئمونیان خوێندەوە و لێیتێگەیشتن.

– ئیسحاق: چ دەڵێی دەربارەی قورئان؟

– بشر کوڕی وەلید: دەڵێم قورئان کەلامی خوایە .

– ئیسحاق: من پرسیار ناکەم لە تۆ لەسـەر ئەمـە ، بـەڵکو دەمـەوێ بـزانم مەخلوقە؟

– بشر کوڕی وەلید: الله دروستکەری هەمو شتێکە .

– ئیسحاق : ئایا قورئان شتە؟

– بشر کوڕی وەلید : بەڵێ .

– ئیسحاق: ئایا دروستکراوە ؟

– بـشر کـوڕی وەلیـد: نـەخێر دروسـتکەری نیـە و لەمـە باشتریـشم لێنابیستیت، لەمە زیاتر قسەشی لەسەر ناکەم .

دوای ئەمە لـە هەریـەکێ لـەوانی دی دەپرسـرا ، دەیگـوت : قورئـان کەلامی خوایە جگە لە ئـیبن بکـاء دەیگـوت ، قورئـان مەعجولـە ! لەسـەر ئەو وتەیەی خوای گەورە کە دەفەرمێ : (( إنا جعلناه قرانا عربیا )) .

– ئیسحاق : مەعجول مەخلوقە؟

– ئیبن بکاء: بەڵێ .

– ئیسحاق : قورئانیش مەخلوقە؟

– ئیبن بکاء: ناڵێم مەخلوقە ، بەڵکو مەجعولە .

پاشــان ئەمانــە گــشتیان نوســرانەوە و هێنرانــەوە بــۆ مــەئمون، مەئمونیش فەرمانیـدا کـە لـەملی هەریەکـە لەوانـە بـدرێ کـە دژی خـەلقی قورئان ڕابوەستێ، لەبەرامبـەر ئـەم فەرمانـەدا لـە کۆمەڵەکـە تـەنها چـوار کەس وەستان ( سجادە ، قەواریری ، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ، محمـدی کوڕی نوح ). دەسـتکرا بـە لێـدانیان . سـجادە وتـی: قورئـان مەخلوقـە و ئازاد کرا، بۆ ڕۆژی دواتـر قـەواریریش هـەمان شـتی وت، تـەنها ئەحمـەد و محمد مانەوە سوربون لەسەر وتەکـەیان . مـەئمون ئـەو کـات لەخوراسـان بوو فەرمانیدا کە بیان نێـرن بـۆلای بـەڵام لـە ڕێگـادا محمـدی کـوڕی نـوح وەفاتی کرد و مەئمونیش لەوێ پێش ئەوەی ئەمان بگەنـە ئـەوێ وەفـاتی کرد ، ئیمام ئەحمەدیش بۆ خۆی تەنها مایەوە .

## ج. زانستە عەقڵیەکان:

### ١. پزیشکی:

لە زانستی پزیشکیدا کۆمەڵێ لە زانایان دەرکەوتن لەم سـەردەمەدا چ مەسـیحی وەك ( حـنین کـوڕی ئیـسحاق* ، یوحنـا کـوڕی ماسـویە** ،

---

* حنین کوڕی ئیسحاق عبادی ( ١٩٤ _ ٢٦٠ ك / ٨٠٩_ ٨٧٢) . ئیبن ئـەبی ئەصـیبعە لـە بـارەی نازناوی عبادیەوە دەڵێت : بە فەتحە دانان لەسەر عبادی ، هۆزێکن لە ناوچەرگەی نیـوە دورگـەی عەرەبدا و مەسیحی حیرەیان پێدەڵێن . بەڵام ئـیبن خلکـان دەڵـێ : عبـادی ، بـە کەسـرە دەبێتـە ئەهلی حیرە . سەبارەت بە کاتی مردنەکەشی ڕای جیاوازیان هەیە ، ئیبن ئەبی ئەصیبعە پێی وایە : لە ٢٦٤ك / ٨٧٧م ، مردوە ، بەڵام جرجی زیدان پێی وایە : ٢٨٨ك / ٩٠٠م ، بەڵام ئەمە هەڵەیـە ، چونکە ئەمە وەفاتی ( ثابت کورِی قرة )ی پزیشك و وەرگێڕە . بەڵام ئیبن خلکان پێی وایە : لە ٣ ی صەفەری ساڵی ٢٦٠ك ، مردوە . بڕوانە / وفیات الاعیان ، ج٢ / ص٢١٨ . عیون الانبـاء ، ج٢ / ص١٣٩ . الزرکلي : الاعلام ، المجلد الثانی / ص٢٨٧ .

** ناوی ئەبو زکریا ، یەحیا کوڕی ماسویە حرانیە ، پزیشکی دار الحکمە و وەرگێـڕی پاشمـاوە و کەلەپوری یۆنانی بوە . پزیشك بوە لە دەورەی مەئمون تاوەکو موتەوەکل . مردوە لە ( ٢٤٣ ك

جبرائيل كوڕی بختيشوع*** ، كوڕەكەی بختيشوع كوڕی جبرائيـل**** ) ، لــە زانــا موســڵمانەكانيش ، كــە لــەم بــوارەدا كاريــان كردبێــت و توێژينـــەوەيان بـــە ئـــەنجام گەيانـــدبێت، ناودارترينيـــان ( جـــاحظ ، كندی***** )بوون .

له بارەی ( حنين )ەوە وتراوە ( پزيشكی لێهاتوو ) بـە تايبـەتی لـە چارەسەركردنی چاودا ، چەندين نوسراوی هەيـە لـە بـارەی شـيكردنەوەی چاوو ڕێگاكانی چارەسەركردنی . هـەروەها كەرەسـتە و ئـامێری تايبـەتی هەبوە بۆ هەمو نەخۆشێك كە نەخۆشی چاوی هەبوبێت

لەهــەمان كاتــداحنين دەرمانــسازێكی بــاش بــوە ژمارەيــەكی زۆر كەرەستەی كيمياوی هەبوە ، وەك : ( قورقوشم ، سورمە ( كل ) ، ترشی كبريتيك ...[1] ) . پزيشكەكان لەبارەی چاوەوە چەندين بابەتيان نوسـيوە،

---

/ ٨٥٦م ) . ماسويە كاری دەرمانسازی دەكرد لە بيمارستانی جنديسابور لە خوزستان . بڕوانە / ابن النديم : الفهرست ، ص ٣٨٤ . عبدالله سندە : يوحنا بن ماسويە ، ص٥ .

*** جبرائيل كوڕی بختيشوع كوڕی جورجيس ، يەكێكە لە پزيشكە بەناوبانگەكانی نـاو دەوڵـەتی عەباسی ، لە ساڵی ( ٢١٣ك / ٨٢٨م) جبرائيل نەخۆش دەكەوێت و وەفات دەكـات ، دوای مردنـی نێژرا لە ( قديس سرجيس ) . ابن ابی اصيبعە : عيون الانباو ، ج٢ / ص ٤٣_ ٤٤ . د. احمد فريـد : عصر المأمون ، ج١ / ص٤١٩ .

**** بختيشوع كوڕی جبرائيل لەسەر هەمان كاری باوكی مايەوە ، پاش ئەوەی باوكی وەفاتی كرد ، وە بوە پزيشكی تايبەتی خەليفە مەئمون ، لە ڕۆژانـی خەليفـە مهتـدی باالله مـرد ، لـە سـاڵی ( ٢٥٦ك / ٨٦٩م ). بڕوانە / عبدالله سـندە : ال بختيـشوع ، ص٧ . د. كمـال الـسامرائی : مختـصر تأريخ الگب العربی ، ج١ / ص٣٩٢ .

***** فەيلەسوفی عەرەبی ، لـە هـۆزی كندەيـە ، بـاپيرەی ( ئەشـعەث كـوڕی قـەيس ) ە ، ئـەبو يەعقوب ئيسحاق كندی ، لە كوفە لەدايك بوە ، لە سـاڵی ( ١٨٥ك / ٨٠١م) ، مـردوە لـە ( ٢٥٢ك / ٨٦٧م) . بڕوانە / د. احمد محمد عوف : صناعة الحضارة العلمية في الاسلام ، ص١٢٩ .

[1] د. فاضل محمد الطائي : الوجيز الصحة الكيمياء عند العرب ، ص١٨ .

بەڵام ئەوەی زۆر بەناوبانگ بێت بەرهەمەکانی حنینە، ئەویش نوسینی دە مەقالەیە لەسەر چاو ، هەروەها لەگەڵ کتێبی ( مسائل العین ) کە پێشکەشی خەلیفە مەئمونی کردوە [1] .

ئربشنوت دەڵێ : ( حنین کوڕی ئیسحاق و یوحنا کوڕی ماسویە لە بەناوبانگترین و بە تواناترین پزیشکانی سەردەمی خۆیان بون ) [2] . ئیبن ماسویە لە جندیسابورەوە دەستی کردوە بە کاری پزیشکی و کچی عەبدوڵلا طیفوری پزیشکی هێناوە . ئیبن ماسویە لەگەڵ کارەکەشیدا خزمەتی کەنیسەی کردوە ، بەرە بەرە بەرەو پێشەوە چوو تاوەکو لە سەردەمی مەئموندا لە ساڵی ( ٢١٥ ك / ٨٣٠م ) دا بووە سەرۆکی پزیشکانی خانەی حیکمەت [3] .

ئیبن ماسویە دەیخوێندەوە لە دەستنوسەکانی زانستە پزیشکیەکان بە گشتی و کتێبە شیکاریەکان بە تایبەتی ، ئەم کارە شیکاریانەشی لەسەر مەیمونێك بە ئەنجام دەگەیاند، لە ئەنجامی ئەمەشەوە زانیاریەکی گەورەی بە دەست هێنا لەسەر دروستبونی مرۆڤ بە بەراورد بە شیکاری گیاندارەکان، ئەم کارانەشی بە پشت بەستن بە بیرو بۆچونەکانی جالینۆس ئەنجامدا. دانیشتنەکانی بە بەناوبانگترین دانیشتنە زانستیەکان دائەنرا لە بەغدادا ، کە بەچەندان پزیشك و زانا بەشداریان دەکرد و سەرنجی خۆیان لەسەر بیروبیرۆکەکانی دەردەبڕی .

ئیبن ماسویە مەنزلەتێکی گەورەی وەهای هەبوو لە بواری پزیشکیدا، دەبوو ئەو قوتابیانەی لە قوتابخانەی جندیسابور دەردەچون حەتم

---

[1] د. رشید جمیلی : الترجمة في المشرق الاسلامي ، ص٤٣٤ .

[2] د. رشید جمیلی : الترجمة في المشرق الإسلامي ، ص١٧٨ .

[3] ابن ابي اصيبعة : عيون الانباء ، ج٢ / ص٢٤٦ .

دەرسیان لەلای ئەو بخوێندایە ، کە یەکێ لە قوتابیـە پێگەیشتوەکانیـشی وەك ئاشکرایە حنین کوڕی ئیسحاق بوو[1] .

ئیبن ماسویە چەندین دانراوی هەیە کە مێژونوسان بـە نزیکـەی (٥٧) سەرچاوە دەیخەملێنن، لە گرنگترین دانراوەکانیـشی لـە بـواری پزیـشکیدا ئەمانەن[2] :

١. کتێبی ( العین ) ، کە ناسراوە بە ( دغل العـین ) یـان ( معرفـة العـین و طبقاتها ) بە یەکەم کتێبی عەرەبی دادەنرێ کە لـەم بـوارەدا نوسـرابێت . وەرگێڕڕاوە بۆ سەر زمانی لاتینی لە سـاڵی ( ٤٨١ك / ١٠٨٧م ) لـە لایـەن (قـسطنطین ئـەفریقی)ەوە. دەستنوسـەکەی پـارێزراوە لـە کتێبخانـەی ( تەیمور ) لە قاهیرە .

٢. کتێبی ( بەشە پزیشکیەکان ) یـان ( فـصول الحکمیـە ) کـە لـە (١٣٢) بـەش پێـك هـاتوە و لەسـەر کتێبەکـەی ئبقـراط ( الفـصول ) دانـراوە. لـە کتێبخانەکانی ( مەدرید ، لایدن ، قاهیرە ) هەیە .

٣. کتێبـی ( الحمیـات )، زانیـاری ئـەدات لەسـەر نەخۆشـیەکانی گـوێ ( هۆکارەکـانی ، سـەرهەڵدانی ، چارەسـەری ) ، لەگـەڵ نەخۆشـیەکانی ( زەردوی و ئێش و ئازارەکانی لەش ، ...) . بە دەستنوس هەیە لە ڕامبـور ، تەیموریە .

٤. الکناش المشجر : بە گـشتی بـاس لـە هـەوکردن دەکـات ( دەرخـستنی لایەنەکانی و چارەسەر و دەرمانـەکانی )، لەگـەڵ باسـکردنی هۆکارەکـانی دەمار ڕەقبون و ڕێگای چارەسەری . دەستنوس لە ڕامبور ، بانکیبور .

---

[1] هـ..س . ص٢٤٧_ ٢٤٨ .

[2] عبد اللة سندة : یوحنا بن ماسویة ، ص ٥_ ٧. ابن ابي اصیبعة : عیون الانباء ، ج٢ / ٢٥٥ . د. کمال السامرائی : مختصر تأریخ الطب العربی ، ج١ / ص ٤٢٢_ ٤٢٧ .

٥. کتێبی الفصد والحجامه ( خوێن دەرهێنان ) . باسل _ حەلەب .

٦. کتێبی الجزام ( گەڕی ) . جراح _ حەلەب .

٧. کتێبی التشریح ( نەشتەرگەری ) . حکیم _ حەلەب .

٨. کتێبی الجامع یان الجامع الطب ، کۆکراوەی زانیاریەکانی دکتۆرە فارسی و ڕۆمانیەکانە ، لەگەڵیشیدا چارەسەری ئەم نەخۆشیانەی تێدایە : ( خوێن بەربون ، ڕشانەوە ، قەڵەوی ، مەمك ڕەق بون ، کۆڵنج ، خوێنی بێ نوێژی ئافرەت ، .. ) .

٩. کتێبی الأسهال ( سك چون ) .

١٠. کتێبی السدر والدوار ( سەر خولانەوە ) ڕازی لە کتێبەکەیدا ( الحاوی ) سودی لەم کتێبە بینیوە و وەك چارەسەرێ باسی لێوە کردوە .

١١. کتێبی الکمال والتمام ، زانیاریە لەسەر شێ ی ناو دەم و دەرمانی چارەسەری ( خوێنی لوت ، سوتانەوە ، وەستانەوەی خوێن لەکاتی برینداریدا ، کوڕی ، .....).

١٢. کتێبێك لەسەر شراب الفاکهه ( ئاوی میوە ) ، وەك چارەسەرێ بۆ ڕشانەوە و کۆلێرا .

١٣. کتیبی محنەالطبیب ( تاقیکاری پزیشك ) ، باس لە ( کاریگەریەکانی لێدانی گەرما ، میزەڕۆ) دەکات .

١٤. کتێبی المعده ( گەدە ) .

١٥. کتێبێك لەسەر السواك والسنونات ( سیواك و دەرمانی شتنی دەم و دان ) .

١٦. کتێبی (چاو _ چارەسەر و دەرمانی ) . حکیم _ حەلەب .

١٧. کتێبی الجنین ( کۆرپەلە ) .

١٨. کتێبــی الطبــیخ ، پاشــتر زۆرێــك لــە زانایــان ســودیان لێــوەرگرت ، ئەوانیش : ( ئەحمەد کوڕی سرخسی ) لە نیوەی سەدەی سێیەمی کۆچی ، ئیبن دایە لە کۆتای سەدەی سێیەمی کۆچی ، ئیبن مـسکویە لـە نیـوەی سەدەی پێنجەم ، محمدی کوڕی حەسەن (نوسەری بەغدادی) لـە نیـوەی سەدەی حەوتەم .

١٩. کتێبی ترکیب خلق الانـسان و اجزائـە ، کتێبێکـە لەسـەر ڕێکخـستن و دروستبونی مرۆڤ و ئەندامەکانی ، ئەمەی نوسی بۆ خەلیفە مەئمون .

٢٠. کتێبی الرحم .

٢١. کتێبی السموم ( ژەهراوی بون ) .

٢٢. کتێبی الاغذیة ( ئەو خواردنانەی کە پێویستن بـۆ لـەش ) . باسـل _ حەلەب .

بۆ زانیـاری زیـاتر و شـارەزای بونـت لـە تـەواوی کتێبـەکانی دی ئـەوا بگـەڕێڕەوە سـەر ئـەو سەرچـاوانەی وا ئاماژەمـان پێـدان، بـەلاّم مـن بـە پێویستم نەزانی کـە تـەواوی بابەتـەکانی ئـەم پزیـشکە بخەمـە ڕوو لەبـەر ئەوەی ئەوانەی وا خستومنەتە ڕوو تـەواوی ئـەو بابەتانەیـەتی کـە باسـی لێـوەکردون و چارەسـەری بـۆ دانـاون ، وە کتێبـەکانی دیـشی هـەر لـەو مەودایەدا دەخولێنەوە جا بە کتێبی سەربەخۆبن یـاخود لەگـەڵ بابـەتانی تردابن .

لە ساڵی ( ٢١٠ك / ٨٢٦م ) مەئمون نەخۆش کەوت و جبرائیل کـوڕی بختیشوع توانی بە زیرەکی خـۆی چارەسـەری بکـات، ئەمـەش ڕق وقینـی مـەئمونی ڕەوانـدەوە کـە بـە بکـوژی بـاوکی دادەنـا. مـەئمون لـە دوای

چاکبونەوەی زیاتر لە خۆی نزیك کردەوە و لە دانیشتنەکانیدا بانگهێشتی دەکرد ، پاشتریش کردیە پزیشکی تایبەتی خۆی[1] .

لە بواری پزیشکیدا ، رسالەیەکی نوسی لەسەر خواردن و خواردنەوە ، پێشکەشی مەئمونی کرد . هەروەها رسالەیەکی رێك و پێکی نوسی نوسی لەسەر ( پزیشکی ) ، کە کورتکراوەی دانراوەکانی دیروکوریدس و جالینۆس و بولس ئەیجینی بوو[2].

سەبارەت بە کوڕەکەشی کە لە دوای جبرائیلی باوکی بووە پزیشکی تایبەتی مەئمون . بختیشوع لەگەڵ ئەوەی خزمەتی خەلیفەی دەکرد لەڕوی پزیشکیەوە بەردەوامیش بوو لەسەر مەسیحیەتی و عیبادەتکردنی لەبواری دینەکەی خۆیدا..... یەکێ لە وتەبەناوبانگەکانی لە بواری پزیشکیدا دەڵێ: ( خواردنەوە لەسەر برسێتی خراپە ، بەلاّم خواردن لەسەر تێری خراپترە ) . لە گرنگترین دانراوەکانی کە لەم بوارەدا پێشکەشی کردون ، ئەمانەن :

١. کورتەیەك لەسەر پزیشکی . میلانۆ .

٢. رسالەیەك کە بۆ خەلیفە مەئمونی نوسی ، لەسەر ( خۆپاراستنی جەستە ) .

٣. ئامۆژگاری کردن لە خراپی تێکەڵ کردنە دەرمانیەکان . تەیموریە .

٤. کتێبی الحجامە ( کە بە شێوازی پرسیارو وەلاّم کراوە)[3].

---

1 ابن ابي اصيبعة : عيون الانباء ، ج٢ / ص ٤٦ .

2 ه . س ، ص ٤٥ . د. احمد فريد : عصر المأمون ، ج٢ / ص ٤٨٩ .

3 د. كمال السامرائي : مختصر تأريخ الطب العربي ، ج١ / ص ٢٩٣ .

زانستەکەی جاحظ زیاتر ئەچێتە قاڵبی ( زیندەوەرزانی )یەوە ، بەلاّم لەبەرنەبونی وەها زانستێك لەو سەردەمەدا بە پێویستم زانی بیخەمە ئەم قاڵبەوە .

جاحظ دادەنرێ وەك دانەرێکی زانستی لە لێکۆڵینەوە لە هەڵوێستی مرۆڤەکان و دابەشکردنیان بۆ چەندین کۆمەڵ و ڕەگەزی جیاواز لە ( شێوەیان ، ڕەنگیان ، زمانیان ، داب ونەریتیان ،... ) . جاحظ لە کتێبی ( الحیوان )دا باس لە ئەزمون و تاقیکردەوەکانی خۆی دەکات کە لەسەر نەفسیەتی گیانداران کردویەتی .[1]

زانای ئیسپانی ( اسین بلاسیوس ) داندەنێ بە کتێبەکەیدا و بە زیادکرنێکی دادەنێ لە زانستی گیانداراندا و کتێبەکەی بە سەرەتای دەرکەوتنی بیردۆزی (پێشکەوتن و مانەوە) دادەنێ .
هەروەها بەکەسێکی بەتوانا دادەنرێ لەدیاریکردنی بۆن و ڕەنگی گیانداران و پۆلێن کردنیان[2].

جاحظ پێچەوانەیە لەگەڵ داروینDا لەسەر ( بیردۆزی گەشەسەندن و پەرەسەندن )لەبەرئەوەی جاحظ مەسەلەی ململانێکە بە یاسایەکی ئیلاهی دادەنێ و پێی وایە خوای گەورە دابین کەری خۆراکی دروستکراوەکانێتی [3] .

---

[1] د. احمد محمد عوف : صناعة الحضارة العلمية في الاسلام ، ج٢ ص ٣٧.

[2] ه. .س . ص ٣٨ .

[3]. د. احمد محمد عوف : صناعة الحضارة العلمية في الاسلام ، ج٢ / ص ٣٩ .

کیندی ، ئەوەی باسی لێوە کرابێت لە مەسەلەی پزیشکیدا ئەوەیە، زیاتر کە مۆسیقا[*]ی وەك چارەسەرێ بەکارهێناوە بۆ چارەسەری نەخۆشیەکان ، لە گرنگترین دانراوەکانیشی لەم بوارەدا : ( القواعید الموسیقیه ) کە دواتر فارابی و ئیبن سینا لێیانەوە وەرگرتوە [١]، لەگەڵ ( مختصر الموسیقي في تألیف النغم صنعة ) و چەند نامە و رسالەیەکی تر کە لە دوای خۆی بەجێی هێشتون [٢]. لەو دانراوانەش سەبارەت بە مۆسیقا دایناون ، ئیبن نەدیم بەم شێوازە پۆلێنی کردوون :

– رسالة الکبری في التألیف .

– رسالة في ترتیب النغم الدالة علی طبائع الأشخاص العالیة وتشابة التألیف .

– رسالة في الایقاع .

– رسالة في المدخل الی صناعة الموسیقي .

– رسالة في خبر صناعة التألیف .

– رسالة في صناعة الشعر .

– رسالة في الأخبار عن صناعة الموسیقي .

کیندی لەو بوارانەی کاری تێدا کردووە لە مۆسیقادا ئەمانەن :

١. کاریگەری مۆسیقا:

کیندی پێی وایە مامۆسیقا کاریگەری هەیە چ لەسەر مرۆڤ وەچ لەسەر گیانداران ، لەوانە دەڵێ : بە ژەنینی مۆسیقا تیمساح لە ئاو دێتە دەرێ

---

[*] وشەی مۆسیقا لە زمانی عەرەبیدا بە واتای ( زانستی مۆسیقا ) دێت بەڵام وشەی (الغناء ) بە واتای ئەداکردنی ئاواز و مۆسیقایە ، واتە هونەری کرداری دەگرێتەوە .

[1] ە. .س . ص١٣٠ .

[2] نەبەز حمە ڕەشید : هونەرە جوانەکان لە شارستانیەتی ئیسلامیدا ، ل ١٧ .

و تاوسیش کەیفی ساز دەبێت ، باڵندەش بە گشتی خەم دایدەگرێ و سەرسام دەبێت، هەروەها پێی وایە ئەم کاریگەریە لە مرۆڤدا بە پێی جۆری ئاوازەکە دەگۆرێ ( دڵخۆشی ، دڵتەنگی ) تەنانەت مۆسیقا بۆ خەو لێکەوتن.

٢. جۆرەکانی ئاواز لای کیندی :

أ. ئاوازی (المطلوبة) : بۆ خۆشی و دڵشادی و شاییە.

ب. ئاوازی ( الجریئة ) : بۆ چونە پێشەوە و نەمانی ترس و بوێری .

ج. ئاوازی (الشجیة ) : بۆ گریان و شیوەن و ناڵاندن و دڵتەنگی .

٣. مۆسیقا لە ڕوانگەی پزیشکیەوە :

مۆسیقا لە ڕوانگەی کیندیەوە کاریگەریەکی زۆر گەورەی هەیە لەسەر مرۆڤ لە ( هارینی خواردنی ناو گەدە ، هێزدانەوەیە بەو کەسانەی زەرد هەڵدەگەرێن ، پاککردنەوەی قورگ و جوڵاندن و گەرم و گوڕی سوڕی خوێن لە لەشدا،....) ئەم چارەسەرکردنانە بە مۆسیقا بەپێی جۆری ئاوازەکە و ماوەی بەکارهێنانی و کاتی گوێ لێگرتنەکەی دەگۆڕا ، کە کیندی خۆی لە پاش ئەوەی نەخۆشەکەی دەدیت جۆری چارەسەرەکەشی بۆ دادەنا .

٤. دانانی ئاوازەکانی :

دانانی ئاوازەکانی بە پێی پیتی ( ئەبجەدی ) بوو . هەروەها قوتابیەکانیشی سەرەتا لەسەر ژەنینی ئامێری ( عود ) ڕادەهێنا ، کە وەك ئاشکرایە مێژوەکەی بۆ سەدەی دووەمی زاینی دەگەرێتەوە .

**٢. فەلەك:**

دەركـەوتنی قوتابخانـەكانی فەلـەك لـە بەغـدادا، دەگەڕێتـەوە بـۆ سەردەمی ڕەشید و بە تایبـەتی مـەئمون، كـە زانایـان كـاری باشـیان بـە ئەنجام گەیاند لەم زانستەدا و لێكۆڵینەوەی باشیان كـرد لـە ناوچـەكانی ( بەغداد ، دیمەشق ، ...[١] )، بۆئەمەش ڕوانگەیەكیان دروستكرد(مرصـد)ێـك لە دیمەشق وئەوی دیكەشیان لە ناوچەی شماسیە لە سـەروی ڕۆژهـەلاٌتی بەغداد بۆ سەیركردن و لێكدانەوەی جوڵە فەلەكیەكان [٢] .

صـلیخ ، كـە جێگایـەكی گـەورەبو لـە بەغـداد ، خەلیفـە مـەئمون و گـەورە زانایـانی بـواری فەلـەكی تێـدا كۆدەبونـەوە ، كـە بـیردۆز و كـارە زانــستیەكانی تایبــەت بــەم زانــستەیان دەخــستە ڕوو . لەبەغدادیــشدا مرصدێكی لێبوو كە بە مرصـدی مـەئونی ناسـرابوو[٣] ، چـەند فەلەكناسـێك كاریـان لەسـەر دەكـرد، وەك : ( سـند كـوڕی عـەلی مـنجم مـەئمونی ) كـە شـوێن و جێگـە و جوڵـەی كەوكەبـەكانی دیـاری دەكـرد. عـەباس كـوڕی سـەعید جەوهـەریش لێكۆڵینـەوەی لەسـەر شـوێنی هەنـدێ لـە هەسـارە جولأوەكان كرد، هەروەها یەحیا كوڕی ئەبی مەنصور مـنجم ، كتێبێكـی نوسـی بـەناوی ( الـزیج ممـتحن ) ، كـە تیایـدا بـاس لـە هەسـارەكان و دیـاریكردنی جوڵـەیان ( خێـرای ، هێواشـی ، وەسـتان ، گەڕانـەوە ،.. ) دەكات لەگەڵ كتێبێكی تر بەناوی (السد الساعة في الارتقاع بمدينة الـسلام) و كتێبێكی تریش بەناوی ( المدخل الى علم هيئة الافلاك وحركات النجـوم ) كە ئەحمەد كوڕی محمـد كـوڕی كـەثیرفرغـانی نوسـی. دوایـی كوڕەكـانی

---

[1] د. جابر عزيز الشكرى : تأرسخ العلم الكيمياء ، ص٨٣ .

[2] د. علي عبداللة الدفاع : اثر علماء العرب والمسلمين في تطوير علم الفلك ، ص١٦

[3] هـ . س ، ص ١٧ .

موسا کوڕی شاکر[*] دەستیان کرد بەکار لەسەر مەرصدەکەیی لە دەرگای طاق لەسەر ڕوباری دیجلە و توانیان کۆمەڵێ زانیاری لەسەر گەردون بە دەست بهێنن[١] .

یەکێکی دی لەوانەی لە زانستی ئەستێرە و هەسارەکاندا کاری دەکرد( جەعفەر کوڕی عومەر بەڵخی )بوو کە دەناسرێ بە(ئەبومعشر فلکی)، لەسەرەتای ژیانیدا لەگەڵ هاوەڵانی فەرمودەدا بو ، پاشان دەستی کرد بە زانستی هەسارەکان لە تەمەنی ( ٤٧ ) ساڵیدا و چەند دانراوی بە نرخی دانا لە وانە ( اثبات العلوم ) و ( هیئە الفلك ) ، ئەوەی زیاتر توانی پەرە بدات بەزانستەکەی تەمەنە درێژەکەی بو کە دەڵێن زیاتر لە (١٠٠) ساڵ ژیاوە[٢] .

ول دیورانتیش لەم بارەیەوە دەڵێ : ( مەئمون کۆمەڵێ لە فەلەکناسەکانی دانا بۆ سەیر کردنی بورجە ئاسمانیەکان و لەمەوە چەند ئەنجامێکیان بە دەست هێنا، لەوانە: ( تاقیکردنەوەی دۆزراوەکانی بەطلیموسی فەلەکی، دراسەکردن لەسەر خۆرە پەڵە و بەدەست هێنانی خڕێتی زەوی ، کە ئەمشیان سەرەتا بە پێوانەی پلەی زەوی کرد بە سەیرکردن و دیاری کردنی شوێنگەی خۆر لە تەدمور و سنجار لە یەك کاتدا )[٣]، لەبەر ئەوەی تەدمور و سنجار زەویەکەی لە ئاستی ڕوی

---

[*] سێ بران ، ئەحمەدی کڕی موسا ( مردوە لە ٢٦٥ ك/ ٨٧٩م ) ، بەناوبانگ بو لە زانستی میکانیکدا . محمد کوڕی موسا ن شارەزا بو لە زانستی فەلەك و بیرکاریدا ، مردوە لە ( ٢٥٩ ك ٨٧٣م ) . لەگەڵ حەسەنی کوڕی موسا ، کە بەناوباگ بو لە ئەندازیاریدا . بڕوانە / عباللە سندە : ال شاکر ، ص ٥ ، ٨ .

[1] محمد رجب السامرائي : علم الفلك عند العرب ، ص ٨٤_٨٥ .

[2] د. حسن ابراهیم حسن : تأریخ الاسلام ، ج٢ / ص ٢٨٨ .

[3] ول دیورانت : قصة الحضارة ، ت : محمد بدران ، ج٢ من مجلد الرابع / ص١٨٢ .

دەریاوە یەکسانە. ئیبن خلکان، تەواوی باسەکەی هێناوە و شێوازی کارکردنیان لە بیابانەکانی ( سنجار ) و ( کوفە ) دا بۆ سەلماندنی ئەو ڕاستیەبوو کەوا لە کتێبە کۆنەکاندا خوێندبویان، لەمەشەوە ئەو ڕاستیەیان بۆدەرکەوت کە هەموو پلەکانی فەلەك بەرامبەر بەڕوی زەوی (١ / ٣ ، ٦٦ ) میلە ، ژمارەی پلەکانی فەلەکیش (٣٦٠) پلەیە ، لەبەر ئەوەی فەلەك دابەش ئەبێت بەسەر (١٢) بورجدا و هەمو بورجێکیش (٣٠) پلەیە ، بەمەش دەکاتە (٣٦٠ ) پلە، ئەمانیش هاتن ئەم پلەیەیان (٣٦٠) لێکدا لەگەڵ (١ / ٣ ، ٦٦ ) بەمەش (٢٤) میل ئەنجامی بوو کە دەیکردە (١٨) هەزار فرسەخ [١].

لە دوای گەیشتن بەم ئەنجامە و سەلماندنی بیرۆکەی پێشینان، سێ براکە کتێبێکیان نوسی لەسەر پێوانەی ڕوبەری بازنە ( في قياس مساحات مسطحة او مستديرة )، کە پاشتر وەرگێڕرا بۆ لاتینی لەلایەن ( جیرارد الکریمونی ) . کتێبەکە لە وڵاتانی ڕۆژئاوا ناسراوە بە کتێبی ( سێ براکە ) liber trium fratrum de geometrica [٢] ناسراوە.

هەروەها کتێبێکی ناوداریان دانا بەناوی ( الزيج المصحح ) کە ئەم کتێبە بیردۆز و چەند ڕاستیەکی گرنگی تێدایە ، لە بارەی ئەنجامە ژمێریایەکانەوە ، ئەوەبو ژمارەکانی لادانیان دۆزیەوە ( ٥٣٣ ، ٣٣ خولەك ، ٥٩ چرکە ) [٣] .

مەئمون بۆ خۆیشی بەڕادەیەکی زۆر کەوتبوە ژێر کاریگەری ئەم زانستەوە ، دکتۆر حسن ئیبراهیم حسن نمونەیەکمان بۆ باس دەکات کە

---

[1] ابن خلكان : وفيات الاعيان ، ج٥ / ص ١٦١_ ١٦٣ .

[2] زيغريد هونكة : شمس العرب تسطيع على الغرب ، ص١٢٠ .

[3] د. جابر عزيز الشكرى : تأريخ العلم الكيمياء ، ص٨٣ .

له ئیبن ( قیفطي)ەوه بۆمان دەگێڕێتەوه ، كه مەئمون پشتی پێبەستوه له هەڵبژاردنی ئەو ڕۆژەدا بۆ بەیعتدان به عەلی رِەضا [1].

۳. بیركاری:

ئیبن خەلدون دەڵێ : ( یەكەم كەسێ كتێبی له زانستی بیركاریدا نوسیبێ ، خوارزمیە [*2]) . خوارزمی بە دامەزرێنەری زانستی بیركاری عەرەبی دادەنرێت ، كه گوێزرایەوه بۆ سەر زمانی لاتینی له سەدەی (۱۲) هەمدا . هەمو ئەو بابەت و لێكۆڵینەوانەی كه هەیبون له زانستی بیركاریدا كۆی كردنەوه له بەرگێكدا بەناوی ( الجبر والمقابلة )، كه ڕۆژئاوا سودێكی گەورەی لێبینی، وەك ساربۆن لەبارەی بەرهەمەكانیەوه دەڵێ :

(بەرهەمەكانی خوارزمی له بیركاریدا سەرەتایەكی زانستیانەن بۆ زانستی بیركاری له ئەوروپادا و سەرچاوەیەكی سەرەكیشن بۆ زانستی بیركاری)[3] .

كتێبی (حساب الجبر والمقابلة)، باس له كۆمەڵێ له كێشه بیركاریەكان دەكات كه ڕودەدەن له كاتی كاركردندا به شێوەیەكی كرداری. ئەم كتێبه وەرگێڕرا بۆ لاتینی له سەدەكانی ناوەڕاستدا و

---

[1] د. حسن ابراهیم حسن : تأريخ الاسلام ، ج۲ / ص۲۸۷_ ۲۸۸ .

[*] ناوی ئەبو جەعفەر محمد كوڕی موسا خوارزمیە ، له ساڵی ( ۱٦٤ك / ۷۸۰م ) لەدایك بوه له شاری ( خیوه )ی خوارزم ( ئۆزبكستان ) .پاشان هاتۆته بەغداد و شارەزاییەكی تەواوی له زانستی بیركاری و فەلەكدا بەدەست هێناوه و بۆ یەكەم جار وشەی (جبر ) لەلایەن خوارەزمیەوه بەكارهات ، كه رۆژئاواییەكان پێی دەڵێن ( الجبرا ).هەروەها سەبارەت بەناوی خوارزمیش لەرۆژئاوادا به ( الكاجوری ) ناسراوه. مردوه له ۲۳٥ك / ۸٥۰م . بڕوانه / ابن الندیم : فهرست ، ص ۳۷٦ . الدكتور محمد جواد سعدالدین و نافع یحیی الدراجي : الرياضيات في التراث العربي الاسلامي ،ص ۸.

[2] ابن خلدون : مقدمة ، ص ۱٦٥ .

[3] د. احمد محمد عوف : صناعة الحضارة العلمية في الاسلام ، ج۲ / ص ٦۱ .

زانستەکەشی ناوی خۆی وەرگرت** و بووە وشەیەکی جیهانی [1]. هەروەها لە بواری ژمێریاریشدا کتێبی ( الحساب )ی دانا کە ساربۆن لەبارەیەوە دەڵێ : ( کتێبی الحسابی خوارزمی ، شوێنەواری دیارە لەسەر زانستی بیرکاری ئەوروپا لە چەرخی ناوەڕاستدا ). لە هەردوو کتێبەکانیەوە توانیویەتی ئەنجامە بیرکاریەکانی وەك : ( کەڕەت ، کۆکردنەوە ، لێدەرکردن ، ... ) بدۆزێتەوە ، لەگەڵ ئەنجامەکانی کڕین و فرۆشتن و پێوانەزانی و ویراثەت ، ......، لە ڕوی ئاینیشەوە توانیویەتی کاتەکانی نوێژ و زەکات و ڕۆژوو و حەج دیاری بکات [2] .

سەبارەت بە کتێبی ( الحساب )ی، کتێبێکی ژمێریاری فێرکاری قەبارە بچوکە کە تیایدا شەرح و ڕێگای بەکارهێنانی سیستمی ژمارە هیندیەکان دەکات ، ئەم کتێبە وەرگێڕرا بۆ زمانی ئیسپانی ئەڵمانی و لاتینی لە سەدەی (١٢)دا، یەکەم نوسخەی گەڕێنرایەوە لەساڵی (١١٤٣ز) کە بە خەتی خۆی نوسیویەتی و ئێستا هەیە لە کتێبخانەی ( البلاط ) لە فینیا و نوسخەی دووەمیشی لە دێرسالم لە ( یدلبرج ) .

هاوەڵانی شێوازی ڕێگای بیرکاریانەی(خوارزمی) لە(ئیسپانیا،ئەڵمانیا، ئینگلیز ) خۆشحاڵ بون بەسەرکەوتنیان بەسەر هاوەڵانی ڕێگای شێوازی ژمێریاری ناسراو بە ( اباکوس ) بەمەش ژمارەی عەرەبی تاوەکو (٩ ) کە

---

** وشەی ahlgorthmus ، کەسایەتی ( رینو) سەلماندی کە ناوی خوارزمی ئەصڵی وشەکەیە، ئەمەش بویە هۆی چارەسەری ئەو کێشەیەی کەلەسەر ناوەکە هەبو ، کە پێیان وابو ناوەکەیان لە وشەی یۆنانی یا لاتینی ،... هاتوە . بەڵام ئەڵمانەکان بۆ ئاسانکردنی وشەکە لەسەر زمانیان کردیانە ahlgorizmus . بڕوانە / زیغرید هونکە : شمس العرب تسطع علی الغرب ، ص ٧٥ و ٧٧ .

[1] زیغرید هونکە : هـ . س .

[2] د. احمد محمد عوف : صناعة الحضارة العلمیة في الاسلام ، ج١ / ص٦٤_٦٥ .

سفر له پێشی هەمویانەوه دانرابوو له هەموو ئەوروپادا بلاوبۆوه[1]. له ساڵی ( ٨١٣ م )یشدا خوارزمی ژمارەی هیندی له نەخشه بیرکاریەکاندا دانا ، ئەمەش پاشتر بلاٌبۆوه به زمانی لاتینی[2].

٤. جوگرافیا:

له چەرخی یەکەمی عەباسیدا جوگرافیا هۆیەك بوو بۆ فراوانبونی بازرگانی و پەیوەستکردنی شاری بەغداد وەك مەڵبەندی عەباسیەکان به وشکانی و ئاوی ولاٌته دورەکان . ئەویش به گرتنه بەری ڕێگا هێمن و ئاسایشەکان .

هەروەها جوگرافیا پاشماوەیەکی گەورەبو له ئاسانکردنی سەفەرەکان و تاقیکردنەوەی ڕێگاکان له ڕێگای گەڕیدەکانەوه ، کۆمەڵێکی زۆر لەم پێناوەدا هەستان به چەند گەشتێکی بەهێز و گرنگ ، پاشتریش هەستان به دانانی چەندان کتێب لەو بوارەدا که وەصفی ئەو ولاٌتانەیان دەکرد که بینیبویان چ له ڕوی پێگەی جوگرافیەوه یا کۆمەلاٌیەتیەوه ،...

وەك ئاشکرایه لەسەردەمی هارون ڕەشیدا گەشت کردن بۆ ناوچەکانی کەنداوی عەرەبی ( فارس )تاوەکو نیمچه دورگەی ملقا ( که ئێستا پێی دەوترێت شبه جزیرة الملایو )هەبووه [3]، دەڵێن تەنانەت گەیشتونەته کوبا له ڕێگای دەریاوه، وەك ئەوەی له فتوحاتی ئیسلامیدا گەیشتنه ناوەڕاستی ئاسیا و ولاٌتی هند له ڕۆژهەلاٌتەوه ، وه له خۆرئاواشەوه گەیشتنه باکوری ئەفریقیا و ئەوروپا ، بەلاٌم ئەگەر

---

[1] زیغرید هونکه : هـ . س .ص٧٦ .

[2] ول ديورانت : قصة الحضارة ، ت : محمد بدران ، ج٢ من مجلد الرابع / ص١٨٠.

[3] د. حسن ابراهيم حسن : تأريخ الاسلام ، ج٢ / ص ٢٥٩ .

چاودێری ئەم بەرهەمە جوگرافیە گەورەیە بکرێت دەبینین کە ئاشکرا نیە بە شێوەیەکی ڕون ، تەنها لە چەرخی دوەمی عەباسیدا نەبێت .

لەگەڵ ئەوەشدا هەر لەم سەردەمەدا چەند هەوڵێك دراوە لەو پێناوەدا، وەك جوگرافی ناسی فارسی ( خردازبە ) لە نیوەی یەکەمی چەرخی سێهەمی کۆچی ، کتێبێکی نوسیوە لەو بوارەدا بەناوی ( المسالك والممالك ) کە دائەنرێت بە کۆنترین کتێب بە زمانی عەرەبی نوسرابێت، کەدەبووە ڕێ نیشاندەرێك بۆ موسافیرەکان لە ڕێگای ئاویدا، کە لە ڕێژگەی ڕوباری دیجلەوە دەستی پێدەکرد تاوەکو هیند و چین[1] .

خوارزمی لە بواری جوگرافیاشدا بەرهەمی هەبووە، وەك کتێبی (صورة الأرض) یان ( الربع المعمور ) کە لەسەر داوای خەلیفە مەئمون نوسی و تیایدا پێوانە و جوڵەی زەوی کردووە و درێژی ڕوبار و شاخەکان و شوێنەکانیشی دیاریکردوە ) . ڕۆژهەلاتناسی ئیتاڵی ( نیللینۆ ) ، وەصفی ئەم کتێبە دەکات و دەڵێ : ( دایکی هەمو کتێبە توراثیەکانە و هیچ کتێبێك نەبووە وەك ئەم کتێبە لە ئەوروپای سەرەتای شارستانیەتدا )[2] . هەروەها کتێبێکی تری بچوکیشی هەیە بەناوی ( التقویم البلدان )کە تیایدا ماوەی نێوان شارە بەناوبانگەکانی ئەو کاتی کردووە[3]. هەروەها بە بەشداری (٣٩) کەس لە زانایان هەستان بە دانانی مەوسوعەیەکی جوگرافی گەورە بۆ خەلیفە مەئمون [4].

---

[1] هـ. س ، ص ٢٨٦_٢٨٧ .

[2] د. احمد محمد عوف : صناعة الحضارة العلمية في الاسلام ، ج٢ / ص٦٧_٦٨ .

[3] هـ. س ، ص ٦٨ .

[4] ول ديورانت : قصة الحضارة ، ت : محمد بدران ، ج٢ من مجلد الرابع / ص١٨١ .

**٥. مێـژوو:**

له دەورەی ئەبو جەعفـەری مەنـصوردا، زیـاتر مێـژوو لـەو دوو کتێبـە وەرگێراوەی ئیبن موقەفەعدا دەبینرا کە ئەوانیش : ( خداینامة في الـسیر ، التاج في السیرة أنوشیروان )بوو[1]، بەڵام پاشتر و له دەورەی هارون ڕەشـید و مەئموندا کۆمەڵێ له مێژونوسی گەورە دەرکەوتن، بەڵام ئێمە ئەگـەر لـە دەستپێکەوە دەست پێبکەین، ئەوا یەکـەم کـار بەرچـاومان دەکـەوێت لـە جیهانی ئیسلامیدا، کتێبـی (الأخبـار )ی محمـد کـوڕی ئیـسحاقی سـەراجە (مـردوه لـە ١٥٢ ك / ٧٦٧م ) ، کـە باسـی لـە هـەواڵی فەرمودەناسـان و وەزارەتەکان و ویلایەتەکانی کردووە، هەربۆیە بەشێخی مێژونوسی سـیرە و غەزوەکان دادەنرێت کە پاشتر هەریەك لـە زیـاد بکـائی و ئـیبن هیـشام[2] خاوەنی کتێبی ( السیرة النبویـة، مـردووە لـە ٢١٨ك / ٨٣٢م لـە میـصر)، سودێکی باشیان لێوەرگرتوە[3] .

داهێنانـە نوێکـەی واقـدیش[*] لـە بـواری نوسـینەوەی مێـژوودا جێـی خۆیـەتی کـە قـامکی لەسـەر دابنـێین و بـاس لـە شـاکارەکانی بکـەین . نوسـینەکانی واقـدی تـەنها لـەوەدا کۆنەبۆتـەوە کـە سـەردێکی مێـژویی بگێڕێتەوە ، بەڵکو تێکـەڵ کردنـی ڕوداوەکانـە لەگـەڵ فـەرمودە و فیقـه و علـوم قورئانـدا . واقـدی هـاتووە باسـی هەریـەك لـە هـاوەڵان وشـێواز و

---

[1] د. احمد فرید : عصر المأمون ، ج١ / ص٣٨٧.

[2] د. شوقی أبو خلیل : أطلس السیرة النبویة ، ص٢٣٩ .

[3] د. حسن ابراهیم حسن : تأریخ الاسلام ، ج٢ / ص ٢٨٦ .

[*] نـاوی ئـەبو عەبـدوڵلا محمـد کـوڕی عومـەر واقـدی ، شـیعەیە بـوە قـازی لـە سـەردەمی خەلیفـە مەئموندا ، لە دایك بوە لە ( ١٣٠ك / ٧٤٧م ) ، مردوە لە ذي الحجةی ( ٢٠٧ك / ٨٢٢م ) ، تەمەنی ٧٨ ساڵ بوە . بڕوانە / ابن الندیم : الفهرست ، ص١٤١_ ١٤٢ .

هۆکارەکانی شەهیدبونیانی کردووە، بۆ ئەمەش پێویستی بە گەڕانێکی زۆر بووە ، بۆیە ئەتوانین بڵێین زیاتر کارەکەی نزیك بووە لە کاری گەڕیدەکانەوە . ئەوەی ئەم بەرهەمەی واقدی لە سیرەی ئیبن ئیسحاق جیا دەکاتەوە ئەوەیە کە تەنها باس لە ژیانی پێغەمبەر ناکات، هەر لەبەر ئەمەشە کە ناوی ناوە ( الطبقات )، لەبەر ئەوەی بەشێوازی بەش بەش و پۆلێن کاری مێژوییانە دابەشی کردوە و تەنها یەك کەس ناگرێتەوە [1]

لە گرنگترین کتێبەکانی کە لەم بوارەدا نوسیونی، ئەوانیش ( أخبار المكة ، الطبقات ، فتوح الشام ، فتوح العراق ، الجمل ، مقتل الحسين ، السيرة ، أزواج النبي ، حرب الاوس والخزرج ، صفين ، سيرة ابي بكر ووفاته [2]،.....).

یەکێکی تر لەو بەرهەمە ناوازانەی لەبواری مێژوودا لەم دەورەیەدا نوسراون بریتیە لە (الطبقات الكبرى)ی محمدی کوڕی سەعد ( مردووە لە ٢٣٠ك / ٨٤٤م )، کە بە سەرنجدانمان لە پێڕستی ئەم کتێبە ئەوا هەست بە پۆلێن کاریەکی جوانی ئەو بەرهەمە دەکەین، کە نوسەر توانیویەتی بە شێوازێکی پۆلێنکاری زۆر جوان باس لە ( ڕەچەڵەکی پێغەمبەر ، ژیانی پێغەمبەر ، کۆچ بۆ حەبەشە ، بۆ مەدینە ، ئەوس و خەزرەج ، غەزوە و سریەکانی پێغەمبەر ، وەفاتی پێغەمبەر ، هاوەڵانی پێغەمبەر ، ئافرەتانی دەوری پێغەمبەر ، باسکردنی تابعین بە شێوازی پۆلێنکاری ، ... ). کە پاشتر لە هەشت بەشدا بە چاپ گەیەنراوە .

هەریەکەلە کتێبەکانی [3]: ( العثمانية ، امامة معاوية ، امامة بني العباس ، وجوب الامامة ، الامامة عند الشيعة )ی جاحظ، بریتین لە چەند

---

[1] د. محمد رجب البيومي : هارون الرشيد ، ص١٢٧ .

[2] ابن النديم : الفهرست ، ص ١٤١ .

[3] د. طه الحاجري : الجاحظ حياتة واثارة ، ص ( ١٧٨_ ١٨٨ ) ، هەروەها ( ١٩٣_ ٢٠٧ ) .

لێکۆڵینەوەیەکی مێژویی لەبارەی ئیمامەتەوە. جاحظ لە هەر سێ کتێبی ئیمامەتی ( عثمان ، معاویە ، بنی عباس )دا توانیویەتی بەپشت بەستن بە سەردەمە جیاوازەکان و ئەو ڕوداوانەی وا هاتونەتە گۆڕێ، بە شێوازێکی زانستیانە گوزارشتی لێوە بکات .

لە کتێبی ( عثمان )دا باس لەو فەترە مێژوییە دەکات کەوا لە مێژوی ئیسلامیدا بە سەردەمی فیتنە دادەنرێت و کۆتاییەکەشی بە شەهیدکردنی عثمان کۆتایی دێت، لەم کتێبەیدا بە توێژینەوەیەکی زانستیانە هۆکاری دەورەی عوسمان و شەهیدکردنی دەگەڕێنێتەوە بۆ دەورەی پێغەمبەر و هاوەڵانی تیایدا باس لە هەردوو کەسایەتی عوشمان و عەلی دەکات و نزیکیان لە پێغەمبەرەوە .

لە کتێبی ئیمامەتی ( معاویە )دا باس لەو شێوازە نوێ و نامۆیە دەکات کە لە خیلافەتی ئیسلامیدا لە سەر دەستی معاویەدا دێتە گۆڕێ، ئەویش بریتیە لە مەسەلەی پاشایەتی، کە پێی وایە ئەمە ڕەددێکی تەواوەتی ئەوەیە کە پێغەمبەر باسی لێوە دەکات، هەربۆیە معاویە نەك بە کەسێکی فێڵباز و خراپکار دائەنێت، بەڵکو بە کەسێکی لە دین دەرچوو حسابی بۆ دەکات و کارەکەشی بەیەکەم کوفر دائەنێت لە ئوممەتی ئیسلامیدا .

هەروەها لە کتێبی ئیمامەتی ( بنی العباس )دا ، لەنێوان ( الطالبین ) و ( العباسین )دا شەرعیەت بە دەسەڵاتی عەباسیەکان ئەدات ، بە حوکمی ئەوەی ئەوان نزیکترن بە پێغەمبەر ، چونکە عەباس وەك مامێکی موسڵمانی نزیکترە بە پێغەمبەر تاوەکو ئیمام عەلی کوڕی ئەبی طالب .

له کتێبی ئیمامەتی ( شیعه)شدا، نوسەر هاتووه دوو بەراورد دەکات، ئەویش ئەوەیە: ئیسلام له دوو چینی سەرەکی پێك هاتووه ، ئەوانیش :
هاوەڵانی زوهد ( عەلی ، معاذ کوڕی جەبەل ، ابي الدرداء ، ابي ذر ، عەمار ) .
هاوەڵانی فیقهیش ( ابا بكر ، زيد ، خباب ، ابن مسعود ، ، ...)ن، لەمەوە ئەوە دەردەخات کە هاوەڵانی زوهد زیاتر کەسانێکن ناتوانن کاری دەسەلات بەرێوە بەرن ، بەڵکو هاوەڵانی فیقه شیاوترن بەو کارە.
له کتێبی ( وجوب الامامه )شدا ، باس له واقیعیەتی ئیمامەت و بەراوردی لەگەڵ عەقڵدا دەکات و پێی وایه واجب بونی ئیمام، بونێکی عەقڵیه بەبەڵگەی ئەوەی که ئیمام ڕێنیشاندەری خەڵکیە، هەروەك چۆن پێغەمبەران بۆ خۆیشیان ڕێنیشاندەر بون، لەبەر ئەوە بۆ ڕێکخستنەوەی کۆمەڵگا ئیمام واجبه و پێشی وایه ئیمام سێ جۆره :
– رەسول: ئیمام و نەبیه .
– نەبی : ئیمامه بەڵام رەسول نیه .
– ئیمام: نه رەسوله نه نەبیه .
هەروەها یەکێکی دی لەسەرچاوه گرنگەکانی ئەم بواره، بریتیه له (صحيح البخاري )ی ئیمامی بوخاری ، که بەشێکی بەناوی ( غەزاکانەوه ) ناسراوه ، کەلەلایەن مێژونوسانەوه وەك بەڵگەیەك پشتی پێدەبەسترێت، یاخود مەسنەدەکەی ئیمام ئەحمەد که بەشێکی ناوناوه ( غەزوەکان )[1].

[1] د. شوقي ابو خليل : اطلس السيرة النبوية ، ص ٢٣٩ .

# باسی دووەم

# وەرگێڕان لە دەورەی مەئموندا

## أ. بزوتنەوەی وەرگێڕان:

گرنگیدانـــەکان بـــە بـــواری وەرگێـــڕان لـــە دەورەی مەئمونـــدا پێشکەوتنێکی گەورەی بەخۆیەوە بینی ، کەهەستان بە وەرگێڕانی کتێبـە بیانیەکان لـە زمـانی جیـا جیـاوە لـە بوارەکـانی ( فەلـسەفە ، پزیـشکی ، سروشت ، فەلەك ، بیرکـاری ، ٠٠٠٠٠) مـەئمون بـۆ خۆشـی کەسـێکی لاواز نەبوو، بەڵکو گەلێ هەوڵیدا بۆ بەدەسـتهێنانی کتێبـی زیـاتر لـەم بـوارەدا، بەهۆی ئەو پەیوەندیەی لەگـەڵ پاشـای ڕۆمـدا هـەیبوو، هەسـتا بەپێـدانی دیاری پڕ بایەخ و لەبەرامبەردا داواکردنی کتێبەکانی (ئەفلاتون و ئەرستۆ) لـە گـرنگترین ئـەو پەیمانانـەی نێوانیـان بریتـی بوولـە پـەیمانێ لەگـەڵ ئیمپراتۆری بیزەنطینی ( میخائیلی سێیەم ) کـە داوای کـرد کتێبخانەیـەك لە کتێبخانەکانی ( ئاستانەی ) پێ ببەخشێت [1]٠ ئیبن نەدیم لەم بارەیـەوە دەڵێ : ( مەئمون نامە گۆرینەوەی هەبووە لەگەڵ پاشای ڕۆمدا، کە داوای کتێبە کۆنەکانی دەکـرد لـە ولآتـی ڕۆم ، لـە پـاش رازیکردنـی، کۆمـەڵێکی نارد بۆ ئەو مەبەستە ، وەك حەجاج کـوڕی مطـر ، ابـن بطریـق و سـلیم

---

[1] محمد عبدالرحمن مرحبا : الفلسفه اليونانيه الى فلسفه الاسلاميه ، ج١ / ص٣٠٣-٣٠٤ ٠

خاوەنی خانەی حیکمەت، لەپاش ئەوەی بەدەستیان هێنا، گەڕانەوە و هەستان بە وەرگێڕانی وەك خۆی)[1] ٠

خانەی حیکمەت، کە دروستکرا لەدەورەی ڕەشیددا و گەشەی سەند لەسەردەمی مەئموندا، ئەویش بەکارکردنێکی زۆر لەوەرگێڕانی کتێبەکان لە زمانەکانی ( یۆنانی ، سریانی ، فارسی ، قیبطی ، ٠٠٠) ئەمەش مانای ئەوە نیە کە بە هاوکاری تەنها دەوڵەت کرابێت و خەڵکی خۆی ئەم کارەی نەکردبێت، نەخێر ، بەڵکو هەبوون بە جیا ئەم کارەیان دەکرد وەك کوڕانی ( موسی منجم )[2] ٠بە گشتی ئەتوانین بڵێین کە سیفەتەکانی ئەم سەردەمەی عەباسی یەکەم ، خەریکبونی خەلیفە و ئەمیرەکانە بە زانست و ئەدەبەوە ، بە تایبەتی لە سەردەمی ( منصور ، ڕەشید ، مەئمون) دا، وە خەلیفەکان بە درێژایی تەمەنیان گەورەترین هاندەربوون بۆ خەڵکی کە خەریك بن بە زانست و زانیارییەوە[3] ٠

ئیبن قەیمی جەوزی دەڵێ : ( خەڵکی عەبدوڵلا مەئمونیان خۆشدەویست، ئەویش هەموو جۆرەکانی زانستی دەویست ٠٠٠٠٠، بۆیە فەرمانی بە عەرەبی کردنی کتێبە یۆنانیەکانیدا بە پێشکەوتوترین کەسانی ولآت لە وەرگێڕاندا، ئەوانیش وەریان گێڕا، بەمەش خەڵکی سەرگەرم بوون بەو کارەوە ) ٠

## ب. هۆکارەکانی وەرگێڕانی فەلسەفەی ئیلاهی:

---

[1] ابن الندیم : فهرست ، ص٣٤٠ ٠

[2] محمد عبدالرحمن مرحبا : الفلسفه الیونانیه ، ص٣٠٥ ٠

[3] محمد لطفي جمعه : تاریخ فلاسفه الاسلام فی المشرق والمغرب ، ص (و)

بزوتنــەوەی وەرگێــڕان لــە ســەرەتایدا وەرگرتنــی کورتەیــەك بــوو لــە پاشماوەی میللەتــە کۆنــەکان، بــەڵام پاشــتر بــەرەو پێــشتر ڕۆیــشت، وەك دەڵێن: (مەنصور گرنگی دەدا بە فەلەك ، ڕەشـید بـە پزیـشکی ، مـەئمون بـە فەلـسەفەو مـەنتیق)[1]. پەیوەسـت بـوونی مـەئمون بـە وەرگێرانـەکانی فەلسەفەی سروشی و بیرکاری پــەرەی ســەند و بــووە هــۆی دروســتبوونی دژیەکییەك لە نێوان ئەم دوو ئاینەدا لەسەر مەسەلەی (تەوحیـدی خـودا ) ئبن تیمیە دەڵێ : ( یۆنانیە کۆنەکان لە گەورە موشرکین بوون، ئەستێرەو بتــەکانیان دەپەرســت، ئەمــەش بــە گــەورە ســەیرکردنی زانــستی فیزیـا بوو.....)[2] .

لەکۆتاییەکانی فەرمانڕەوایی مەئموندا، مەسەلەی وەرگێـڕان دەورێکـی دی وەرگرت ئەویش بریتی بوو لە وەرگێرانی بیروباوەڕ و ئاداب و هونەر لە فەلـسەفەی یۆنانیـدا و وەرگێڕانــی بــیرو بــاوەڕی فارســەکان و مەســەلەی صۆفیگەری هیندی[3]. بەڵام هۆکاری هەستانی مەئمون بەم کارە چی بوو؟ چەند هۆکارێك بوون، ئەوانیش :

١- ئـیبن نـدیم دەڵـێ مـەئمون لەخەویـدا ئەرسـتۆی بینیـوە لـە شـێوەی پیاوێکی سپیدا.

- مەئمون: تۆ کێیت ؟
- ئەرستۆ.
- مەئمون: چاکترین شت چییە ؟
- ئەرستۆ: چاکترین لە عەقڵدایە.

---

[1] محمد لطفی جمعة : تأریخ فلاسفة الاسلام ، ص (و-ن ) .

[2] ابن التیمیه ، مجموع الفتاوی ، ١٧٥/٣٣١،٩/١٧ .

[3] ت.ج.دی بور : تأریخ الفلسفة في الاسلام ، ص١٢-١٣ .

– مەئمون: پێم ببەخشە.

– ئەرستۆ: بریتیە لە یەکتا پەرستی[1] .

٢– گەشەکردنی ئیعتیزال و کاریگەری مەزهەبی موعتەزیلی ، ئەمە جگە لەوەی بۆ خۆشیی قوتابی یەحیای کوڕی موبارەك بووە و هاوڕێی ثمامەی کوڕی ئەشرەس بووە کە لە گەورەیانی موعتەزیلی بوو، هەروەها بە نزیکی شێخە ئیعتزالیەکان خۆشحاڵ بوو، بەڵام ئەهلی سوننەت لەم سەردەمەدا وەك باسمان کرد سزایەکی زۆری چەشتووە بە دەستیانەوە[2]

٣– کەسایەتی خۆی ، کە حەزی بە ئازایەتی فیکر کردووە و بەپێویستی زانیوە کە لەو ڕێگایەوە سود بە خەڵك بگەیەنێت و ڕۆشنبیریان بکات ، وە زیاتر دەوتریت مەئمون بە هەموو شتێکی غەیرە ئیسلامی سەرسام بووە [3]. کە بە بۆچوونی من ئەم قسەیە هەڵەیە، چونکە بەیەکێ لەخەلیفە زۆر دیندارەکان ناوی دەبرێ و یەکەم خەلیفەیە لەبەنی عەباسدا هەموو قورئانی لەبەر بوبێت، ئەگەر بەشتی غەیرە ئیسلامی سەرسام بووە؟ لەبەر چی هەموو قورئانی لەبەر بوو. بەڵکو مەبەست لەگرنگیدانی بەزانست بۆ شارەزابون بووە لە دین و بیروباوەڕی کۆمەڵگاکانی دی و بەراوردکردنی لەگەڵ ئیسلامدا و سودلێوەرگرتنی ئەوەی لەگەڵ دینەکەدا دەگونجێ.

لێرەدا بە پێویستی ئەزانم هەندێ خاڵ بخەمە ڕوو لەسەر مەسەلەی وەرگێڕان لەم دەورەیەدا، ئەوانیش :

---

[1] ابن نديم : الفهرست ، ص٣٣٩

[2] عبدالحليم محمود : التفكير الفلسفى فى الاسلام ، ص٢٨١ ٠

[3] هـ . س ، ص٢٨٣ ٠

١– دژایەتی دروست بوون لە نێوان عەقیدەی ئیسلامی و ئاینەکانی دی بەتایبەتی بەهۆی وەرگێڕانی کتێبە یۆنانیەکانەوە ٠

٢– هەڵە یان بەدەستەوە نەدانی مانای ڕوونی وشەکان، ئەمەش لە ئەنجامی شارەزانەبونی هەندێ لەو کەسانە لە زانستەکە خۆی لە لایەك و زمانەکە لە لایەکی دیکەوە ، بۆیە هەرکاتێ مانای هەندێ وشەیان نەزانیایە ئەوا وشەکەیان بە عەرەبی و وەك خۆی دەنوسییەوە وەك وشەی (synokos) کە لە وەرگێڕانە عەرەبییەکەدا دەبووە (سنوخس) یان (lethorgua) دەگۆڕا بە (لثیاخورس) ٠٠٠٠٠، [1] کە ئەمە لە لای هەندێ کەس بە هەڵە وەردەگێررا و دەبووە هۆی ونکردنی زانیارییە راستەقینەکەی [2].

٣– گەورەیانی وەرگێڕان کەسانی مەسیحی بوون و زۆر کەم بوون ئەوانەی کە موسڵمان بوون، ئەتوانم بڵێم نمونەیان لەم سەردەمەدا تەنها (کندی ) بێت، ئەویش دەڵێن پاشتر بووەتە موسڵمان، هەریەك لە (یوحنا کوڕی ماسویە –حنین کوڕی ئیسحاق کوڕەکەشی پاشتر – جبرائیل کوڕی بختیشوع و کوڕەکەی ) کەسانی پەیوەست بە دینی مەسیحی بوون ، بەلاَم لەگەڵ ئەوەشدا خزمەتێکی گەورەیان بە شارستانێتی ئیسلامی گەیاند ، سلمان خلصن دەڵێ : (هۆشیاربوون پێویستە لە کۆمەلاَنی وەرگێڕان کە رێژەیەکی بەرچاویان بەدەرن لە بیروباوەڕی ئیسلامیانە ٠٠٠٠٠٠٠٠)[3] محمد عبدالرحمن مرحباش دەڵێ: (بەشی گەورە لەوانەی کە هاوکاری وەرگێڕانیان کردووە سریانن و لە گەورەیانی مەسیحی

---

[1] د٠ کمال سامرائي : مختصر الطب العربی ، ٣٤٢ ٠

[2] عبدالحلیم محمود :التفکیر ، ٢٨٣ ٠

[3] سلمان الخلصن :موقف المتکلمین ، ج٧/ص٥٠

نەســــتورین، بەشــێکی کــەم لــەو شــوێنکەوتووانە لەســـەر مەزهـــەبی ئەرثەدۆکسی بوون و کەمتریش لەوان یەهودی بون )[١] .

## ج. وەرگێڕە بەناوبانگەکان:

### ١. کوڕانی موسا کوڕی شاکر:

ناوداری و دەنگدانەوەیان لـە جیهـانی ئیسلامیدا لـە دوای دانـانی کتێبە بەناوبانگەکەیانەوە بوو بە بەناوی (الحیل)، ئیبن خلکان لەبارەیەوە دەڵێ: (کتێبی حیل ، کتێبێکی سەرسورهێنەری نادرە، ڕونکردنەوەی ئـەو شتانەیە کەنادیارن و لەو کتێبە باشانەیە کە سودی زۆری هەیە [٢]) .

ئـیبن نـەدیمیش دەڵـێ : ( کـوڕانی موسـا کـوڕی شـاکر ، بـەدوای زانــستە کۆنەکانــەوە بــون و ژمارەیــەکی زۆریــان وەرگێــڕا لــە بــوارە جیاجیاکاندا [٣].... ) .

هەروەها لەبارەی پەیوەندی نێوان کوڕانی موسا کوڕی شاکر (محمد ، ئەحمەد، حەسەن) لەگەڵ حنین کـوڕی ئیـسحاق، ئـیبن ئـەبی ئەصـیبعە دەڵێ : ( محمدی کوڕی موسا کوڕی شاکر، باشترین کەسێك بـوو بـۆحنین کوڕی ئیسحاق چونکە زۆرێك لە کتێبە پزیشکی و فەلـسەفیەکانی لـەوەوە وەردەگرت[٤] ).

بــەهۆی گرنگــی پێدانــەکانی خەلیفــە لــەم ســەردەمەدا بــە بــواری وەرگێــڕان ، مــاکس مــایرهوف دەڵــێ: (هەنـدێ پزیـشك و پیـاوی دینــی مەسیحی لەگەڵ هەنـدێ لـە موسـڵمانە ناودارەکـان لـە کۆشـکی خەلیفـەدا

---

[1] محمد عبدالرحمن مرحبا : من الفلسفه الیونانیه الی فلسفه الاسلامیه ، ٣٠٥ .

[2] ابن خلکان : وفیات الاعیان ، ج٥ / ص ١٦١ .

[3] ابن الندیم : فهرست ، ص ٢٧٩ . لة وفیاتدا ، ص ١٦١ _ ١٦٢ .

[4] ابن ابي اصیبعة : عیون الانباء ، ج٢ / ص ١٧٥ .

کۆدەبونەوە، خەلیفەش بە یارمەتی دان و بڕینەوەی بڕێك لە پارە بۆیان ، هاوکاری دەکردن بۆ بەردەوام بون لەسەر کارەکەیان، لە گرنگترینی ئەوانەش کوڕانی موسا کوری شاکر بون[1] ) .

کوڕانی موسا لەگەڵ حنین کوڕی ئیسحاق دەورێکی باشیان بینی لە وەرگێڕانی کتێبە یۆنانیەکان بۆ سەر زمانی عەرەبی ، ئیبن نەدیم دەڵێ : ( کوڕانی شاکر منجم دەورێکی گەورەیان گێرا لەهێنانی کتێبەکان لە وڵاتی ڕۆم[2] )، ئیبن خەلەکانیش دەڵێ: ( هەریەك لە کوڕانی موسا و حنین و حبیش کوڕی حەسەن ، مانگانە پێنجسەد دیناریان پێدەدرا لەبەرامبەر کاری وەرگێڕانیاندا [3] ) .

۲. یوحنا کوڕی ماسویە:

ئیبن ماسویە بەناوبانگ بو بە کاری پزیشکی ، هۆکاری دەنگدانەوەکەشی بریتی بوو لەوەی کە پزیشکی تایبەتی (مەئمون و موعتەسم ، ...[4] ) بوو. لەبواری وەرگێڕاندا گەلێك کتێبی پزیشکی وەرگێررا، ئیبن ئەبی ئەصیبعە دەڵێ : ( یوحنا کوڕی ماسویە، پزیشکێکی زیرەك و بەتوانا و لێهاتوو بوو لە دروستکردنی دەرمان و کاری پزیشکیدا ) هەروەها دەڵێت : ( حنین کوڕی ئیسحاق قوتابی یوحنا کوڕی ماسویە بوو ، لەوەوە فێری زانستی پزیشکی بوو، وەچەندین کتێبی

---

[1] د . رشيد الجميلي : الترجمة في المشرق الاسلامي ، ص ١٧٠ .

[2] ابن النديم : الفهرست ، ص ٢٤٣ .

[3] ابن خلكان : وفيات الاعيان ، ج٥ / ص١٦١ .

[4] د . رشيد الجميلي : الترجمة في المشرق الاسلامي ، ص ١٧٣ .

لێیەوە وەرگرت، بەتایبەتی کتێبەکەی جالینۆس، کە هەندێکی لە زمانی سریانیەوە و ئەوی دیکەشی لە زمانی عەرەبیەوە بوو[1] ) .

یوحنا یەکێك بوو لەوانەی نێردرا بۆ وەرگرتنی دەستنوسە یۆنانیەکان لە قوستنتنیە لە ڕێگای خەلیفە مەئمونەوە، لەپاش بەدەستهێنانی پاشماوە و دەستنوسە کۆنەکانی یۆنان، گەڕاوە بۆ بەغداد و پاشان لەسەر دەستی خۆی یان هەندێ لە قوتابیانی وەك حنین کوڕی ئیسحاق و ، حەبیش کوڕی حەسەن[2]، .... کاری وەرگێڕانیان کرد بۆ عەرەبی.

**٣. حنین کوڕی ئیسحاق:**

حنین عبادی چوار زمانی دەزانی ( سریانی ، عەرەبی ، یۆنانی ، فارسی ) لە کاری وەرگێڕانیشدا بەرزترین پلەی هەبوو، ئیبن نەدیم دەڵێ: (حنین لەکاری پزیشکیدا بەهێز و زمان پاراو لە زمانەکانی یۆنانی و سریانی و عەرەبیدا بوو[3] ). شەهرستانی دەڵێ : ( وەرگێڕە لێزانەکان لە مێژوی ئیسلامیدا سیانن : حنین کوڕی ئیسحاق ، یەعقوب کوڕی ئیسحاق کندی ، ثابت کورِی قرة [4]). ئیبن ئەبی ئەصیبعەش دەڵێ : ( حنین زانا بوو بە زمانەکانی: عەرەبی ، سریانی ، یۆنانی ، فارسی ، لەڕوی بەکارهێنان و وەرگێڕانیشەوە لە ئەوپەڕی باشیدا بوو)[5] .

کارکردنی حنین لە وەرگێڕاندا لەسەر ئەساسی بە دەستهێنانی نوسخە ئەسڵیەکە بوو، وە تەنها لەسەر یەك نوسخە کاری نەدەکرد، بەڵکو

---

[1] ابن ابي اصيبعة : عيون الانباء ، ج٢ / ص ١٤٢ .

[2] د . رشيد الجميلي : ه . س ، ص ١٧٨ .

[3] ابن النديم : الفهرست ، ص ٢٩٤ .

[4] شهرستاني : الملل والنحل ، ج٣ / ص ٦ .

[5] ابن ابي اصيبعة : عيون الانباء ، ج٢ / ص ١٧١ .

بەراوردی دەکرد لەگەڵ چەند نوسخەی تر تاوەکو بەرهەمەکەی گەورەیی خۆی لە دەست نەدات، شێوازیشی لە وەرگێڕاندا لەسەر بنچینەیەکی زانستیانە بوو، بۆ نمونە کتێبی ( في البرهان )ی جالینۆس نادر بوو ، کوڕەکەی لە حنینەوە دەیگێڕێتەوە کەچەند گەڕاوە و پرس و جۆی کردووە لە وڵاتەکانی: (عێراق ، سوریا ، فلستین ، میصر) تاوەکولە دیمەشق نیوەی بە دەستهێنا[١] .

ئیبن خلکان دەڵێ : ( وەرگێڕان لە زمانی یۆنانیەوە بۆ زمانی عەرەبی بەتایبەتی لە کتێبە پزیشکی و یاساییەکاندا بەرهەمی حنین کوڕی ئیسحاق بون[٢] ) بەلاّم لەگەڵ ئەو دەنگدانەوە گەورەیەیی کە هەیبو لە بواری وەرگێڕاندا، زۆرێك لە وەرگێڕان هەبون بە بەرهەمی ئەو دەناسران و لە ڕاستیدا بەرهەمی ئەو نەبون، بەڵکو لەلایەن قوتابیەکانیەوە هاوکاری کرابوو، چونکە کاتێ کتێبەکان وەردەگێڕدران پێش ئەوەی بچنە خانەی حیکمەتەوە ناوی خۆی لە لاپەڕەی یەکەم دەدا کەئەمەش بە هۆیەك دادەنرێ بۆ ئەوەی ناوی هەندێ لەو وەرگێڕانە نەزانرێ کە لە خانەی حیکمەتدا کاریان کردووە [٣] .

٤. کـــــــندی:

شارەزاییەکی تەواوی هەبوە لە زمانی یۆنانیدا و کاری وەرگێڕانی کردووە لەیۆنانیەوە بۆ عەرەبی و زیاتر گرنگی داوە بە زانستی یۆنانی لە بوارە جیاوازەکانی وەك ( پزیشکی ، بیرکاری ، فەلسەفە[٤] ). ئیبن جلجل

---

1 د . رشيد الجميلي : ه . س ، ص ٢٤٩ .

2 ابن خلكان : وفيات الاعيان ،ج٢ / ص٢١٧ _ ٢١٨ .

3 د. كمال السامرائي : مختصر تأريخ الطب العربي ج١ / ص ٣٥٦ .

4 د. أحمد محمد عوف : صناع الحضارة العلمية ، ص ١٢٩ .

لەبارەی تایبەتمەندیەکانی وەرگێڕانیەوە دەڵێ : ( وەرگێڕانەکانی کندی زیاتر کتێبە فەلسەفیەکانن و لەو ڕێگایەوە هەوڵێکی زۆری داوە تاوەکو وشە قورس و نامۆ و لێڵ و ناڕونەکان ڕونبکاتەوە و پەیبەرێت بەلایەنە شاراوەکانی)، ئولیریش دەڵێ : ( کاری کندی بریتی بوو لە وەرگێڕان لە یۆنانیەوە بۆ عەرەبی بەتایبەتی کتێبە زانستی و فەلسەفیەکان و لەو ڕێگایەوە دەورێکی باشی هەبوو لە وەرگێڕانی کتێبەکانی فەیلەسوفی یۆنانی ئەرستۆ و هەوڵی ئەدا لایەنە قورسەکانی شیبکاتەوە)[1] .

## د. گرنگترین بەرهەمە وەرگێڕاوەکان:

### ١. وەرگێڕانەکانی حنین کوڕی ئیسحاق [2] :

بەرهەمەکانی ئەرستۆطالیس ، لە بواری ( فەلسەفە و ئەدەب )

١. کتێبی انالوطیقا الاول ، ( باس لە شیکردنەوەی پێوانەکردن دەکات ) ، وەرگێڕاوە لە سریانیەوە .

٢. کتێبی انالوطیقا الثاني ، ( باس لە بورهان ) دەکات . بۆ سریانی

٣. النفس ( سێ مەقالە ) . سریانی

٤. الحروف ( ١١ مەقالە ) . سریانی ، ئیسحاق و دیمەشقیش بۆ عەرەبی .

٥. الکون والفساد . سریانی

بەرهەمەکانی ئەفلاتون ، لە بواری ( فەلسەفە و ئەدەب )

١. کتێبی السیاسە .

٢. النوامیس ، لە لایەن حنین و یەحیاوە .

---

[1] د . رشيد الجميلي : ه . س ، ص ٢٧٤ .

[2] د. رشيد الجميلي : الترجمة في المشرق الاسلامي ، ص ٢٥٣ . ابن ابي اصيبعة : عيون الانباء ، ج٢ / ص ٢٥٧ _ ٢٧٤ . ابن خلكان : وفيات الاعيان ،ج ١ / ص ٢٠٩ _ ٢١٠ . حاج الخليفة : كشف الظنون ، ج١ / ص ٢٧٨ . د. أحمد فريد : عصر المأمون ، ج١ / ص ٣٨١ .

٣. طيماوس، وەرگێڕاوە لەلايەن ئيبن بەطريق و پێداچونەوەی بۆ كراوە لە لايەن حنينەوە .

بەرهەمەكانى ئبقراط ، لە بوارى ( پزيشكى و بەشەكانى )

وەرگێرانەكانى حنين بۆ زمانى عەرەبى بە تەفسيرەكانى جالينۆس

١. الفصول .

٢. الكسر .

٣. الماء والهواء ( سىٚ مەقالە ) .

٤. طبيعة الإنسان ( سىٚ مەقالە ) .

بەلاٚم لە بەرهەمى ئبقراط وەرگێڕانى بۆ زمانى سريانى نيە .

بەرهەمەكانى جالينۆس ( پزيشكى و بەشەكانى )

١. صناعة المقالة

٢. مەقالەيەك لە كتێبى ( المقالات الخمس في التشريح ).

٣. المزاج ( سىٚ مەقالە ) .

٤. القوي الطبيعة ( سىٚ مەقالە ) .

٥. العلل والأعراض ( شەش مەقالە ).

٦. البحران ( سىٚ مەقالە ) .

٧. أيام البحران ( سىٚ مەقالە ) .

٨. الحميات ( دوو مەقالە ).

٩. الطبيب والفيلسوف .

١٠. أفضل الهيئات .

١١. مداواة الامراض .

١٢. كتب ابقراط الصحية .

١٣. محنة الطبيب .

١٤. الأدوية المفردة .

١٥. الحركات المجهوله .

١٦. الذبول .

١٧. قوية الاغذية .

١٨. رداءاة التنفس .

**٢. وەرگێڕانەکانی یوحنا کوڕی بەتریق[١]:**

**کونیەی ئەبو زەکریایە ، یەکێك بو لە دەربارانی مەئمون ، پزیشك نەبو بەڵکو مەیلی بە لای فەلسەفەدا بوو . لاتینی دەزانی لەگەڵ یۆنانی و سریانیدا . لە وەرگێڕانەکانی :**

**١. سر الاسراری ی ئەرستۆ( کەباسی تەندروستی و پیشەی ئەندامەکانی لاشەی دەکرد . ) .**

**٢. طباع الحیوان ی ئەرستۆ .**

**٣. أجزاء الحیوان .**

**٤. السموم . دەستنوسە لە ایاصوفیا .**

**٥. کتێبی ابقراط عن الموت . دەستنوسە لە مەکتەبی پارسی ئەهلی .**

**بەرهەمەکانی ئەفلاتون ، لەبواری ( فەلسەفە و ئەدەب )**

**١. طیماوس . ٢. أرستوطالیس .**

**٣. الحیوان . ٤. السماء والعالم .**

---

[1]. ابن ابي اصيبعة : عيون الانباء ، ج٢ / ص ٢٨٢. ابن النديم : الفهرست ، ص٢٤٤. د. أحمد فريد : عصر المأمون ، ج١ / ص٣٨٠

**٣. وەرگێڕانــەکانی حجـاج کــوڕی یوســف کــوڕی مگــر [١] ( ژمێریــار و دەفتەرداری کوفە) :**

١. کتێبی المجسطي ی بطلیموسی وەرگێڕاوە .

٢. الأصول ی ئیقلیدس .

**٤. وەرگێڕانەکانی ئیبراهیم کوڕی صەڵت[٢] :**

زمانی یۆنانی و سریانی و عەرەبیشی زانیوە ، لە وەرگێڕانەکانی :

١. کتێبی الأورام ی جالینۆس ، کـە پاشـتر وەرگێـڕا بـۆ عـەرەبی لەلایـەن ئەحمەد کوڕی موساوە .

٢. کتێبی حیلة البرء ی جالینۆس، وەرگێڕاوە بۆ زمانی سریانی .

٣. تێزێکی جالینۆسە بـەناوی (في صـبي یـصرع)، وەرگێـڕا بـۆ عـەرەبی و سریانی .

**٥. وەرگێڕانەکانی عیسا کوڕی ئیبراهیم [٣]:**

قوتابی حنین کوڕی ئیسحاق ، کتێبی زۆری وەرگێڕاوە ڕاسـتەوخۆ بـۆ زمانی عەرەبی ، هەندێ لەو کتێبانەش، کتێبی جالینۆس بون:

١. تەفسیری عهد ی ئبقراط .
٢. تەفسیری تقدمه المعرفه .
٣. تەفسیری کتێبی القروح .
٤. تەفسیری کتێبی الأخلاط .
٥. کتێبی في العروق الضوارب .
٦. کتێبی في الأدویة المسهله .
٧. کتێبی اختلاف الاعضاء المتشابهة الأجزاء .
٨. تەفسیری جالینۆس بۆ کتێبی طبیعة الانسان ی ئیبقراط .

---

[1] د. کمال السامرائي : مختصر تأریخ الطب العربي ج١ / ص ٣٦١ ـــ ٣٦٢.
[2] Http : //www> ziedan.com/research /targem. Asp//.
[3] هـ . س . د. کمال السامرائی : مختصر تأریخ الطب العربي ، ج١ / ص ٣٦٢ .

**٦. وەرگێڕانەکانی ئەیوب رهاوی [١] :**

زانای زمانی یۆنانی و وەرگێڕ پێش حنین کوڕی ئیسحاق لە وەرگێڕانی کتێبە یۆنانیەکان بۆ سریانی. زۆربەی وەرگێڕانەکانی بەرهەمی جالینۆسە:

١. تەفسیری کتێبی الفصول ی ئیبقراط .

٢. تەفسیری کتێبی جراحات الرأس ی ئیبقراط .

٣. کتێبی الاورام .

٤. رداءاة التنفس .

٥. کتێبی في اراء ابقراط وأفلاطون .

٦. کتێبی في تشريح الرحم .

٧. کتێبی صناعة الطبية .

٨. کتێبی فی علاج التشريح .

٩. کتێبی تشريح الحيوان الميت .

**٧، وەرگێڕانەکانی سەعید جەوهەری [٢] :**

کتێبی السموم ی هیندی لە فارسیەوە بۆ عەرەبی وەرگێرا بە فەرمانی خەلیفە مەئمون .

**٨. وەرگێڕانەکانی عیسا کوڕی یەحیا [٣]:**

بەرهەمەکانی ئیبقراط لە بواری ( پزیشکی و بەشەکانی )

١. تقدمة المعرفة .

٢. الأمراض الحادة .

٣. أبيذيميا .

---

[1] . د. أحمد فريد : عصر المأمون ، ج١ / ص ٣٨٥ . .

[2] د. كمال السامرائي : مختصر تأريخ الطب العربي ، ج١ / ص٣٦١ .

[3] د. أحمد فريد : ص ٣٨٣ .

**٩. وەرگێڕانەکانی حبیش کوڕی ئەعصم [1] :**

**بەرهەمەکانی جالینۆس ، لەبواری ( پزیشکی و بەشەکانی )**

١. التشريح الكبير .
٢. اختلاف التشريح .
٣. التشريح الحيوان الحی .
٤. التشريح الحيوان الميت .
٥. تشريح الرحم .
٦. المني .
٧. علم أبقراط بالتشريح .
٨. الرياضة بالكرة الصغيرة .
٩. الرياضة بالكرة الكبيرة .
١٠. العادات .
١١. منافع الأعضاء .
١٢. تركيب الأدوية .
١٣. خصب البدن .

[1] أحمد فريد: نفس المصدر ، ص ٣٨٣ .

# ئەنجام

دەگەینە چەند خاڵێك :

- زانست وەرگێڕان لە دەورانی مەنصور و ڕەشید و مەئموند، گەشەسەندنێکی گەورە بوو لەشارستانیەتی ئیسلامیداکە بناغەی دارشت بۆ نەوەکانی دواتر تاوەکو زیاتر بەرەو پێشی بەرن.
- شارستانیەتەکە پڕە لە کەسانی ئامۆژگاریکەر ، گەڕیدە ، زانا ، دانا لە تەواوی چینە جیاوازەکانی نێو کۆمەڵگا .
- ئاشنابوین بە زۆرێك لە کەسایەتیە ناودارەکانی ئەو سەردەمە ، بە پزیشکانی بە ئەستێرەناسانی ، بە مامۆستایانی ، وە توانیمان تاڕادەیەك ئاشنابین بە هەندێك لە زانستەکەیان .
- گەیشتینە ئەوەەی کە موسڵمانان چەندە پێشکەوتوبون و چەندە لێهاتوبون و هەوڵییان داوە بۆ نوسینەوەی ئەو زانستەیان بۆ نەوەی نوێ، بەڵام بەداخەوە نەوەی نوێ نەیتوانیوە پەرەی پێبدات و تەنانەت فەرامۆشیشی کردووە بۆ کەسانی تر.
- باسکردن بوو لەوەی ئەم شارستانیەتە تا چەند توانیویەتی سود بگەیەنێتە خۆرئاوا ، وە خۆرئاوا تا چەند کاریگەری هەبوە لەسەر جیهانی ئیسلامی و دەوڵەتی عەباسی بەتایبەتی لەگەڵ باسکردنی ڕای زانایانی بە ویژدان و نیشاندانی لایەنە جوانەکانی ئەم شارستانیەتە .
- باسکردنی ئەو کاریگەری و دەرئەنجامانەی لە وەرگرتنی شارستانیەتەکانی هیندی و فارسی و یۆنانیەوە هاتۆتە گۆڕێ .

- ڕون کردنــەوەی پێگــەی موعتەزیلــە لــە ســەرەتای دەوڵــەتی عەباسیەوە تاوەکو تـەواوبونی دەورەی مـەئمون و باسـکردن لـەو هەڵبەز و نشێوانەی کە ئەم فیکرەیە و کەسانی پەیڕە و کەری بـە خۆیانەوە گرتووە .
- بە دەرخستن و دەوری عەلەویەکان لە خزمەتکردنی شارستانیەتی ئیسلامی و زیادکردنی ئەو مشتە لە خەروارێك .
- خستنە ڕوی ڕۆڵی هەریـەك لـە زانـا موسـڵمانەکانی وەك جـاحظ ، کینــدی ، خــواریزمی و بــە دەرخــستنی زانینەکــەیان لــە بــوارە جیاوازەکانی زانستدا .




**ڕەچەڵەکی عەباسیەکان لەگەڵ ناو و ماوەی فەرمانڕەوایی خەلیفەکانی دەورەی یەکەمی عەباسی**


خلفاء العصر العباسي الأول: ١٣٢ - ٢٣٢ هـ
عبد المطّلب
العباس
عبدالله
علي
داود
والي الحجاز
عبدالله
والي الشام
الإمام محمد
صالح
والي مصر
سليمان
والي البصرة
إسماعيل
والي الأهواز
موسى
عيسى
الإمام إبراهيم
١ - أبو العباس عبدالله
١٣٢ - ١٣٦ هـ
٢ - أبو جعفر المنصور
١٣٦ - ١٥٨ هـ
٣ - محمد (المهدي)
١٥٨ - ١٦٩ هـ
٤ - موسى (الهادي)
١٦٩ - ١٧٠ هـ
٥ - هارون (الرشيد)
١٧٠ - ١٩٣ هـ
٦ - محمد (الأمين)
١٩٣ - ١٩٨ هـ
٧ - عبدالله (المأمون)
١٩٨ - ٢١٨ هـ
٨ - أبو اسحاق محمد (المعتصم بالله)
٢١٨ - ٢٢٧ هـ
٩ - أبو جعفر هارون (الواثق بالله)
٢٢٧ - ٢٣٢ هـ


گەشتی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل
بەدوای زانستدا
بحر الظلمات (الأطلسي)
البحر الكبير (المتوسط)
الصحراء الكبرى
مصر
السودان
شبه جزيرة العرب
بحر العرب
المحيط الهندي
گەشتی دارەمی
بەدوای زانستدا
الاصطلاحات
مكان الولادة
مكان الوفاة
خط سير الرحلة
بحر قزوين
البحر الكبير (المتوسط)
شبه جزيرة العرب
بحر العرب
المحيط الهندي
گەشتی بوخاری
بەدوای زانستدا
الاصطلاحات
مكان الولادة
مكان الوفاة
خط سير الرحلة
ثم العودة إلى بخارى
بحر قزوين
البحر الكبير (المتوسط)
شبه جزيرة العرب
بحر العرب
المحيط الهندي




ململانێیەکی دیاری نێوان ئەباکۆسی پێشینە و خوارزمیی نوێ
کە تێیدا گۆشەنیگای خوارزمیی زاڵ دەبێت بەسەر هاوکێشەکەدا



دۆزینەوەی ڕێگایەکی نوێ لە شیکاری کیمیایدا

# سەرچاوەکان

## سەرچاوە کوردیەکان

ـ طـه جابر العلوانی :

١. ئــەدەبی ئیخــتلاف لــە ئیــسلامدا ، وەرگێڕانــی : ســەلاح عــەزیز و ســەرکەوت ئیــبراهیم ،چــاپی یەکــەم ، نوســینگەی تەفــسیر / هــەولێر . ١٩٩٩م.

ـ کاوە فەرەج سەعدون :

٢. ڕۆڵـی پرشـنگداری زانـا موسـڵمانەکان لـە پێـشکەوتنە زانـستیەکاندا ، پرۆژەی تیشك ( ٢١) ، چاپی یەکەم . ٢٠٠٧ .

ـ محمدی شەڵماشی :

٣. مەجلیــسی ئــەولیا ، بــەرگی ( ١ــ٢ ) ، چــاپی دوەم ، چــاپخانەی رستمخانی ، ١٤١٢ ك / ١٩٩١م .

ـ نەبەز حەمە ڕشید :

٤. هونــەرە جوانــەکان لـە شارسـتانیەتی ئیـسلامیدا ، چـاپی یەکـەم ، لـە بلاٌوکراوەکانی کتێبخانەی ڕۆشنبیر ، ١٤٢٣ ك / ٢٠٠٢ م .

# سەرچاوە عەرەبیەکان

## کۆنەکـان

١. قورئانی پیرۆز .

ـ ابن ابي اصيبعة الخزرجي :

أبو العباس موفق الدين أحمد بن القاسم ، مرددوه له ٦٦٨ ك / ١١٦٩م .

٢. عيون الأنباء في طبقات الأطباء ، اصدار دار الفكر ، بيروت ، ١٩٥٧ .

ـ ابن الأثير :

للأمام أبي الحسن علي بن أبي الكرم محمد بن محمد بن عبد الكريم بن عبد الواحد الشيباني ، ناسراو به ابن الأثير الجزري ، نازناوی عزالـدين ، مـردوه له ٦٣٠ ك .

٣. الكامل في التـأريخ ، لێكۆڵینـەوە و تـەعليق لەسـەر دانـی : كۆمـەڵێ لـە زانایان . الطبعة الثانيـة ، دارالكتـب العربـي ، بـيروت ـ لبنـان ، ١٣٨٧ ك / ١٩٦٧م .

ـ ابن التيمية :

تقي الدين أحمد بن محمد بن خلدون ، ناسراو به شيخ الاسلام ، مردوه لـه ٧٢٨ ك .

٤. مجموعة الفتاوى ، لێكۆڵینەو ە و دەرهێنانی فەرمودەكان : عامر الجزار ، أنور الباز ، الطبعة الثانية ، دارالوفاء ، ١٤٢١ك / ٢٠٠١م .

ابن الجوزي :

للأبي الفرج عبدالرحمن بن علي بن محمد بن الجوزي ، مردوه له ٥٩٧ك .

٥. الـصواعق المرسـلة ، تحقيـق : علـي الـدخيل الله ، الطبعـة الثالثـة ، دارالعاصمة ، الرياض ، ١٤١٨ .

٦. مختصر صفة الصفوة ، تحقيق : عصام الدين الصبابطي ، الطبعة الثانية ، دارالحديث ، القاهرة ، ١٤١٨ك / ١٩٩٨م .
٧. المنتظم ، دراسة وتحقيق : محمد عبد القادر عطا ، مصطفى عبد القادر عطا . راجعة وصححة : نعيم زر زور ، دارالكتب العلمية ، بيروت ـ لبنان .
ـ ابن خلدون :
عبد الرحمن بن محمد بن خلدون ، مردوه له ٨٠٨ك / ١٣٠٦ م .
٨. مقدمة ، منشورات : محمد علي بيضون ، الطبعة الثامنة ، دارالكتب العلمية ، بيروت ـ لبنان ، ١٤٢٤ك / ٢٠٠٣م .
ـ ابن خلكان :
أبو العباس شمس الدين أحمد بن محمد بن أبي بكر الأربلي ، مردوه له ٦٨١ك / ١٢٨٢م .
٩. وفيات الأعيان و أبناء الزمان ، لێكۆڵینەوەی : د. احسان عباس ، دار الثقافة ، بيروت ، ١٩٦٨ .
ـ ابن الكثير :
للأمام الحافظ أبي الفداء اسماعيل بن كثير ، مردوه له ٧٧٤ك .
١٠. البداية والنهاية ، الطبعة الأولى ، دار المثار ـ القاهرة ، ١٤٢١ك / ٢٠٠١م.
ـ ابن النديم :
محمد بن اسحاق ، مردوه له ٣٨٣ك / ٩٩٣م .
١١. الفهرست ، تحقيق : محمد أحمد أحمد ، المكتبة التوفيقية ، بون طبع ، بدون العام .
ـ الأشعري :
الأمام أبي الحسن علي بن اسماعيل الأشعري ، مردوه له ٣٢٤ ك .

١٢. مقالات الاسلاميين ، تحقيق : محمد محي الدين عبدالحميد ، الطبعة الثانية ، ١٩٨٥م .

- البغدادي :

عبدالقاهر بن طاهر بن محمد البغدادي الأسرافيني التميمي ، مردوة لـة ٤٢٩ك / ١٠٣٧م .

١٣. الفرق بين الفرق ، تحقيق : محمد محي الدين عبدالحميد ، المكتبة الحصرية ، صيدا- بيروت ، ١٤٢٤ك / ٢٠٠٤م .

- الجاحظ :

أبي عثمان عمرو بن بحر الجاحظ ، مردوه له ٢٥٥ك .

١٤. البيان والتبين ، لێکۆڵینەوه و شیکردنەوەی : عبد السلام محمد هارون ، الطبعة الرابعة ، مكتبة الخانجي بالقاهرة ، ١٣٩٥ك / ١٩٧٥م .

- الجرجاني :

علي بن محمد السيد الشريف الجرجاني ، مردوه له ٨١٦ك .

١٥. التعريفات ، لێکۆڵینەوەی : مصطفى أبو يعقوب ، الطبعة الاولى ، مؤسسة الحسنى ، الدار البيضاء - مغرب ، ١٤٢٧ك / ٢٠٠٦م .

- حاجي خليفة :

مصطفى بن عبد الله ، نوسەری حەلەبی

١٦. كشف الظنون في أسامي و فنون ، دارالكتب العلمية ، يبروت ، ١٤١٣ك / ١٩٩٢م .

- الذهبي :

شمس الدين محمد أحمد بن عثمان الذهبي ، مردوه له ٧٤٨ك / ١٣٤٧م .

١٧. سير أعلام النبلاء ، الطبعة الأولى ، بيروت ، ١٤٠١ك / ١٩٨١م .

ـ الدارمي :

للامام الحافظ أبـي محمـد عبـدالله بـن عبـد الـرحمن ابـن الفـضل بـن بهـرام الدارمي ، مردوه له ٢٥٥ك .

١٨. سـنن الـدارمي ، لێكۆڵينـەوە و دەرهێنـانی فـەرمودەكان لـە كتێبـی سـوننه : د. الـشيخ أحمـد عبدالمحـسن ، دارالمعرفـة ، بـيروت ـ لبنـان ، الطبعة الأولى ، ١٤٢١ك / ٢٠٠٠م .

ـ الزهري :

محمد بن سعد بن منيع الزهري ، مردوه له ٢٣٠ك .

١٩. الطبقات الكبرى ، أعد فهارسها : رياض عبـدالله عبـد الهـادي ، الطبعـة الأولى ، طبعة جديدة ، دار أحياء التراث العربي ، بيروت ـ لبنان ، ١٤١٧ك / ١٩٩٦م .

ـ السيوطي :

جلال الدين بن أبي بكر السيوطي ، مردوه له ٩١١ك .

٢٠. تأريخ الخلفاء ، تحقيق : حمدي الدمرداش ، الطبعة الأولى ، مكتبة نزار مصطفى الباز ، ١٤٢٥ك / ٢٠٠٤م

ـ شهرستانی :

محمد عبدالكريم بن أبي بكر أحمد شهرستاني .

٢١. الملل والنحل ، محقق : محمد سيد كيلاني ، دارالمعرفة ،بيروت ، ١٤٠٤

ـ الطبري :

للامام أبي جعفر محمد بن جرير الطبري ، مردوة لة ٣١٠ك / ٩٩٢م .

٢٢. تـأريخ الطـبري المعـروف بتـأريخ الأمـم والملـوك ، پێداچـونەوە و ڕاستكردنەوەی : كۆمـەڵێك لـە زانایـان ، بـدون طبـع ، مؤسـسة الأعلمـي ، بيروت ـ لبنان ، بدون العام .

ـ مسعودي :

أبي الحسن علي بن الحسين بن علي المسعودي ، مردوە لە ٣٤٦ك .

٢٣. مـروج الـذهب و معـادن الجـوهر ، تحقيـق : محمـد محـي الـدين عبدالحميد ، الطبعة الرابعة ، القاهرة ، ١٣٨٥ك / ١٩٦٥م .

## سەرچاوە عەرەبیەكان

### نوێـكان

ـ ابراهيم سلمان الكروي (دكتۆر) ـ عبدالتواب شرف الدين (دكتۆر) :

١. المرجع في الحضارة العربية الاسلامية ، الطبعـة الثانيـة ، منـشورات ذات السلاسل ، الكويت ، ١٤٠٧ك / ١٩٨٧م .

ـ ابراهيم مصطفى ـ أحمد حـسن الزيـات ـ حامـد عبالقـادر ـ محمـد علـي النجار :

٢. المعجم الوسيط ، الجزء الأول والثاني ، دار الدعوة ، استانبول ـ تركية .

ـ أحمد فريد رفاعي (دكتۆر) :

٣. عصر المأمون ، المجلد الأول والثاني ، الطبعة الرابعة ، مطبعة دارالكتـب المصرية بالقاهرة ، ١٣٤٦ك / ١٩٢٨م .

ـ أحمد محمد عوف (دكتۆر) :

٤. صناع الحضارة العلمية في الاسلام ، الجزء الأول والثـاني ، سلـسلة العلـم والحياة (٨٧) ، الهيئة المصرية العامة للكتاب ، ١٩٩٧ .

ـ ادوارد جي براون (دكتۆر) :

٥. الطب العربي ، ترجمة : د. داود سلمان علي ، الطبعة الثانية ، بغداد ، ١٩٨٦م .

- بلقيس محسن هادي :

٦. تأريخ الفن العربي الاسلامي ، جامعة بغداد ، كلية الفنون الجميلة ، مطبعة دارالحكمة ، بغداد ، ١٩٩٠م .

- ت. ج . دي بور (دكتۆر) :

٧. تأريخ الفلسفة في الاسلام ، نقلة الى العربية : محمد عبدالهادي أبو ريدة ، القاهرة ، مطبعة لجنة التأليف ، ١٣٥٧ك / ١٩٣٨م .

- جابر عزيز الشكري (دكتۆر) - محمود الفياض (دكتۆر) :

٨. تأريخ العلم الكيمياء ، كلية العلوم / جامعة البغداد ، ١٩٨١م .

- جرجي زيدان :

٩. الأمين والمأمون ، روايات تأريخ الاسلام ، دارالأندلس ، بيروت ، بدون العام .

- جلال شوقي - علي الدفاع :

١٠. العلوم الرياضية في الحضارة الاسلامية ، الجزء الأول ، دار الجون وايلى وأبنائة ، نيورك / سنغافورة ، ١٩٨٥م .

- جميل ابراهيم حبيب :

١١. تأريخ متصوفة بغداد ، الطبعة الأولى ، مطبعة أسعد ، بغداد ، ١٩٨٨ .

- حسن ابراهيم حسن ( دكتۆر) :

١٢. تأريخ الأسلام ( السياسي ، الديني ، الثقافي ، الاجتماعي ) ،الطبعة الخامسة عشرة ، دار الجيل ، القاهرة ، مكتبة النهضة المصرية ، ١٤٢٢ك / ٢٠٠١م .

ـ حكمت عبد الكريم فريحات ـ ابراهيم ياسين الخطيب :

١٣. مدخل الى تأريخ الحضارة العربية الألامية ، دارالشروق ، طبعة الأولى ، عمان ـ الأردن ، ١٩٩٩.

ـ خليل ابراهيم السامرائي (دكتۆر) ـ طارق فتحي سلطان(دكتۆر) ـ جزيل عبدالجبار الجومرد (دكتۆر) : ١٤. تأريخ الدولة العربية الاسلامية في عصر العباسي ، الموصل ، ١٩٨٨ .

ـ رشيد الجميلي (دكتۆر) :

١٥. حركة الترجمة في المشرق الاسلامى في القرنين الثالث والرابع للهجرة ، دار الشؤون الثقافة العامة ، العراق ـ بغداد / أعظمية ، دارالحرية للطباعة ، ١٩٨٦م .

ـ زهدي حسن جارالله :

١٦. المعتزلة ، مطبعة المصر ، القاهرة ، ١٣٦٦ك / ١٩٤٧م .

ـ زيغريد هونكه:

١٧. شمس العرب تسطع على الغرب ، الترجمه : فاروق بيضون ، كمال دسوقي . پێداچونەوە و دانانی پەراوێز : مارون عيسى الخورى ، الطبعة العاشرة ـ بيروت ، ٢٠٠٢م .

ـ شوقي أبو خليل ( دكتۆر) :

١٨. أطلس التأريخ العربي الاسلامي ، طبعة محدثة مزيدة ، دار الفكر ، المطبعة الهاشمية ، دمشق / سورية ، ٢٠٠٦م .

ـ شوقي أبو خليل ( دكتۆر) :

١٩. أطلس السيرة النبوية ،الاعادة الخامسة ، دار الفكر ، دمشق / سورية ، ١٤٢٨ك / ٢٠٠٧م .

- شوقي الضيف ( دكتۆر ) :
٢٠. العصر العباسي الأول ، تأريخ الأدب العربي (٣) ، الطبعة الرابعة عشرة ، دارالمعارف ـ القاهرة ، بدون العام .
- صدرالدين القبانچی :
٢١. تأريخ التشريع الفكري والسياسي ، الطبعة الأولى ، قم المقدسة ، مطبعة مكتب الأعلام الاسلامي ، ١٤٢٢م
- صديق عبدالله اغجلري :
٢٢. دراسات في المذاهب والفروق الاسلامية ، الطبعة الأولى ، وزارة الثقافة ، ٢٠٠٥م .
- طه الحاجري (دكتۆر) :
٢٣. الجاحظ حياتة واثاره ، الطبعة الثالثة ، مكتبة الدراسات الأدبية (٢٨) ، دار المعارف بمصر ـ القاهرة ، ١٩٧٦ .
- عبد الجبار الجومرد (دكتۆر) :
٢٤. هارون الرشيد ، دراسة تأريخية اجتماعية سياسية ، الجزء الأول والثاني ، مطبعة دارالكتب ـ بيروت ، ١٩٥٦م .
- عبد الحليم محمود :
٢٥. التفكير الفلسفي في الاسلام ، طبعة الأولى ، دار الكتب العربي اللبناني ، ١٩٧٤م .
- عبدالله سندة :
٢٦. ال بختيشوع ( أطباء الخلفاء العباسيين ، دار الرضوان ، ٢٠٠١م .
- عبدالله سندة :
٢٧. ال شاكر ( محمد ، أحمد والحسين ) ، دار الرضوان ، ٢٠٠١م .

ـ عبدالله سندة :

٢٨. يوحنا بن ماسوية ( طبيب دار الحكمة ، و مترجم تراث اليونان ) ، دار الرضوان ، ٢٠٠١م .

ـ عرفان عبدالحميد ( دكتۆر ) :

٢٩. دراسات في الفرق والعقائد ، طبعة الأولى ، مطبعة الارشاد ، بغداد ، ١٩٦٧م .

ـ علي ابراهيم حسن ( دكتۆر ) :

٣٠. تأريخ الاسلامي العام ( الجاهلية ، الدولة العربية ، الدولة العباسية ) ، الطبعة الثالثة ، القاهرة ، ١٩٦٣م .

ـ علي الطنطاوي :

٣١. رجال من التأريخ ، طبعة الثانية ، مكتبة الأموية ، بيروت ، بدون العام .

ـ علي عبدالله الدفاع (دكتۆر) :

٣٢. أثر علماء العرب والمسلمين في تطوير علم الفلك ، الطبعة الأولى ، مؤسسة الرسالة ، بيروت ـ شارع سوريا ، ١٤٠١ك / ١٩٨١م .

ـ علي مصطفى العرابي :

٣٣. تأريخ الفرق الاسلامية و نشأة علم الكلام عند المسلمين ، مطبعة محمد علي صبيح وأولادة بالأزهر ، ١٩٥٩ م .

ـ فاروق عمر فوزي ( دكتۆر ) :

٣٤. الخلافة العباسية عصر القوة والازدهار ، الجزء الأول ، دارالشروق للنشر والتوزيع ، عمان ـ الأردن ، ٢٠٠٢ .

ـ فاضل أحمد الطائي (دكتۆر) :

٣٥. الوجيز في الصحة والكيمياء عند العرب ، الموسوعة الصغيرة ( ٤١) ، دارالحرية للطباعة ـ بغداد ، ١٤٠٧ك / ١٩٨٦م .

ـ فخري الزبيدي :

٣٦. الموجز المنتخب من حوادث وأخبار الخليفة هارون الرشيد ، الطبعة الأۆلى ، داريوسف ، بيروت ـ لبنان ، ٢٠٠٣ ـ ٢٠٠٤ .

ـ كمال السامرائي (دكتۆر) :

٣٧. مختصر تأريخ الطب العربي ، الجزء الأول ، دائرة الشؤون الثقافية والنشر ، سلسلة دراسات ٣٥٥ ، دارالحرية للطباعة ، بغداد ، ١٤٠٤ك / ١٩٨٤م .

ـ مؤسسة البلاغ ( لجنة التأليف ) :

٣٨. نفحات من السيرة ، الطبعة الأولى ، ، الجمهورية الاسلامية في ايران ، طهران ، ١٤١٨ك / ١٩٩٨م .

ـ مؤسسة المعارف الاسلامية الثقافية :

٤٠. الحياة السياسية لأئمة أهل البيت ، سلسلة العلوم والمعارف الاسلامية ( ١٤) .

ـ مؤسسة المعارف الاسلامية الثقافية :

٤١. المعارف الاسلامية ، سلسلة العلوم والمعارف الاسلامية (١١) .

ـ محمد أمين غالب الطويل :

٤٢. تأريخ العلويين ، الطبعة الثانية ، دار الأندلس ، بيروت ـ لبنان ، ١٩٦٦م .

ـ محمد خضري بك :

٤٣. الدولـة العباسـية ، تحقيـق التعليـق : ابـراهيم أمـين محمـد ، المكتبـة التوفيقية ، بدون العم ، بدون طبع .

ـ محمد خضري بك :

٤٤. تأريخ التشريع الاسلامي ، الطبعة الثالثة ، دارالمعرفة ، بيروت ـ لبنان ، ١٤٢٣ك / ٢٠٠٢م .

ـ محمد رجب البيومي (دكتۆر) :

٤٥. هارون الرشيد الخليفة العلم والفارس المجاهد ، أعـلام المـسلمين (٧٨) ، الطبعة الأولى ، دارالقلم ، دمشق ، ١٤٢١ك / ٢٠٠٠م .

ـ محمد رجب السامرائي :

٤٦. علم الفلك عند العرب ، موسوعة الصغيرة ١٣٨ ، دائرة الشؤون الثقافية والنشر ، بغداد ، ١٩٨٤ .

ـ محمد عبد الرحمن مرحبا :

٤٧. من الفلسفة اليونانية الى الفلسفة الاسلامية ، طبعة الأولى ، دار عويـدات ، بيروت ، ٢٠٠٠ك / ١٤٢٠م .

ـ محمد عمارة :

٤٨. المعتزلة ومشكلة الحرية الانسانية ، الطبعة الثانيـة ، المؤسـسة التربيـة الدراسات والنشر ، بيروت ـ لبنان ، بغداد ، ١٩٨٤م .

ـ محمد لطفي جمعة :

٤٩. تأريخ فلاسفة الاسلام في المشرق والمغرب ، مطبعة المعـارف ، ١٣٤٥ك / ١٩٢٧م .

ـ محمود اسماعيل (دكتۆر) :

٥٠. تأريخ الحضارة العربية الاسلامية ، الطبعة الثانية ، مكتبة الفلاح للنـشر والتوزيع ، الكويت ، ١٩٩٠ .

ـ ميخائيل عواد :

٥١. صور مشرقة من حضارة بغداد في العصر العباسي ، دارالرشيد للنـشر ، منشورات وزارة الثقافة والأعلام ، سلسلة دراسات (٢٧٩) ، ١٩٨١م .

ـ ول ديورانت :

٥٢. قصة الحضارة ( الجزء الثاني من مجلد الرابع ) ، عصر الايمـان (١٣) ، ترجمة : محمد بدران ، ١٩٥٧م .

**سايتەكان**

١. http \ www.islamset. com \ Arabic\ ahip \ alalom\ agel. Html

٢. http\ www.yabeyrouth.com

٣. http\ www. Alshindagah.com

٤. http \ www. ziedan com\ research\ targem.asp

٥. httpar.wikipedia.orgwiki%D8%AD

٦. http \ www.mesopotamia

٧. .http \ histoiregeographie.iquebec.comabbasia